# داستانی فیردەوسی ونبوو





جۆن میلتۆن
وەرگێڕانی: کەریم دەشتی

# داستانی
# فیردەوسی ونبوو

جون ملتون

وەرگێڕانی:

کەریم دەشتی

**2019**

AWER
Nawandi Awer

## ناوەندی ڕۆشنبیریی ئاوێر

ناوەندی ئاوێر
بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: حەسەن بورەیی
- بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: ئاریز حەسەن
- ڕاوێژکاری ناوەند: حەیدەر عەبدوڵڵا


هەولێر پشت بازرگا پشت مزگەوتی مەحموود عەلاف
07505114142 - 07507476644
Nawendi Awer:: ناوەندی ئاوێر
Nawendi.awer@yahoo.com

- ناوی کتێب : داستانی فیردەوسی ونبوو
- بابەت : داستان
- وەرگێرانی : کەریم دەشتی
- نۆرەی چاپ : چاپی یەکەم ٢٠٢٠
- شوێنی چاپ : چاپخانەی هێڤی / هەولێر
- تیراژ : ١٠٠٠ دانە
- نرخ : ٩٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە سپاردنی (٩٨)ی ساڵی ٢٠٢٠ی پێدراوە

# پێشەکی

داستانی فیردەوسی ونبوو، گرنگترین بەرهەمی ئەدەبی دونیایە، دوای کۆمێدیای خوداوەندی دانتی ئەلیژیری، شاکارێکی پڕ مەعریفەی مێژوویی و رۆشنبیریی و ئەدەبییە، هەروەها یەکێکە لە گەورەترین شاکاری ئەدەبی ئینگلیزی، جون ملتون بۆ نووسینی ئەم مەلحەمەیە، گەلێك سەرچاوەی گرینگی دونیای خوێندۆتەوە، هەر لە میتۆلۆژیاکانی گریکەوە، تا گەیشتۆتە سەرچاوە رۆشەنبیرییەکانی سەردەمی ژیانی خۆی، شارەزایەکی تەواوی لە ئیلیادەی هۆمیرۆس و ئەنیادەی فێرژیل و هونەری شیعری هۆراس و شاژنی جنۆکانی سبنسر و شانۆگەرییەکانی شەکسبیرو میتامۆرفۆسی ئۆفید و فیتاگۆرس هەبووە، بایەخێکی زۆری لێوەرگرتوون، هەلبەت داستانی فیردەوسی ونبوو، بە رێ و رەسمی ئەدەبی کلاسیکی نووسراوە، بایەخی هەرە گرنگی ئەم کتێبەی ملتون لەوە دایە، کەدیقەتێکی شاعیرانەی یەکجار زۆری لە دارشتنی شیعرەکانیدا بە خەرج داوە، لە رووی وێنەی شیعرییەوە سەرسامی بۆ خوێنەر دروست دەکات، لە دەمی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا، هەست بەوە دەکەیت کەملتون، خودانی زاکیرەیەکی کەم نەزیرە.

بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە، سوودم لە سەرچاوەیەك زیاتر وەرگرتووە، دوو سەرچاوەی عەرەبی بەهێزی وەرگێڕە بەناووبانگەکانی عەرەب و سەرچاوەیەکی فارسی بەهێزی وەرگێڕە بە ناوبانگەکانی فارس، هەروەها جگە لەوانەش چوومەتەوە سەر دەیان وتارو نووسین و شیکردنەوە، دەربارەی ئەو شاکارە، من بەهەمان ژمارەی نەشیدەکانی ملتون کارم نەکردووە، پابەند بوویمە بە مانا لە زمانی کوردیدا، عەرەبەکان بەهەمان ژمارە کاریان کردووە، بۆیە زۆرجاران، ناگەیتە مانای کۆتایی و دەقەکە، بڕاوە چۆتە سەر ژمارەیەکی ترەوە، من وام نەکردووە، بەپێی تەواو بوونی ماناوە، ژمارەم داناوە، بەڵام وەرگێڕی فارسی هەموو ژمارەکانی فڕێداوە بەشێوەی گێڕانەوە، وەك پەخشان کاری لەسەر کردووە.

سەبارەت بە پەراوێزەکانی ئەم کتێبە، کە ژمارەیان بەقەد ژمارەی کتێبەکە خۆیەتی، من تەنها ئەو پەراوێزانەم هێناوەتەوە، کە خزمەتی دەقەکە دەکات و

ڕوونکردنەوەی پێ دەبەخشێ، بەڵام هەموو ئەو پەراوێزانەم فەرامۆش کردووە، کە باس لە شتگەلێك دەکات، پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە کتێبەکەوە نییە، بەڵکو زیاتر زانیارییە بۆ خوێنەر لە بابەتی ترەوە، بۆ وەرگێڕانی سروودەکانی ملتۆن لەیەك کاتدا سوودم لە هەموو سەرچاوەکان وەرگرتووە، چ لە کۆی دەقەکە چ لە ڕستەو وشەو پەرەگراف و شوێن و کەسەکان و بەرهەمەکان، کامیانم پێ باشتر بووە، بەگەڕانەوە بۆ دەقە ئینگلیزییەکەوە، ئەوەم تۆمار کردووە. خۆم پەیوەست نەکردووە بە وەرگێڕانی دەقەکە، وەك دەق، بەڵکو پابەندی مانای دەقەکە بوویم، هەروەها لە تێکستی هەر سروودێ، چەند وشەیێ ژمارە بەند کراون، ئەوانە ئەو وشانەن کە لە ژێرەوە پەروێزیان بۆ کراوە، بایەخی ئەم کتێبە لە سەرچاوە میتۆلۆژییەکانیەتی، شاعیر لەزۆر شوێندا ڕووداوەکانی لەناو قاوغی ئاییندا دەرکێشاوە، بەرو جیهانێکی مەعریفی و ڕۆشنبیری بردوون و تێکەڵ بە دونیای تازەی کردوون، هەلبەت بە ستایلێکی جوانی شیعرییەوە.

کتێبی فیردەوسی ونبوو ، لە عەرەبییەکەی بە - الفردوس المفقود — و لە فارسییەکەی بە - بهشت گمشده - وەرگێردراوە، بۆیە منیش بە هەمان مانا وەرمگێڕاوە، ڕەنگە ئەم مانایە تەواو لەگەڵ ئینگلیزییەکە نەیەتەوە، کە باس لە فیردەوسی لە دەستچوو دەکات، نەك ونبوو، لە عورفی ئەدەبی ڕۆشنبیریی، دەکرێت وا بێت، پۆلبەندی کتێبەکەی ملتون بەش بەش نەکراوە، بەڵکو کتێب کتێب دابەشکراوە، بریتییە لە دوازدە کتێب، من تەنها هەشت کتێبی ئەو داستانەم کردووە بە کوردی، ئەگەر تەمەن بوار بدات، چوار کتێبەکەی تریش ئامادە دەکەم، لە کتێبی یەکەمی فیردەوسی ونبوو ، شاعیر باس لە هەڵگەڕانەوەی مرۆڤ دەکات دوای لە دەستدانی فیردەوس، هەروەها بە شیعرمتێکی سەردولکە ئامێزەوە باس لە ژیانی خۆشی ناو فیردەوس دەکات، کە چۆن بەهۆی ئەو هەڵگەڕانەوەیە، لە دەست مرۆڤ نامینێ و مرۆڤی لێ ئاوارە دەکرێ، شاعیر ئۆباڵی هەموو ئەو کارەساتە، دەباتەوە سەر ئەهریمەن، یاخود ئیبلیس، یا هەرماس یا شەیتان، هەلبەت لە وەرگێڕانەکەدا هەمان ئەو ناوانە بۆ یەك مەبەست بەکار هاتووە، ئەویش ئەهریمەنە، لە کتێبی دووەمدا کە تەرخانە بۆ نەخشەو پیلانی ئەهریمەن لە پێناوی کۆکردنەوەی هێزو

توانای خۆیان ، ئەوانەی کە لە گەڵیا بوونە شەریك لە هەڵگەڕانەوەکەدا ، بۆ ئەوەی لە ڕێگەی شەڕەوە، تۆڵەی خۆیان بکەنەوەو لە گەڵ ئاسماندا بکەونە جەنگ، ئاواتی دێرینەی خۆیان بهێننە دی، هەروەها دواجار تەواوی فریشتە هەڵگەڕاوەکان، ئەهریمەن سەرپشك دەکەن تا بچێ ئەو شوێنە خۆشەیان بۆ بدۆزێتەوە، تا دواجار دەگاتە ئەو شوێنە، لەکتێبی سێهەمدا ملتون باس لەوە دەکات کە چۆن ئەهریمەن دەچێتە ناو مەلەکووتی خوداو بەهەشت دەدۆزێتەوەو لە ڕێگەی فریوە بەهێزەکانی، دەگاتە ناو بەهەشت و کارەساتی مرۆڤ دەست پێدەکات، هەروەها لەم بەشەدا، باس لە مەسیح کراوە کە چۆن و بۆچی و کەی خۆی کرد بە فیدای تەواوی مرۆڤایەتی، هەر لەو بەشەدا، ئەهریمەن دەکەوێتە جەنگی ئاسمانەوە، دوای ئەوەی خوا دەسەڵاتی تەواو دەبەخشێتە مەسیحەوە، لە کتێبی چوارەمی میلتون، ئەهریمەن دەست دەکات بە پیلان و تەڵەکە بازی، فریودانەکانی خۆی دەست پێدەکات و دەگاتە ناوەندی بەهەشت، ئادەم و حەوا دەبینێ و تا فریویان بدات ، بەری داری مەعریفە بخۆن کە لێیان حەرامکرابوو، لە کتێبی پێنجەمدا، ئاسمان ڕافائیل دەنێرێتە لای ئادەم و حەوا، بۆ ئەوەی ڕاسپاردەکانی ئاسمان، وەك ئامۆژگاری بۆ ئەوان ڕوون بکاتەوە، هەروەها تەواوی مێژووی ڕووداوەکانی ئاسمانیان بۆ باس دەکات، لە کتێبی شەشەمدا کۆتایی بە پیلانەکانی ئەهریمەن دێت و لەسەردەستی مەسیح هەموو ئەو هەڵگەڕاوانە تارومار دەکرێن و ڕوانەی دۆزەخ دەکرێن. لە کتێبی حەوتەم و هەشتەمدا ملتون درێژە بە دیالۆگ و گفت و گۆکانی ئاسمانییەکان و ئادەم دەدات و گەلێ لە نهێنییەکان بۆ ئادەم لە ڕووی خەلق و ئەفراندنەوە باس دەکات تا ئەو کاتەی کە خودا چۆن حەوای بۆ لە جەستەی خۆی دەئافرێنێ.

کەریم دەشتی
٢٠١٩/٧/٢٠
هەولێر - خانزاد

# 1

یەکەمین جار، کە مرۆڤ لە خودا هەڵگەڕایەوەو بەری ئەو درەختە حەرام
کراوەی خوارد، کە چێژی فەنای[١] دەبەخشی
ئەو چێژەی مەرگی هێنا دونیاوە و خەمی بەسەرا باراندین[٢]
ئەو چێژەی بووە هۆی ئەوەی، فیردەوسی عەدنمان[٣] بۆ ماوەیەك لە دەستبچێ
تا ئەوکاتەی مرۆڤێکی مەزن[٤] دێ و سەر لە نوێ بۆمان دەهێنێتەوەو عەرشە
خۆشەکەمان بۆ دەگەڕێنێتەوە.
تۆ ئەی خوداوەندی[٥] شیعری ئاسمان، گۆرانی بچڕە، گۆرانی
ئەی ئەوکەسەی دابەزیتە، دوا ترۆپکی شاراوەی چیای هۆریب[٦]
بووی بە ئیلهام بەخشی ئەو شوانەی[٧]، یەکەمین کەس بوو
نەوەی هەڵبژێردراوی[٨] خۆی فێری ئەوە کرد:
کە سەرەتا[٩] چۆن چۆنی زەوی و ئاسمان لە هەیولاوە[١٠] هاتنە کایەوە
جا ئەگەر ترۆپکی سەهیۆن[١١] و ڕووباری سەلوامت[١٢] بە دڵە

---

١- چێژی فەنا واتە ئەو چێژەی، کە مەرگ و هیلاکی بەدواوەیە- تەکوین ٢-٧١.

٢- خەمی بەسەرا باراندین - ئەمە قسەی ئینیاسە، لە ئەنیادەی فیرژیل دا.

٣- عەدن، مەبەستی فیردەوسە.

٤- مرۆڤێکی مەزن دێ، مەبەستی هاتنی مەسیحە.

٥- خوداوەندی شیعر، کریستانەکان پێیان وایە سەرچاوەی ئیلهام و سرووشە.

٦- هوریب ، لوتکەی چیای سینایە بە توری سینین ناودارە .

٧- ئەو شوانە، مەبەستی موسایە، موسا شوان بوو بە مانا مەجازییەکەی، سەباریت بە سەرابیل- الخروج ١-٢ بۆمانای یەکەم و مەزمور ٢٢-٧٧ بۆ مانای دووەم، کە دەڵێ — گەلی خۆتم وەک مەڕ دابە تۆ..

٨- ئەو نەوە هەڵبژێردراوە، مەبەستی بەنی سەراییلە.

٩- کە دەڵێ سەرەتا.... ئەوە دەسپێکی سیفری تەکوین.

١٠- هەیولا واتە مژادی سەرەتا، کە نە شێوەی هەیە نە وێنەو دونیای لێ خەڵق بووە، بە -کوێریی- ناو دەبرێت.

١- سەهیۆن لوتکەی خوداوەندانی هونەر، پێی دەڵێن چیای داود

٢- سەلوام پێشتر چۆمێک بوو، ئاوی لێ هەڵدەڕژا، بوو بە جۆگەلەیێ، باخچەی پاشای ئاودەدا، ئینجیل یوحنا ٢٢-٢-

کە لە تەك ماڵی خوادا، بەخێرایی هەڵدەقوڵا
ئەوە من هاواری یارمەتی تۆ دەکەم، تا سرووودەکانم دارێژیت
ئەو سرووودانەی بە مەترسی دەورەدراون
نایانەوێت بە ناو ئاسمانی نێوەنددا، بسوورێنەوە
بەڵکو دەیانەوێ بەسەر چیای ئایونیاوە[1]، بەرز بەرز هەڵفڕن
تا هەموو ئەو شتانە چارەسەر بکەون
کە پێشتر، بە پەخشان و شیعر چارەسەرنەکراون.

## 2

بەتایبەتی تۆ ئەی ڕۆح، ئەی ئەو کەسەی لە پاکی دڵەوەی دادەبەزییە
مەنزڵگایەك ، کە بەسەرهەموو پەرستگاکانەوە، بەرزتر دەبیتەوە
وەرە ئەوەم فێرکە، کە فێری بووی، تۆ لە سەرەتای[2] بوونەوە هەر هەبووی،
هەردووشاباڵت، بەسەر ئەو بۆشاییە فراوانەدا کردبۆوە
پاشان وەك کۆترێ[3] بەسەریا هەڵکورمای، تا ئەو کاتەی ژینی[4] هاتە بەر
هەناو، تاریکایی دەروونمی نەهێشت و بەهێزی کردم
لە وانەیە تا ئاستی مەقامی ئەو واچەیە، بەرزبووبمەتەوە
تا تەگبیری سەرمەدی خوداوەندی ڕوون کەمەوە، بەڵام چۆن
ڕوونکردنەوەیێ؟
تا ئەوەتان بۆ راڤە بکەم، کە خوا چی لە ئینسان دەوێ؟

---

١- لە سەرەتای بوونەوە.... مەزمووری ٥١- ١و ٢
٣- چواندنی ڕۆح بە کۆتر مەبەستی ڕۆحی قودسە.
٤- دەڵێن گوایە ژیان و مرۆڤ لە مەرگ و تاریکی دروست بووینە.

## 3

نه له فیردەوس نه له قووڵایی سەختی دۆزەخەوە
هیچ شتێ له تۆ شاراوە نییە
وەرە یەکەمجار سەبارەت بە دایاوانی مەزنمان، قسەم بۆ بکە
ئاخۆ چی بوو وای لەوان کرد، لە ناو ئەو هەموو خۆشی بەختەوەرییەیاندا
ئاسمانی خۆیان تووڕە بکەن و لە ویستی ئەو هەڵگەڕێنەوە؟
کە ئاسمان ئەوانی بە باشتر لە هەمووان زانیوە؟
دوائیەوەی کە دونیای، بە تەنها قەدەغێ خستە بەر دەستیان؟
کێ بوو یەکەمجار ئەوانی بەو حەرامکراوەدا[1] فریو دا؟
مارە دۆزەخییەکە[2] ؟ ئەو بوو، بە مەکری شاراوەوهەڵکاریی وتۆڵە، فێڵی لە دایکی هەمووەرۆڤایەتی کرد

## 4

لەبەر خۆ بە زل زانینی خۆیەوە، فیردەوس تووڕی هەڵدا
ئاپۆرەی هەموو ئەو فریشتە هەڵگەڕاوە هەوادارانەشی لە گەڵدابوو، چاوی لەوە بوو یارمەتی بدەن
تا بە کۆمەگی ئەوان بگاتە شانازییەکی بەرزو پایەی ئاسمانی
زمانی بەسەرا درێژ کرد، ئابەمجۆرە ئەو تەماحکارە هانیدان
سەرکێشی لە عەرش و موڵکی ئاسمان بکەن، کوشتارێکی دەۆری لە فیردەوسدا وروژاند
شەڕێکی وای کرد، تەنها خۆبەزلزانەکان دەیکەن و
هەمیشەش بەرهەمەکەی بە فیڕۆ چوون شەرمەزارییە
ئابەمجۆرە، خودای گەورە لە بەرزایی ئاسمانەوە، فڕێی داو کەوتە خوارەوە

---

١- حەرامکراو، خواردنی درەختی مەعریفەی خێرو شەڕ.

٢- مارە دۆزەخییەکە، واتە ئەهریمەن.

ئاگری لێ هەڵدەسا و وێرانییەکی کوشندەی تووش هات
بوو بە لۆمە کراوێکی بەزیو
دابەزییە ئەو دۆزەخەی، کە ژێرمووەی بووە مەسکەنی ئەو
لەوێ بە زنجیرێکی هێجگار پتەو پابەندیان کرد،
لە ناو ئازارێکی سووتێنەردا هەڵدهەقرچا
ئەومیش بەهۆی ئەمەوە بوو، کە زاتی ئەوەی کردبوو
مل لەبەر ملی خودانی هێزو جەبەرووت بنێت

## 5

ئابەمجۆرە بە درێژایی نۆ شەوو نۆ رۆژان، بە پێوانەی مرۆڤ
لە ناو خەرمەندی بەزیندا، لە گەڵ هاوڕێ ڤێزمومنەکانیا ڕاکشا بوو
لە ناو کڵپەی ئاگردا خۆیان هەڵگێڕو ومرگێڕ دەکرد
ئەهریمەن تووشی تووشی سەرسامی بوو بوو، هەرچەندە نەمریش بوو
وای بۆ نووسرابوو، کە هەمیشە تووڕیی ئاسمانی بەسەرا زیاد بێت
دەستی کرد بە بیرکردنەوە دەربارەی بەختەوەرییە لە دەست چووەکان و
عەزابی بەردەوامی خۆیەوە

## 6

بە چاوشۆڕەوە دەستی کرد بە، سەیرکردنی دەوروبەری خۆی
ئەو چاوانەی، کە ئازارو دۆرانی بینیوە
لەگەڵ ئەو غروورو پیلەو ڕقە زۆرەی، کە لە گەڵیا ئاوێزان بووبوو
هەر زوو بەقەدەر ئەوەی، کە فریشتە دەرکی پێدەکات
دەرکی بە خراپی و تەنگحاڵی خۆی و لە دەستدانی خۆی کرد.

## 7

ئەو لە گەومرێکی ترسناکدا بوو
لەناو تەندوورێکدا کە ئاگری لێ هەڵدەقرچاو بەشووره دەورەدرابوو
ئاگرێکی بێ ڕووناهی، بەڵکو شەومزەنگێ
تەنها گوزارشتی لە دیمەنی هەرێمی خەمباری وسێبەری دڵتەنگی دەکرد
کە قەت ئاشتی و ئارامی لێناکەوێتەوە
هەرئەومش نا بەڵکو ئاواتی تێادا قەدەغە بوو
کە لە هیچ کەسێ قەدەغە ناکرێ
ئازارێك بەردەوام هەڵدەقوولا، لافاوی مەشخەڵی ئاگراوی خۆراکی پێدەدا
کانی کبریت بوو، کە قهەرگیز سکڵی ناکوژێتەوە، قەتیش سەرچاوەی نابڕێتەوە
ئەو شوێنەبوو کە دادپەروەریی سەرمەدی
بۆ ئەو هەڵگەڕاوانەی ئامادە کردبوو

## 8

حوکمی زیندانی کردنی ناو تاریکیان بەسەرا درابوو
بەشی ئەوان بە قەدەر دووریان لە خوداو نووری ئاسمان حسێب کرابوو
سێ میلی دووری چەقی زەوی لە دوا جەمسەردا
وای ئەو شوێنە چەند جیاواز بوو، لەو شوێنەی لێی کەوتبوونە خوارەوە

## 9

هەر زوو بینی، دەریای پڕ شەپۆلی ئاگر و گێژەنی گڕوکڵپەی داگیرساو
ئەو هاوەڵانەی هەڵدەپڕژانده ناو یەکەوە، کە لەگەڵیا کەوتبوونە خوارەوە
لە تەکیەوە هاوڕێیەکی خۆی بینی، کە لە دوای ئەو دەهات

له دەسەڵات و گەورەیی تاوانەکەیدا، لەبەر ئازار دەپرینگایەوە
دوای زەمەنێکی زۆر لە فەلەستین بە بوعلزیوب[1] ناسراو، ناوبانگی دەرکرد

## 10

پاشان دوژمنی گەورە هات و بۆ لای ئەو چوو
کە دوایی لە ئاسمان ناوی بوو بە هەرماس[2]
بە دەنگێکی بەرزەوە، بێدەنگییە ترسناکەکەی شکاند
ئەگەر تۆ ئەوی، بڵێ چۆن کەوتوویتە خوارەوە و چۆن گۆڕاوی
وای چەند بە دووریکەوتوویتەوە لەو هەرێمە خۆش و رووناکییانەی
من تۆم لەوێدا دەبینی
کە جوانییەکەی بەرەو هەوراز دەدرەوشایەوە
بترووسکەی بەسەر هەزاران هەزاردا زاڵدەبوو
ئەگەر تۆ بەڕاستی ئەو کەسە بیت، کە پەیمانێکی توندوتۆڵ وهاوکاری
بیرو یەکگرتنی وشەو هیواو مەترسی یەکسان، منیان بەتۆ بەستابێتەوە
کەوا ئێمە ئەو کارە گرینگە ئەنجام دەدەین
ئەهریمەن لە بەر خەم و تووڕیی، سەری لێ شێوا
ئەوە ئەمڕۆکە من بە ئازاروخەم و دۆڕانی هیواوە، بەتۆوە پەیوەستم

## 11

لە کام لوتکەوە [3]کەوتوویەتە خوارەوە؟
کە ئەوسەلماندی لە بروسك و هەورە تریشقە بەهێز ترە

---

١- بوعلزبوب، میری ئەهریمەنەکان – بە زمانی عیبری گەورەی مێشەکان.
٢- زۆر جار وشەی هەرماس لە جیاتی ئەهریمەن بەکار هاتووە.
٣- لەکام لوتکە...... وەلامی برۆمیتۆس بۆ زەیوس ، لە شانۆگەری برۆمیتۆسی زنجیر کراودا وەرگێراوە.

ئایا کەس پێش ئەو، بەو دوو بازووە بەهێزەی منی دەزانی؟
بەڵام نە ئەوە ، نە هێزی سەرکەوتووش
کە بە تووڕەیی خۆی تووڕمان هەڵدەدا
ناتوانێ وام لێبکات پەشیمان ببمەوە یا بگۆڕێم
ئەوەی کە وای لێکردووم ، جوانی ڕواڵەتم لێ ونکات
ناتوانێ ئەوە بگۆڕێ، کە من دەمەوێ ئەنجامی بدەم
ناتوانێ سەرکەوێت بەسەر کبریای چەسپاوی منەوە.

## 12

ئەگەرقودرەتی خۆم بکەم وەك پیشە بەکار بهێنم
ئەوبوو کە ئەو کبریایەی منی، خستە ناو ئەم گەڕەلاوژە تووشەوە
هەر ئەو کبریایە بوو وای لێکردم، بە هێزێکی زۆر لە رۆحی
تەیارکراوەکانەوە، شەڕی بەهێزترینی بەهێزان بکەم
لەوانەی کە جەسارەتیان کرد، دژایەتی حوکمی ئەو بکەن
هەموویان بەلای مندا کەوتنەوە
بەدژە هێزی خۆیانەوە، لە شەڕێکی دژوارداو لە دەشتاییەکانی ئاسماندا
شەڕی هێزی یەکجار زۆری ئەویان کرد

## 13

مەلەکووتی ئاسمان لەرزی، ئەی ئەگەر شەڕەکەمان دۆڕاند؟
هەموو شتێکمان لە دەست نادەین، ئیرادە ناشکێنرێ
هەوڵی تۆڵە کردنەومو ڕقی ئەبەدی و ئازایەتی
ناچێتە ژێر بارو خۆبەدەستەوە نادات
ئایا شتێکی تر هەیە کە نەتوانرێ زاڵ بین بەسەریا؟

ئەوە شانازییێکە ، تووڕەیی و جەبەرووتی ئەو ناتوانێ لە منی بسەنێ
بەلاّم چەمینەوەو داوای لێبوردن، بە چۆکداهاتن و چوونە ژێر باری دەسەلاّت ؟
دەسەلاّتێ کە زەندەقی لەو بازووە چووە
کە ئیمپراتۆریەتی ئەوی لەرزاندووە
ئەوەش لەو مەودا کورتە دا بوو، کە لە مولکی خۆی ترسا
ئەوەیش زەلیلی و بێهێزییە، بەڵکو سەرشۆڕییەکی یەکجار شوورەییە

## 14

زەلیلیەکی ئاشکراو گەورەیە، ناگاتە ئەو داڕمانە
بەلاّم قەدەر حوکمی خۆی بۆ هێزی خوداوەندەکان و
ئەو کیانە ئاسمانییە داوە، کە هەرگیز تووشی بێهێزی نەبن
لەبەر ئەوەی کە ئێمە بەچەکێکی باش، خۆمان لەو ڕووداوە مەزنە دا داوە
بۆیە ئێمە بە هیوایەکی گەشبینەوە، دەتوانین شەڕێکی ئاشکرا ڕاگەیەنین
لە دژی ئەو دوژمنە بەهێزەی، کە ئێستا سەرکەوتووە

## 15

جا ئەگەر ئێمە خۆمان کۆکەینەوەو هیوایەکی راستەقانمان هەبێت
کە شەڕێکی سەرمەدی بکەین – بە مەکر بێت یا بە خورتی –
هەرگیز گڕوکڵپەی بەسەر دوژمنی دژواری ئێمەدا نەکوژێتەوە
کە ئەمڕۆکە سەرکەوتنی بۆ بڕیاردراوەو لە ناو خۆشییەکانی ئەو سەرکەوتنەدان
ئابەمجۆرە ئەو فریشتە بەدکارە، سەرەڕای عەزابی خۆی، ئاوا قسەی کرد

خۆی گیف کردبۆوە و دەیقیژاند  ئازارێکی قووڵ ئەوی هەڵدەلوشی

## 16

ئەوەندەی نەخایاند، کە لە هاوڕێ جەسوورەکەیەوە، وەڵامێك هات:
ئەی ئەمیر، ئەی ڕابەری زۆر لە قارەمانە تاجدارەکان
ئەی ئەو کەسەی ڕابەرایەتی جەنگاوەرە ئازاکانی
بەرزترین چینی فریشتانت، لەمەیدانی شەڕدا کرد
ئەوانیش لە ژێر سەرکردایەتی تۆدا، کاری ترسناك و جەسووریان ئەنجامدا،
کە هەڕەشەی مەترسی بوو بەسەر مەلیکی هەمیشەیی ئاسمانی
سەلماندت کە پایە بەرزیت
جا ئەگەر لەبەر هێز یا سوتفە یا لە بەر قەدەر بووبێ یانا؟
ئەوە ئەو ڕووداوە ترسناکە لەبەر چاوەمدا
خۆی نمایش دەکات و داخ و خەم دەوروژێنێ

## 17

ئابەم كودێتا ئازاربەخشە وئەو بەزینە قێزەونەی كە فیردەوسی لێ ونكردین
لە كاتێكا ئەوهەموو ئاپۆڕە رامالندمشمان لە گەلدابوو
ئای بۆ ئەم هیلاكبوونە سەرشۆڕكارە، وای بۆ ژێرەوەی ئەم قوولاییە داتەپیوە
گشت ئەرباب و بوونەوەرێكی ئاسمان، ئەوانەی كە فەنا دەبن لە ئێمەدا فەنا بوون
هێشتاكە رۆح و زەینمان بەهێزو خۆ ڕاگرن.

## 18

هەر زوو تین وتاومان بۆ دەگەڕێتەوە، سەرڕای كوژانەوەی پشكۆی شانازی و بریقە
سەرەڕای ئەوەی شەقاوەت، بۆ ئەبەد خۆشییەكانی قووت دا
بەلام بەو كەسە گەورەیە چی، كە ئێمەی شكاند؟
من ئەمڕۆكە باوەڕدەهێنم بەوەی كە ئەو توانای بەسەر هەموو شتێكەوەدا هەیە
چونكە جگە لەو كەس نەیدەتوانی، ئەو هێزەی ئێمە، بەو هێزەوە تێكبشكێنێ؟
ئایا ئەو رۆح و ئەو هێزە تەواوەی بۆ ئەوە بۆ جێهێشتین
تا ئازار بكێشین و ئازارمان زیاد بكات؟
تا تێر تووڕەیی تۆڵەكردنەوەی ئەو بین، یا لە بەر ئەوەیە كە بووینەتە كۆیلەی ئەو؟

## 19

دەبێ باری ئەومان بە کۆڵەوە بێت؟ .
مافی زاڵبوون و سەرکەوتنی هەیە، لە هەرچییەك فەرمانمان پێبکات
جا ئەگەر لە ناو دڵی ئاگر بین و بە ئاگری دۆزەخ بسووتێین
یاخود لە نێو قووڵایی کوێری وتاریکیدا ویستی ئەو جێبەجێ بکەین؟
ئایا سوودی چییە ئێمە هەست بەوە بکەین، هێزێکی گەورەین یا
بوونەوەرێکی سەرمەدین؟
مادامەکێ کەوتووینەتە ژێر باری سزای ئەبەدی ئەوەوە؟

## 20

هەر زوو وەڵامی شەیتانی گەورە هات و گوتی :
ئەی ئەو فریشتەی کە کەوتوویتە خوارەوە : بێهێزی شەقاوەتە
جا چ لە گوێڕایەڵی کردنی ئاسماندا دا بێت و چ لەئازارکێشاندا
متمانەت بەو قسەیەی من بێت، ڕۆژێ لە ڕۆژان کاری خێر ناکەین
بەڵکو ڕۆژێ دێ وەك من، تەنها لە شەڕدا خۆشی دەبینی
ئەوە دژی ویستی سەرەوەیە، بۆ ئەو کەسەی بەرگری دەکات
یا دژایەتی ، جا ئەگەر ئەوە ویستی ئەو بێت کە خێر لە شەڕکاریمان
بەدەست بهێنێ
ئەوە دەبێت ئەو هەوڵە تێکبدەین و وا لە خێر بکەین، ببێتە هۆیەك بۆ شەڕ

## 21

هەرچەند ئەو هەوڵە سەر بکەوێ یاخود شێلوبێت
ئەگەر گومانی منیش سەرنەکەوێ
ئەوە لەوانەیە تیری ئەو سەرچیغ بچێ و مەبەستی خۆی نەپێکێ
بەڵام سەیرکە وا سەرکەوتووی تووڕە
پەیامبەری تۆڵەسەندنەوەی بانگ کردووە

## 22

گەڕاوەنەتەوە بۆ دەرگاكانی فیردەوس
ئاوی ئەو كبریتەی كە رەشەبای لەناوبەر
بەسەرئێمەیدا هەڵكردووە، كۆتایی هاتووە
شەپۆلی ئاگرینی ناو قووڵایی ئاسمان كوژاوەتەوە
رەشەبای بە برووسكی سوور و تووڕەیی تووش تەیاركراو
تیری نەماوە ئێستا وەستاوە
لە شوێنێكی یەكجار قووڵاییێكی لە لووره كەوتووە
نابێ ئەو هەلەمان لە كیس بچێت
جا ئەگەر بە هۆی ئەوە بێ كە دوژمن سووكایەتیمان پێ دەكات
یاخود غەنیمی ئێمە تووڕەیی خۆی تێر كردبێ و شڵەژابێ

## 23

ئا ئەو دەشتاییە خەمبارو چۆل و ترسناكە دەبینی؟
كە بارەگای گۆشەگیریی و وێرانی و خۆڵ ودوورلە ڕووناكییە
ئەوە تەنها برووسكێكە لەو ئاگرە زەردەی
كەبەلاوازی و ترسەوە هەڵدەقووڵێ
بێئومێدییەكی ترسناكە با بۆ لای بچین
تا بمانپارێزی لە ئاگری ئەو شەپۆلە ترسناكانە
ئەلەوێ دەحەسێینەوە ئەگەر بەندەرێكمان بۆ حەسانەوە دۆزییەوە

## 24

با سەر لە نوێ هێزی هیلاك بووی خۆمان كۆكەینەوە

لەمیانی خۆماندا گفتوگۆ بکەین
لەبارەی ئەو شتەی کە هێرشی پێ دەکەینە سەر دوژمن
هەروەهاسەبارەت بەو هۆکارانەی
کە ئەو شتانەمان بۆ دەگەڕێنێتەوە، کە لە دەستمان داوە
هەروەها چۆن بەسەر ئەو کارەساتە ئازاربەخشەدا زاڵ بین
ئایا چ هێزێ هەیە تا لە هیوادا وەربگرین
ئەگەر رزگاریمان نەبێ لە نائومێدی

## 25

ئابەمجۆرە ئەهریمەن لە قسەکانی خۆی بۆوە، بۆ هاورێ نزیکەکەی
سەری بەسەر شەپۆلەکانەوە بەرز کردبۆوە
چاوەکانی دەرقەڕیبوون و ئاگریان لێدەباری و برووسکیان دەدا
بەڵام ئەندامەکانی بەسەر دەریادا لار بوونەوە
مەودایەکی زۆریان بە مەلە بڕی
درێژبوونەوەو زل هەڵگەڕان

## 26

هەیکەلێکی زەبەلاح، وەك وەحشییە ئەفسانەییەکان
بە خۆ و بە قەلافەتی فەلامەرزییەوە
کە پێیان دەگووت تیتانا[١] یاخود کوڕی زەوی .
شەڕی لەگەڵ جوبیتێر[٢] کرد، یاخود وەك بریاروس[٣] یا تایفون[٤]
کە بێشەکەی لە تەرسوسی دێرین بوو
یاخود وەکو لیفایاثانی[٥] - وەحشی دەریا
کەخوا لە میانی هەمووواندا خەڵقی کرد. تا مەلە لە ئۆکیانووسدا بکات

## 27

دەریاوانەکان دەگێڕنەوە بینیویانە
لە سەر کەفاوی دەریای نەرویج دا دەخەوت
لەو کاتەدا کەشتییەوانی کەشتییەکی بچووك
ڕێی لە تاریکیدا ونکردبوو، کە بینی بووی وای زانی بوو کە دورگەیەکە

## 28

ئیدی قولابی لەنگەری خۆی لە پێستی رەقی گیرکردبوو
شەو لە کەناریدا لە ژێر بای دەریای بەسەر بردبوو
تا ئەو کاتەی شەو دەریای تاریك داهێنا و تا سپێدە لەوێدا دەمایەوە
ئا بەمجۆرە شەیتانی گەورە لەسەر پشت رادەکشا

١- تیتانا، ئەفرێنراوێکی زەبەلاح و فەلامەرز بوو، شەڕی زەیوسی کرد.
٢- جوبیتیر،گەورە خوداوەندی ئۆلیمپ.
٣- بریارۆس، بە مانای بەهێزدێت و سەد دەستی هەبوولەگەڵ پێنج سەر.
٤-تایفۆن، کوڕی زەوی و هێرشی کردە سەر زەیوس و سەد ڕمی لێدا و سەرکەوت.
٥- لیفایاتان، وەحشێکی ئاوی بوو، رەمزی خیانەتکارییە.

وەك دێوێكی زاڵی زنجیر كراو
بەسەر دەریاچەیەك لە ئاگردا

## 29

بەڵام هەرگیز نەیدەتوانی سەری خۆی بەرز بكاتەوەو هەڵسێتەوە
ئەگەر ویست و ئارەزووی خوداوەندی بەرزی ئاسمان
مۆڵەتی نەداباو ئازادی نەكردبا
كە مۆڵەتی پێداو گەڕایەوە سەر نەخشە تاریكەكانی
تاوان لە دوای تاوانی ئەنجام دەدا

## 30

هەوڵی دەدا ئەوانی تر بخاتە داوی شەڕی خۆیەوە
بە تووڕەییەكی زۆرەوە لەوە گەیشت
كە هەموو شەیتەنەتیەكانی، چیتری لێ شین نابێت، جگە لەوە
چونكە خێری بێكۆتایی و بەخششی بێ حسێب
زۆرتر بۆ ئەوانە دەبێ، كە فریوی ئەویان خواردووە
ئەوەیش زیاتر تووشی نەنگی خەشم و تۆڵەكردنەوەی دەكرد
لەو حاڵەتەدا ئەو هەرگیز هێزی هەستانەوەی یا سەربڵندكردنەوەی نەدەما

## 31

لە ناكاو لە ناو دەریاكەوە هەڵسایەوە
بە باڵای زەبەلاحییەوە خۆی قیت كردەوە
بەهەردوو دەستی زمانەی ئاگری دەرپەڕیوی ڕادەدایە تەلانی دواوە
وەك شەپۆل هەڵدەڕژا
دۆڵێكی ترسناكی لە میانی هەردوو دەستەكانی دروست كرد

## 32

ئینجا باڵی کردەوەو بۆناو ئاسمانی تاری هەڵفڕی
که هەرگیز هەوای ئاسمان، باری گرانی وای بەخۆیەوە نەبینی بوو
پاشان خۆی هەڵخستە سەرزەمینی فراوانەوە ·
وەك ئەوەی زەوی بۆ ئەبەد
وەك ئاگرێکی پەیتی رەق هەر لە گڕو گڵپەدا بوو بێت
وەك چۆن دەریاچەکەی بە ئاگرێکی شل خستە گڕوکڵپەوە

## 33

رەنگی وەك گڕکانی لێهات
هێزی بایە بەندکراوەکانی قووڵایی زەوی
دەیوروژاند و گردەکەی لە شوێنی خۆی دەگوازتەوە
لە چیای بلوروسی[1] دەردەکێشا
یا وەك ئەو دامێنەی کە گڕکانی ئیتنا[2] هەڵیدڕی بوو
هەناوی بە سووتەمەنی زۆرەوە گڕی گرت و داگیرسا
کانزایەکی تیا کولاو، ئینجا بوو بە هەڵم و با بردی
بنی دەریای جێهێشت و دووکەڵ هەڵپێچایەوەو داپۆشت
بۆنێکی پیس و گەنیوی لێدەهات
وای ئەم شوێنە چ شوێنێکی حەسانەوە بوو
بۆ قاچە نەفرەت لێکراوەکان؟
هاوڕێکەشی کە لە پایەدا، لەدوای ئەوەوە دەهات، ئەویش هات
بەوە دڵخۆش بوون، کە نەك بە رازی بوونی ئاسمانی گەورە
بەڵکو بەو هێزەی کە خۆیان، بە دەستیان هێنا بۆوە

---

١- بلوروسی، چیایەکە لە - صقلیە- ، فیرژیل باسی کردووە.
٢- ئیتا، ئەویش چیایەکە لە صقلیە.

لەدەریاچەی ستیژیا[1] ی گڕ دۆزەخیدا ڕایا نکردووە و رزگارییان بووە

## 34

فریشتەی دەرکراو گوتی: کەواتە  ئەو هەرێمە یە
کە دەبێ خاك و ئاو وهەوای بگۆڕینەوە، بە فیردەوسێکی خۆش
ئایا ئەو تاریکییە خەمبارە بە ڕووناکی ئاسمان بگۆڕینەوە؟

## 35

با وابێ، جا ئەگەر ئەمڕۆکە، ئەو کەسەی کە موڵکی بە دەستە و چۆنی بوێ وادەکا
واباشەهەرچەند دەکرێ دوورکەوینەوە لەو
ئەوەی کە بە ئاوەز یەکسانمان کرد، ئەو بەهێز  بەسەریا زاڵ بوو
بەڵام ئەو بە هێزەوە سەرکەوت، بەسەر ئەوانەی وەك خۆیەتی

## 36

ماڵاوا ئەی کێڵگە خۆشی و بەختەوەری
ئەی نیشتیمانی شادی ئەبەدی
سڵاو لە خەم و ترس و دونیای دۆزەخی
ئەی سەرزەمینی وەحشەت
ئەی دۆزەخی قووڵ، خوای تازەی خۆت قەبوڵ بکە
چونکە ئەو بۆ تۆ، ئەندێشەیەکی بە دیاری هێناوە
کە کات و شوێن ناتوانن کاری تێبکەن

١-ستیژیا، لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا هاتووە ، دونیای ژێرەوە ڕووباری تیایە، لەوانە ڕووباری ستیژیا.

ئەوە ئەندێشەو زمینە، کە ئەو شوێنانە خەڵق دەکەن، کە لە ژێرەوەیەتی

## 37

دەتوانێ دۆزەخ بکات بە فیردەوس و فیردەوسیش بە دۆزەخ
باکمان بە شوێنەوە نییە، کە ئێمە لە کوێین؟
چونکە لە هەموو شوێنێ، من هەمان ئەوەم کە بووم
هەر ئەوەشم کە دەبێ ببم
بەڵام بۆچی هەمیشە تۆزێ کەمترە لەوەی، کە هەورەتریشقە
بە هێزی ڕاماڵینی خۆی سەرکەوت بە سەرما؟
لانی کەم لێرە ئازاد دەبین

## 38

چونکە خودا ئەو شوێنەی نەهێناوەتە دی تا ببێتە هۆی شادی
بۆیە ناتوانێ دەرمان بکات، بۆمان هەیە لێرە بە ئاسوودەیی بژین
من وای دەبینم کە سەروەری و سەربەستی
ئارەزووێکی بەرزە، هەتا ئەگەر لە دۆزەخیشدا بێت
سەروەربیت لە دۆزەخ[1] ،باشترە لەوەی، کۆیلە بیت لە فیردەوس
بەڵام ئایا ڕەوایە کە یارانی وەفادارو هاوبەش و هاوڕێکانمان
ئاوا بە سەرسامی لە دەریاچەی فەرامۆشیدا جێ بهێڵین؟
بۆچی بانگیا نەکەین، تا وەك ئێمە بەشی خۆیان لەو مەنزڵگایە وەرگرن؟

## 39

١- سەروەر بیت لە دۆزەخ..... ئەوە پێچەوانەی قسەی ئەخیلە لە ئۆدیسە، کە دەڵێ - خزمەت کاری لە ماڵێکی هەژار، باشترە لە پاشای پاشایان، لە ناو مردووان.

با دووباره خۆمان کۆکەینەوە و دووبارە تێبکۆشین
تا ئەوەندەی کە لە بەهەشتدا ماومانە بەدەستی بهێنینەوە
یاخود خۆمان بە دوور بگرین، تا زیاتر ون نەبین لە دۆزەخدا

## 40

دوای ئەوەی کە ئیبلیس لە قسەکانی خۆی بۆوە
بوعلزبول وەڵامی دایەوەو گوتی : -
ئەی سەرداری لەشکری درەوشاوەی ئێمە
کە جگە لە خودان هێزوبڕست، هیچ کەسێ بەسەریا زاڵ نەبووە
ئەگەر گوێیان لە هاواری تۆ ببێت
هیواکان  زیندوو دەبنەوەو لە مەترسیان دەپارێزێ

## 41

واتە ئەگەر گوێیان لەو دەنگە بێت کە چەندین جار
لە سەختترین ساتی فەتح و شکست
 لە گەرمە گەرمی  شەڕدا دەتخرۆشاند
ئەوە خۆری ئازایەتییان لە سینەدا هەڵدێ
ئیدی لەو خەوە گران و زەلیل و دەستەپاچەیەی
سەر دەریاچەی ئاگردا رادەبن و بێدار دەبنەوە

## 42

وەکو ئێمە کە چەند ساتێ بەر لە ئێستا، سەرسام بوو بووین
بەڵام جێگەی سەرسامی نییە

دوای ئەوەی کە لەو بەرزاییە ترسناکەوە کەوتنە خوارەوە
هێشتا لە قسەکانی خۆی نەبووبۆوە
کە شەیتانی سەرومڕ هەڵسایەوە و بەرەو کەنار چوو
بە خۆی و بە زرێ قورسەکەی[١]
کە ئاگری ئاسمانەکان، خڕو قەبەیان داڕشتبوو

## 43

وەك مانگ بەسەر شانەوەی کردبوو، تۆسکانی[٢] هونەرمەند
شەوێ لە شەوان بەسەر ترۆپکی چیای فیزۆلدا [٣]
لە رێگەی دووربینێکی شووشەییەوە، بینی بوو

## 44

یاخود تا لە بالدارنو[٤] تا سەرزمینی تازەو ڕووبار و چیاکان
بەسەر ڕووپەڕی خاڵخاڵییەوەی ببینێ
بەڵام ڕمەکەشی کە درێژترین دار کاژی دامێنەکانی نەرویژ
کە بۆ دارکەشتی کەشتی لە بن و بۆتکەوە هەڵیاندەکەند
لەبەرابەرئەو ڕمەی دا، لە پنچکێك زیاتر هیچی ترنەبوو
بەڵکو وەك دارێکی چوکەڵە بەدیار دەکەوت
ئەگەر لەگەڵ ڕمەکەیا پێوانە کرابا

١- زرێ قورسەکە، تەقلیدێکی ئەدەبی کۆنە، کە دەیانگووت: زرێی پاڵەوانەکان لە ئاسمان دروست دەکرێ.
٢- تۆسکانی، واتە گالیلۆ.
٣- فیزول،شارێکی نزیک فەرەنسایە.
٤- بالدارنو، دۆڵی ئارنۆ لە فلۆرەنسا.

## 45

تەكیەی بە سەر ئەو ڕمەدا دەدا
تا لە كاتی ڕۆیشتن و لە كاتی هەنگاوە لەرزۆكەكانیدا
بەسەر خاكوخۆڵی گرگرتووەوە ڕایگرێ
وای چەند دووركەوتۆتەوە لە هەنگاوە بەهێزەكانی جارانی
بەناو دەشتاییەكانی ئاسمانی لازوردییەوە
هەوای گەرم ڕوخساری دەبرژاند، ئاگربار كرابوو
بەڵام هەمدیس بەرگەی ئەو عەزابەی گرت
تا ئەو كاتەی كە گەیشتە بەندەری دەریای ئاگرینەوە

## 46

ئینجا وەستاو بانگی لایەنگرانی خۆی كرد
ئەوان فریشتەی كەشەنگ و بەئازار وخەمبار بوون
جەستەكانیان بەسەر یەكا كەڵەكە بوو بوون، وەكو گەڵای پاییزی
ژاكاوی سەر ڕووی جۆگەلە ئاوەكانی كانی فالومبروزا [1]
كە لەسەروەشیا سێبەری ئەتروریا بوو، وەك دارستانە چڕەكان
یا وەك گەزە پەرش و بڵاوەكانی سەر ئاوەكان
كاتێ ئاسمان ئەستێرەی گەشایەوە

## 47

بای صەرصەری ڕاماڵكاری خۆی هەنارد
بۆ تێكچڕژاندنی كەنارەكانی دەریای ڕەش، شەپۆلەكانی داپۆشی
وای بوزبریس و سەربازەكانی تووشی چ كارساتێ هاتن؟

---

١– فالامبروزا، دۆڵی سێبەر لە فەرەنسا.

لەوکاتەی بە رق و مەکری خۆیانەوە
شوێن پێی دانیشتوانی جوشن[1] کەوتن
بەڵام کۆچەرییەکانی جۆشن، گەیشتنە کەناری دڵنیایی
ئەوسا بینیان چۆن چۆنی، لاشەی دوژمنەکانیان سەر ئاو کەوتووە

## 48

تایەی عارەبانەکانیان وردو خاش و پارچە پارچە بوو بوون
ئا بەمجۆرە چەند قۆمەتێکی قێزەوەن بوون، بەسەر رووی دەریاوە
سەرسام بوو بوون لەوەی کە بەسەریان هاتبوو.

## 49

بەهاوارێکی وەها بەرز کە لە کاڕکاڕەی دۆزەخدا دەنگی دایەوە گوتی:-
ئەی شازادەکان، ئەی دادوەران، ئەی جەنگاوەرەکان
ئەی گوڵەکانی ناو سبەتەی ئاسمان
ئەو ئاسمانەی کە پێش ئەمە هی ئێوە بوو و ئێستا لە دەستتان چووە
ئەگەر حیرەتێکی ئاوەها، رۆحی جاویدانی ئێوە توند ڕاگرێ؟
ئایا دوای شەڕێکی سەخت ئەو شوێنەتان هەڵدەبژارد
بۆ ئەوەی ئازایەتی بێهێزی خۆتان رازی کەن؟
ئایا حەسانەوەیەك لە خەوتندا هەیە؟
وەك خەوتن لە دۆڵەکانی فیردەوس دا؟

١- جۆشن، بەنی سەرابیل.

## 50

ئایا لە نابەجێیەکی وادا سوێندتان خواردووە
کە لە دەرگەی پەرستنی دوژمن سەرکەوتن بێتە کایەوە؟
ئێستا هەموو فریشتەکانی هەردوو چینی، شاروبیم [1]و ساروفیم شایەدی دەدەن
کە لە دەریادا لوول دەخواو،هەموو چەك و بەیداخەکانی پەرش و بڵاو بوونەتەوە

## 51

هەرزوو سوارەکانی هێرشی خێرا، کە ئێستا لای دەرگەی فیردەوس وەستاون
هەلی ئەوە هاتووە ، دادەبەزن و بەسەرماندا زاڵ دەبن
بەر زەوی دەکەوین، لەوانەیە تیری کوشندەی خۆیان بەردەوام بهاوێژن
ئەوسا دەمانهاوێنە ناو بنی ئەو قووڵاییە

## 52

کەواتە راپەڕن و هەڵسنەوە، ئەگینا تا هەتایە لێرەدا لە پێ دەکەون
ئەوان گوێیان لە قسەکانی بوو، شەرم دایگرتن ویەکسەر ڕابوون
وەك چۆن خەڵك هەڵدەستن بە ئەرکی خۆیان، باڵیان گرت
دوای ئەوەی بینی کە غافڵ بووینە لەوەی لێیدەترسن
هەڵسانەوەو دەیانویست بێدار ببنەوە و بیدایش نەبوون

١- شارۆبیم و سارۆفیم، دوو پۆل بوون لە پۆلەکانی فریشتان.

## 53

غافڵ نەبوون لەو شەڕەی کە تووشیان هاتبوو، کە داپۆشیبوون ، یاخود ئەو ئازارە توندەی کە هەستیا پێکردبوو
هەر وەها غافڵ نەبوون لە دەنگی ڕێبەرەکەیان، یەکسەر بە دەنگیەوە چوون

## 54

وەك چۆن لە کاتی تەنگانەدا
مووسا عەسای خۆی بەرزکردەوە لە میسر
کەناری جولاندەوەو هەورێکی رەشی لە کلۆ داهێنا
بایەکی ڕۆژهەڵاتی ڕایدەدان
هەتا وایکرد کە مەملەکەتی فیرعەونی نەفرەت لێکراو
وەك شەوی لێ بێت و هەموو مەملەکەتی نیلی تاریك کرد

## 55

ئا بەمجۆرە ژمارەیەکی یەکجار زۆر
لە فریشتەی فاسق  بەدیار کەوتن
کە لە ژێر گومەزی دۆزەخدا لە شەققەی باڵیاندەدا
لە میانی ئاگری سەرەوەو ژێرەوەیان و لە هەموو لایەك
تا ئەو کاتەی هێمایەك بەدەرکەوت
رمێك لە لای ڕێبەری گەورەیان بەرز بۆوە
کە هێمای بۆ کردن بۆ لایەك،
ئەوانیش بە سووکی دابەزینە
سەر بەردی دۆزەخی کانزایی رەقەوە و دەشتیان پڕکرد

## 56

وای ئاپۆڕەیەك بوو، وەك ئەو ئاپۆڕەی كە لە باكوورەوە تاویان دا
تا راین و دانوب تێپەڕێنن
كە كۆڕانی بەربەر وەك تۆفان تاویان دەدایە باشوور
لە دامێنی چیای تاریقەوە، بڵاو بوونەوە تا خۆڵەپۆكی لیبیا

.

## 57

یەكسەر سەرۆك و رێبەرەكانی لە هەر ئاپۆڕەوكەتیبەیەك
چوونە لای ئەو شوێنەی كە رێبەرە گەورەكەیان لێی وەستابوو
شێوەوسیمای ئاسمانیان بەسەر ڕوخسارەوە بوو،
لە مرۆڤی خانەدان دەچوون
كە بەر لە كەمێك بە سەر كورسی فیردەوسەوە بوون
ئێستاش بە هۆی هەڵگەڕانەویان
ناویان لە تۆماری ئاسمان سڕاوەتەوە
ئیدی ناویان نەدەهات، دوای ئەوەی چەپەڵی خۆیان
ئەوانی لە لەوحی ژیان ڕەشكردەوە
هێشا ناوی تازەیان لە ناو كوڕانی حەوادا لێ نەنرابوو
تا بە ویستی خودا لەزەویدا بڵاو ببنەوە

## 58

مرۆڤ تووشی درۆ و دەڵەسە بكەن و
بەشی هەرە زۆری مرۆڤایەتی فریو بدەن
لە رێگەی وازهێنان لە خالقی خۆیان ودەرچوون لە جیلوەو شانازی ئەو
كەسەی كە خەلقی كردوون وبگۆڕێنە سەر وێنەی ئاژەڵ و بە تاجە

گوڵی سرووتی بریقەداریان خۆیان بیڕازێننەوە
ئیدی شەیتان بپەرستن، نەك خودای خۆیان
ئەو کاتە خەڵکی لە رێگەی بتپەرستییەوە
ئەوانیان بە ناوی بتی جیا جیای زۆرەوە ناسی

## 59

ئەی پەری ئیلهام بەخش و خودای شیعر، ئەوانە ناویان زانراوە، بەڵام پێم بڵێ
کێ بوو یەکەم کەس، کە بە سەر تەختەی ئاگرینەوە
بە هاواری سەرداری خۆی لە خەو ڕابوو؟
کێ بوو دوواهەمین کەس، کە دووەم کەس بوو لە پلەو پایە
کاتێ سوڵتانی[1] گەورەیان هاواری کرد، ئەو چوو بۆ لای ؟
کە بە تەنها بەسەر کەناری وێراندا وەستا

## 60

لە کاتێکا ئەو ئاپۆرە فاسقە، لە دوورەوە سەیریان دەکرد
سەرکردەکان ئەوانە بوون، کە دوایی لە دۆزەخدا هاتنە دەرەوە
بە دوای نێچیری خۆیان، لەسەر زەویدا لە هات و چۆ دابوون
دوای درەنگ وەختانێ زاتیان کرد و کورسی خۆیان لە دوای کورسی ئاسمان دانا
پەرستگای خۆیان لە نزیك پەرستگای ئەودانا
بوون بە چەند خودایەك کە خەڵکی ئەو دەوروبەرە دەیانپەرستن

---

١- سوڵتاني... جيناس هەيە لە مياني سوڵتان و شەيتان، مەبەست شەيتانە.

## 61

زاتی ئەومیان کرد ، رووبەڕووی یەهووە[١] ببنەوە، کە ئاورنگی خۆی هەبوو لە ناو کەڕووبییەکاندا، لە دەرموەی سەهیۆندا هاواری دەکرد، لە لایەن فریشتەکانی شاروبیمەوە تاجی لەسەر نرابوو

زۆرجاران پەیکەرەکانی خۆیان لە ناو پەرستگای ئەودا دادەنا

سرووت و جەژنە پیرۆزەکانی خۆیان تێکەڵ بە سرووتی ئەو دەکرد و

جەسارەتی ئەویان دەکرد کە بە تاریکی خۆیان

هێرش بکەنە سەر نووری ئەو

## 62

یەکەمینیان مولوك[٢] بوو

ئەو مەلیکە ترسناکەی دەستی بە خوێنی

قوربانیە مرۆییەکان و فرمێسکی دایباوان سوور بوو بوو

ئەگەر هەراو زەنای دەهۆڵ و زەنگەی دەفەکان نەبوانە

ئەوە دەنگی ئەومناڵانەت دەبیست، کە فڕێیان دەدانە ناو ئاگرەوە

لە پێناوی بتە ڕەشەکەی خۆیاندا

## 63

کوڕانی ئامون لە ریبە[٣] ودەشتاییە ئاودێرکراوەکاندا، ئەو بتەیان دەپەرست هەرواش لە ئەرغوب و باسان[٤] هەتا دوورترین سنووری رووباری ئارنون، وەك ئەوەی ئەو هەموو شوێنەی بەس نەبوو، دڵی سولەیمانی حەکیمترینی

---

١- یەهوە واتە خوا.

٢- مولوک بە مانای پاشا دێت.

٣- ریبە پایتەختی ئەمۆنییەکان بوو، کە عومانی پایتەختی ئێستای ئوردونە.

٤- زەوییەکانی رۆژهەلاتی دەریای مردوو – ئەرغوب، باسان، ئارنون، ئارنون زەوییەکانی خۆرهەلاتی دەریای مردوو.

حاكمانيان فريودا
هەتا پەرستگایەكی بۆ لەتەك پەرستگای خوا دروست بكات
تا باغی خۆی لە دۆڵی جوانی هنوم[١] وەرگرێ
كە پاشان ناوی گۆڕاو بوو بە توفە و جەهنا[٢]

## 64

پاشان كەموشی[٣] داوێنپیس و ترسناكی بە دواداهات
لە عرعارەوە[٤] تا نەبو[٥] و دەشتاییەكانی ئەو پەڕی چیای ئەباریم [٦]
لە هەشبون و ئورونایم [٧] كە لەژێر ڕكێفی مەلیك سەیحون دابوو
لەپشت دۆڵی سبمەی[٨] پڕ لە مێو، كە بە دار مێو داپۆشرابوو
لە ئالەوە[٩] تا دەریا، كە پێی دەگوترا فگور[١٠] تا دەریاچەی مردوو
كە كەوتە سەر وەسوەسەی ئیسرائیل لە شەتیم دا[١١]
لە كاتی دەرچوونیان لە خاكی نیلدا

١- هنوم: دۆڵی ئیرمیا واتە دۆڵی كوشتن، مرۆڤەكانیان دەهاوێشتە ئەوێكەوە،
٢- توفە و جەهنا : گوایە وشەی دۆزەخ لەوێوە هاتووە.
٣-كەموشی، پەرستراوی موئابییەكان، كە سلێمان پەرستگای خۆی لێدانا
٤- عەرعەر لە ئوردنی نوێ
٥- نیبۆ : ئەو شوێنەی كە موسا زەوی كەنعانییەكانی لێ بینی گوایە زەوی موژدە بەخشە.
٦- ئەباریم بانێكە لەسەر دەریای مردوو لە ئوردن.
٧- هەشبوون و ئۆرنایم شاری عوموریە و سویحون.
٨- سمبە: هەرێمێكە لە خۆراوای ئوردن ترێی زۆرە
٩- ئالە : شارێكی نزیک سیبمایە
١٠- فگور: دەیای مردوو
١١-شەتیم، سەرایلیەكان كاری خراپیان لەگەوڵ كچانی مەئاب دەكرد لە شەتیم.

## 65

تا سرووتی ئایینی کرێت و ناشیرینی خۆیانی بۆجێ بگەیەنن
ئەو سرووتانەی کارساتێکی زۆری بەسەر داهێنانون
لە گەڵ ئەوەشدا سنووری سرووتی پۆخڵی خۆیان فراوان کرد
تا سەر گردی پیس[١] و نەنگی نزیك جەنگەڵی مولوکی بکوژ
کە شەهوەت و ڕق تێکەڵ بەیەك دەبوون
تا ئەو کاتەی یوشیای[٢] پیاوچاك هەڵیدان بۆ ناو دۆزەخ

## 66

لەگەڵ ئەوانەدا چەند قەومێکیش، بە ناوی جۆراو جۆر هاتن
لە ناوچەیەك لە میانی فوراتی دێرین و ئەو ڕووبارەی
کە لە میانی میسر و خاکی سووریدا هەڵدەڕژا، ناوەکانیان بڵاو بووبۆوە
چونکە رۆحەکان، نەرم و ساد، وێنەی کچ یا کوڕ یا هەردووکیان
لە گەوهەری پاڵاوتەی خۆیاندا وەردەگرت
پەیوەست نەبوون بە رووکاری مرۆیی، نە بە جومگە نە بە هەردووباڵ

## 67

هەروەها پشتی بە بنەمای ئێسقانی لاوازنەدەبەستا
وەکو گۆشتی گران – بەلام لە هەر وێنەیەکی کە هەڵیدەبژارد
درێژکۆڵە یا چڕ، رووناك بێ یا تاریك
دەتوانێ ئامانجی چاکی خۆی بەدەست بهێنێ
ئینجا کاری ئاشقانە یا کاری دوژمنکارانە ئەنجام بدات

١-گردی پیس، لە ڕۆژهەلاتی پەرستگای ئورشەلیمە، لەناودۆڵی کەدروون، یاخود چیای زەیتوون، کە سلێمان پەرستگای بتەکانی لێدانا.

٢-یوشیا، یەشوع رابەری بەنی ئیسرائیل دوای مردنی موسا.

## 68

کوڕانی ئیسرائیل  له پێناوی ئەوانەدا، وازیان له هێزی زیندووی خۆیانن هێنا
پەرستگای بەرزی خۆیان جێهێشت
چەمینەومو کەوتنە ژێرباری خوداوەندی وەحشییەوە
له پێناویا له جەنگدا سەریان بۆ دانەوند،له بەرامبەر ڕمی ناپاکیانادا
لەو ئاپۆڕەیەدا بوو ئەشتەرووت[1]، بەخۆ بە دوو شاخی هیلالییەوە هات
کە فینیقیەکان ناویان نابوو شای ئاسمان

## 69

له بەرامبەر وێنەی درەوشاوەی ئەشتەرووت دا
پاکزادەکانی صەیدا، هەموو شەوێ لەبەر تیشکی مانگەشەودا
سوێندی بیروباوەڕخۆیان دەخۆن و ئەو سروودانە دەچڕن
کە له چیای سەهێۆن دا دەیانچڕی
کە پەرستگاکەی لەسەر شاخی ستەم[2] قیت کرابۆوە

## 70

ئەو مەلیکەی[3] کە شێت و شەیدای ژنەکەی خۆی بوو بوو
هەر ئەو بوو کە ئەو پەرستگایەی،  بەسەر چیای ستەمدا بونیات نابوو
سەرەڕای دڵی فراوانی
بەڵام بتپەرستەکان، فێڵیان لێکرد و سوژدەی بۆ بتە پیسەکان برد

---

١- ئەشتەروت، کەوتە ئەڤینی تەموزەوە
٢- گردی ستەم، واتە چیای زەیتوون، له پێشوودا باسمان کردووە.
٣- ئەو مەلیکەی کە شێت بوو، واتە مەلیک سلێمان.

## 71

دوای ئەمە تەمموز هات، کە هەموو ساڵێ خوێن لە برینی دەچۆڕا
لە لوبنان جادووی لە کچەکانی سووریا دەکرد و
ئەوانیش بۆ چارەنووسی ئەو دەگریان و لەسینەی خۆیان دەدا
بە درێژایی ڕۆژانی هاوین بەستەی ئاشقانەیان بۆ دەچڕی

## 72

ڕووباری ئەدۆنیسیش، بەرەنگێکی خوێناوییەوە، لە تاشە بەردەکانەوە هەڵدەقوولا
تا دەگەیشتەوە دەریا، وەك ئەوەی خوێنی تیا ڕژا بێت
تەمموز[1] هەموو ساڵێك خوێنی لەبەر دەچوو
بەڵام چیرۆکی ئەو خۆشەویستییە
هەمان شەهوەتی پڕژاندە ناو گیانی کچانی سەهیۆنەوەش
نەك هەر ئەمە بەڵکو شەهوەتێکی پیسیش بوو، لە گومەزی پیرۆزدا

## 73

ئەزقیال بینی بووی، لەو کاتەی خەون هیدایەتی دابوو
تا ببینێ کە یەهوزا چۆن شەوانە بت پەرستی دەکات
لەدوای ئەوەوە یەکێ دەهات، زۆر بە گەرمی دەگریا
تابووتی[2] دیل چۆن چۆنی، لە میحرابی خۆیا قالبی ئاژەڵانەی ئەوی

---

١- تەمموز ،کوڕی یەکێ لە پاشاکانی سووریا بوو، کە ئەشتەرووت کەوتە داوی خۆشەویستی ئەوەوە.

٢- تابووتی عەهد.لای یەهودو لای مەسیحییەکان، لای موسڵمانەکان تابووتی کپی و حەسانەوەیە، ئەو تابووتە لەوحەکانی عەهدی تیا پاراستراوە، بە پێی کولتوری یەهوودی، بە هەیکەلەوە لەناو قودسی ئەقداس دانراوە، ئاوزێڕ کراوە. پەیوەستە بە لەوحی موساو پەڕینەوە لە ئاو.

بەسەرو دەستی شکاوییەوە، کردە نەخشی سەر زەوی
ئەوی شەرمەزاری ئەوانە کرد، کە دەیانپەرست.

## 74

ناوی داژون[1] بوو، وەحشێکی مرۆیی بوو، نیوەی لای سەرەوەی مرۆڤ بوو
نیوەی لای بنەوەشی نەهەنگ بوو
لە گەڵ ئەوەش پەرستگایەکی بەرزو بڵندی هەبوو لە ئەشدود
لە کەنارەکانی فەلەستین و ئەسقەلان و ئەکا و تا دوا سنووری غەزە
هەیبەتی خۆی هەبوو، پاشان رەمون[2] هات،
بارەگای ڕازاوەی خۆی لە دیمەشقی سەوزو فراوان و
بەپیت و ئاوی ڕوونی ڕووباری ئەبانە و فرفار[3] دامەزراند

## 75

ئەویش بە هەموو جورئەتێکەوە لەدژی ئاسمان وەستایەوە
دڵی مەجزومی لەدەست دا
دڵی پاش[4]ای سەرخۆش و داگیرکەری بە دەست هێنا
وای لێکرد فشە بە پەرستگای نەبی پەیامبەر بکات
پەرستگایەکی ئایینی سوریایی لە شوێنی ئەو دانێت
بخوردی قوربانییە کرێت ترسناکەکانی خۆی لێ داگیرسێنێ

١- داژون، کە تابووتی عەهدیان دیل کرد، لە پەرستگای داژون دانرا، کە خودای دەریا بوو، بۆ بەیانی بینیان تابووتی عەهد پەیکەرەکەی شکاندبوو، هەردوو دەستی لێکردبۆوەو سەری پەلدابوو.

٢- رەمون خودای ئاوو هەوا

٣- دوو ڕووباری دیمەشقن

٤- مەجزوم ناوی نوعمان بووە، دیارە نەخۆشی جوزامی گرتووەو یەشوع پێی گووتوە، کە خۆی لە ئاوی ڕووباری ئوردن بشوات.

نوێژ بۆ ئەو خوداوەندانە بكات كە بەسەریانا زاڵ بوو بوو
لە دوای ئەمانەوەش كۆمەڵانێك هاتبوون
كە لە دێرزەمانەوە ناووناوبانگیان بڵاو بووبۆوە
ئوزریس[1] ، ئیزیس[2]، ئوریس، وێڕای ئەوانەی بەدوایانا كەوتن،
ئەوانەی كە ڕووخساریان مەسخ بووبوو

## 76

هەروەها ئەو سیحربازانەی كە فیرعەون و
كەهەنووتە توندرەوەكانیان گومڕا كردبوو
چەند خوداوەندێكیان لە ماسكپۆشەكان دەپەرست
كە شێوەی ئاژەڵیان گرتبووە خۆیان، نەك مرۆڤ
بەنی ئیسرائیل لەو تاعوونە دا ڕزگاری نەبوو
هەستان بەو زێڕەی كە قەرزیان كردبوو
گوێلكێكیان لە چیای ئۆریب دروست كرد

## 77

بەڵام پاشای ئاسیێ[3] لەخوا، ئەو گوناهەی زێدەتریش كرد
لە بیت ئەیل و لە دان دا
وێنەی خوای خۆی بە مانگایێ چواند كە دەلەوەڕی
یەهوە كە لە شەوێكدا میسری جێهێشت و تێپەڕاند

٢-ئوزریس، لە سەردەمی فیرعەونەكان بوو، خودای رۆژی هەڵسانەو حیساب بوو لە میسر، سەرۆک دادگا بوو.

3- ئیزیس ، خودای دایكایەتی و سیحرو بەپیت و بەرەكەت، كە ئوزیریس ی زیندوو كردەوە، لەو كاتەی سەریان بڕی.

3-پاشای ئاسیێ لە خوا، ناوی یەربوئام بوو، لە پاشاكانی سەرەتا بوو، لە خەلیفەی سلێمان هەڵگەڕاوە كە ناوی رەحبئام بوو.

به یەك زەربە بەسەر هەموو نۆبەرەی مرۆڤ و ئاژەڵەكان
هەموو ئەو ئەربابانە دا زاڵ بوو، وەك ئاژەڵ دەیانبۆڕاند
دواجار بەلیئال[1] هات، بەدخووترین كەسێ كە لە دۆزەخدا هاتبێتە دەرەوە
هەڵبەت بەدخوڵقترین كەس كە حەزی بۆ زاتی خۆی بە شەڕو گێچەڵ بوو
هیچ پەرستگایەكی دانەمەزراند، یا هیچ قوربانیگایەك، بخوردی تیا بسووتێنێ

**78**

لەگەڵ ئەوەشداهەمیشە لە پەرستگا و قوربانیگاكاندابوو
تا كاهینەكان بكاتە خوانەناس، چۆن كوڕانی بەلیئال وایان كرد
كە نوقمی چێژبازی بوون لەناو ماڵی ئاسماندادا
هەروەها لە كۆشك تەلارەكانی پاشایان
دەسەڵاتی خۆی بە سەر ئەو شارە دەوڵەمەندانەدا دەگرت
كە دەنگی پڕ هەراو زەنای ئاهەنگ، بەسەر بورجەكانیەوە بەرز دەبۆوە
وەك چۆن دەنگی خراپەو و خراپەو بەدكاری بەرز دەبۆوە

**79**

كاتێ كە شەو تاریكی خۆی دادەبەزاندە سەر رێگاو بانەكان
كوڕانی بەلیئال دەهاتنە دەرەوەو ورگیان بە شەراب هەڵدەفابوو
دەماری ملیشیان بە قسەی بەدیۆم دەپەڕی بوو
سەیری رێچكۆڵەكان ی سەدوم بكە، لە شەوێكی نووتەكدا، لە جیبهە دا
كاتێ ژنێك خۆی لەبەردەرگای پیاوێكی باش ڕازاندەوە
تا خۆی بەدوور بگرێ لە وەی سواری بن

**80**

1-بەلیئال، خوداوەندی حەقیقی نەبوو، بەلام سیفەتێكی ڕووت بوو، بە مانای خراپەو زوڵم و هیچوو پووچی.

ئەو خوداوەندانە بەهێزترین و ناودارترین خوداوەند بوون
بەڵام ناو هێنانی ئەوانی دی درێژە دەکێشێ
ئەوانە خوداوەندی ئەیۆنین کە لەپشتی یاوانەوە[1] وەپاش کەوتوون
بەخوا حسێب دەکران[2]، هەرچەندە دوایی دانیان بەوە نا کە زەمین و ئاسمان
دایبابی وەحشی ئەوانە، تیتانیی[3] نۆبەرەی ئاسمان، رەچەڵەکێکی زۆری نایەوە
ساتورنوس[4] کە تەمەنی لەو بچووکتر بوو
دەستی بەسەر ئەو مولکە داگرت کە بۆی بەجێمابوو
ئەویش لە لایەن جوف[5] ی زڵحەزۆرتەوە
خۆی کوڕەکەی کە لە ڕیا بوو، هەمان مامەڵەی لەگەڵدا کرا

## 81

ئابەمجۆرە بە زەبری داگیرخوازی فەرمانڕەوایەتی کرد
ئەوانە یەکەمجار لە کریت[6] و دووەمجار لە چیای ئایدا
پاشان لە سەر ئەو بەفرەی
کە چیای ساردی ئۆلیمپی داپۆشی بوو، ناوبانگیان دەرکرد
ئاسمانی ناوەندیان حوکم دەکرد، کە بەرزترین ئاسمانیان بوو

---

1-یاوان، کوڕی یافت ە و یافتیش کوڕی نوحە، ملتوون وای باوەڕە کە ئەیۆنیەکان لەو کوڕەدا وەپاش کەوتوون.

2- یۆنانییەکان وایان باوەڕە، کە ئاسمان و زەوی لەشێوەی دوو وەحشی بووینەو زەماوەندیان کردووەو ئەو خوداوەندانەیان لێ بووە.

3-تیتانی، نۆبەرەی ئاسمان.

4- ساتورنوس، لە ئاسمانی ئورانوس و زەوی کولوس لەدایک بووە، تیتان شەڕی لەگەڵ کردووە.

5-جوف، کوڕی ساتورنوسە، باوکی رزگار کردووە لە شەڕی تیتان، پاشان هەستا بە نەفی کردنی باوکی بۆ دەریای ئەدریاتی، لە ئەسڵدا جوف زەیوس بوو، بە قسەی دایکی پیلانی بۆ باوکی ناوەتەوە.

6- کریت زادگای زەیوس.

هەندێکیان لە سەر تاشەبەردەکانی دلفی[1] دا مانەوە
یاخود لە دودونا[2]تا ئەوپەڕی زەمینی دوریس[3]

## 82

بەڵام ئەوانی تر چوونە سەر ئاوکانی دەریای ئەدریاتی
بەرەو کێڵگەکانی هسبیریا[4]، هەروەها بۆ ناو دەشتاییەکانی ئەلکولت[5]
هەڵفڕین هەتا دورگە دوورەکان[6]، ئەوانە و خەڵکانێکی تر خڕبوونەوە،
روانینیان شەکەت و سەرسام بوو و چاویان شکابوو
بروسکێکی تاری درەوشایەوە

## 83

کە بینیان سەرۆکیان، تووشی نائومێدی نەبووە، ئەوان ون نەبووینە
کە ئەگەر لە گەرمەی ونبوونیش بن
رەنگێکی وەك گومان بەسەر روخسارییەوە بوو
بەڵام هەر زوو کبریای ئاسایی خۆی، بە دەست هێنایەوەو
دەستی کرد بە چە ندقسەیەکی قەبە، کە مانای گەورمیان دەدا
بەڵام بەبێ ناوەرۆك بوون، ئیدی ئازایەتییە ژاکاوەکانیانی بەرز دەکردنەوە
هەروەها ترسیشیانی دەرەواندەوە

---

1- دلفی، پەرستگای ئەبوللو.
2- دودنا، شوێنی پەرستگای زەیوس.
3- دوریس، ولاتی یۆنان هەمووی.
4- هسبیریا، ولاتی خۆرەتاوی خۆراوا یا ئیتالیا
5- ئەلکولت، دەشتاییەکانی فەرەنسا.
6- دورگە دوورەکان، دوورگەکانی بریتانی

## 84

پاشان ئەمری بەوە کرد کە، ئەگەر دەنگی جەنگ لە هەموو کەڕەنایەك
بەرزبۆوە
ئەوە لەسەریانە کە بەیداخی ئەو هەڵگرنو ئەوە شەرەفێکی گەورەیە
عەزازیل[1] پیلەی لەسەرئەوە کرد کە دەبێ ‌دەستی کەوێ
گووتی کە ئەوە هەقی خۆیەتی چونکە ئەو لە شیرۆبییە درێژەکانە
یەکسەر بەیداخی سوڵتان لە کەناڵە بریقەدارەکاندا بەرز کرایەوە

## 85

یەکسەرلە کەناڵە بریقەدارەکانەوە، بەیداخی سوڵتان بڵاوکرایەوەو
لەبەرزاییدا
وەك ئەستێرەیەکی کلکدار بەناو بادا ئەشەکایەوە
بەردە بەنرخەکانی تیدا دەدرەوشایەوە
بریقەی زێڕینی ئەو بەیداخە گەشایەوەو
رەمزی چەك و تاجە گوڵی سەرکەوتنی
فریشتەکانی بەسەردا دەبریقایەوەە

## 86

لە کاتێکا کەڕەنا ترسناکەکان، بە نەغمەی جەنگ دەنگیان دەدایەوە
لەناو ئەو ئاپۆڕەیەدا بانگێ هەڵسا
کە گومەزی دۆزەخی بڕی و تێپەڕاند
پاشای کوێری و شەوی ڕەشی[2] ترساند

1- عەزازیل، وشەیەکی عیبرییە بە مانای فیداکار دێت، یەکێ لەو گەورە فریشتانە بوو، کە لە ئاسمان هەڵگەڕایەوە.

2- بەڕای میلتون کوێری و شەو ، حوکمی مەملەکەتی ئەبەدییان کردووە، ئەو بۆشاییەی کە هیچ

## 87

له ناكاودا هەزار بەيداخ له ناوئەو ڕەشاتييەدا، بەرزی ئاسمان بۆوە
كه بەڕەنگی پرشنگداری خۆيان دەشەكانەوە
له گەڵيشياندا دارستانێكی يەكجار گەورە.
له ڕم و ئەو خوودانەی كەڵەكەی سەريەك بووبوون
پۆلی وەستاوی به ڕێزەی زرێ پۆشانی بێسنوور
بەرز بوونەوەو له فەيلەقێكی توندوتۆڵدا
لەسەر نەغمەی دوريس[1] كه بريتی بوو
له دەنگی نەرمی شمشاڵ و دووزەله، يەكسەر كەوتنه جووڵەوە

## 88

هەر ئەو ئاوازانەش بوو كه پاڵەوانه دێرينەكانيان
بەرزكردەوە بۆ بەرزترين پلەی شەرەف
كه خۆيان به چەكەكانيانەوە تەيارو ئامادە دەكرد، تا بچنه ناو شەڕكەوەو
وای لێكردن كه هەناسەی گران وسەنگينی ئازايەتی هەڵكێشن
نەك هەناسەی تووڕەيی، بچەسپێن و نەچەمێنەوە سەر پاشوويان
يا له ترسی مەرگ ڕابكەن يا بگەڕێنەوە به ناچاری

## 89

هێزی ئەوەيان هەبوو كەشڵەژانی زەينی خۆيان كەم بكەنەوە
خەمباری و ترس و خەم و ئازار

شێوەيەكی نييه لەميانی دۆزەخ و ئاسماندا.

1- دوريس، يەكێكه له مەقامه سەرەكييەكانی موزيكی گريكی، كه ئەفلاتون پێی وايه گونجاوە بۆ مرۆی جەنگاوەرو ئاقڵەكان.

له ئەقلی بەشەری و خودایی دەرکەنە دەرەوەو  ئا بەمجۆرە ئەوانە
هەناسەی  یەکیەتی هێزو بیری چەسپاویان هەڵدەکێش
بە کپی  بەسەر نەغمەی ئەو دووزەلەی
کە هەنگاوی ئەوانی بەسەر خاك و خۆڵی ئاگرینەوە یەکخستبوو
کەوتنە جووڵە و ئەوسا لەبەرچاوان بەدیار کەوتن
پاشان وەك بەرمیەکی نادیار،لە چەکی نادیار و سەرسامکار
بەوێنەی جەنگاوەرە دێرینەکان بەخۆیان و ڕم و زرێی ڕەشیان
لە چاوەڕوانی ئەوەدا وەستان، کە ئاخۆ رێبەریان چ فەرمانێ دەر دەکا

## 90

ئەویش بە خێرایی و بە نیگای تیژی خۆیەوە
بەناو ئاپۆڕە تەیاکراوەکەدا سووڕایەوەو بینی کە لەرووی رووکارەوە
رێکن و بالآیان وەك بالآی خوداوەندەکانە
پاشان هەموویانی ئامارکرد و ژمارد
دڵی بە سەرسامی و گەورەییەوە کرایەوە
شانازی بە هێزی باوانی خۆی کرد، چونکە لەوەتەی مرۆڤ دورست بووە
کۆمبوونی هێزی وای لەبەرامبەر یەك پیاو نەبینیوە
هیچ لەشکرێکی گەورەتری لە دەستەی بچووکی پیادەوە نەبینیوە
کە کەراکی[1] بەسەریانا زاڵ بووبێ،  یاخود تۆرمەی فەلامەرزەکانی
بیرکەوتەوە
کە چوونە  شەڕی فلیگرا[2]

1- کەراکی، هومیرۆس بەراوردی هاواری جەنگاوەرانی تەرواده، بە هاواری کەراکی دەکات، کە بەرەو دەریا هەڵدەفڕێ.

2- فلیگرا، نیمچە دورگەیەکە لە باکوری یۆنان، کەئوفید لە مەسخی بوونەوەرەکان دەڵێت: شەڕی فەلامەرزو خوداوەندەکانی ئولیمپ لە دەشتایی فلیگرا روویدا.

## 91

ڕەچەڵەکی پاڵەوانەکانیشیان لە گەڵدابوو
لەوانەی کە لە تیبە[1] و ئیلیۆم[2] جەنگان .
هەروەها ئەوانەیش کە لە هەموو لایەکەوە
تێکەڵ بە خوداوەندە یارمەتیدەرەکان بوون
یا ئەوەی کە ئەفسانەی رۆمانسی، لە بارەی کوڕەکەی ئوسەر[3]
دەیگێڕێتەوە
کە سوارەکانی بەریتانیا و ئەرمۆریا[4] دەورەیاندا بوو
لەگەڵ هەموو ئەوانەی کە جەنگی باوەر یا جەنگی گاورانیان کردووە

## 92

لەو کاتەوە، لە سبارامونتی[5] یا لە مونتالبان
هەروەها لە دیمەشق و مەغریب و ترابزونو یاخود ئەوانەی لە ئەفریقیاوە هاتن
تا شارلەمان[6] و سوارەکانی ببەزێنن، لە شەڕی فونتارابیا[7]
ئابەمجۆرە هەموو ئەوانەی هەموو وێنەیەکیو سەرەتاییی مرۆیان تێپەڕاند
ئێستا بۆ ڕێزگرتن لە ڕێبەری هەیبەتمەندیان وەستاوەن، بالآیان لە هەمووان
بڵندترە

---

1- تیبە، شاری شانۆگەرییەکانی ئۆدیب و پاشان ئیسخیلۆس و سۆفۆکلیس و یۆربیدس.
2- ئیلیوم،ناوێ لە ناوەکانی تەروادەیە
3- کوڕەکەی نووسەر،، واتە ئارسەری پاشا ی کوڕی بندراجون، کە میلتوون ویستی داستانەکەی خۆی سەبارەت ئەو پاشایە بنووسێتەوە.
4- ئەرمۆریا، واتە بریتانی. ناوی هەرێمێکە.
5- سبارامونتی،چیای باشوری ئیتالیا.
6- شارلەمان، سوپای شارلەمانی فەرەنسی.
7- فۆنتارابیا،چل میل دوورە لە رونسفال.

## 93

وەك بورجێكی بەرز كە هێشتا وێنەی خۆی لە دەست نەدابێ
ڕووناكیەئەسڵییەكەشی نەگۆڕابوو
هەروەها وەك كەمتر لە فریشتە خۆی نەنواندە
هەرچەندە شانازی خۆی لە دەست نەدابوو
وەك خۆرەتاو وابوو، كە سەرلە نوێ هەڵبێت، لە ڕێگەی تەمتوومانی ئاسۆوەوە
بەبێ تیشكەكانی لە پشتی مانگەوە بەدیار دەكەوت
لە گیرانێكی تەواوداو بە رەشبینیەكی كارەساتبارەوە
بەسەر نیوەی نەتەوەكانو ترس و دڵەڕاوكێی لە دڵی پاشاكان دەوروژاند

## 94

سەرەڕای ئەوەی كە تاریكی خۆی، لە فریشتەی گەورە وەرپێچا بوو
بەڵام تیشكەكانی لەهەموو ئەوانەی، كە بە دەوریەوە بوون بەرزتر بوو
بەڵام روخساری پڕ لە برینی قووڵی هەورە تریشقە بووبوو
نیگەرانی جێگەی خۆی بەسەر گۆنا ژاكاوەكانیدا كردبۆوە
لەگەڵ هەموو ئەوانەشدا برووسكی شەهامەتێكی سەركێش
لە ژێر برۆكانیدا، لە چاوەڕوانی تۆڵە كردنەوەدا دەدرەوشایەوە

## 95

نیگاكانی بێرەحم و پڕ لە ڕق و قین بوو
ئایەتی پەشیمانی و شەوقی تیابوو بۆ،
بینینی هاوەڵ تاوانەكانی، یاخود لانی كەم لایەنگرانی
لەوەی كە لە فیردەوس بینیبوویان) (وای جیاوازییان چەند زۆر بوو

ئێستا وا بۆ یان نووسراوە کە بۆ ئەبەدی ئەبەدان بەرگەی ئازار بگرن

## 96

لە چاوانیان ئاسەواری پەشیمانی و خەمگینی بە ئاشکرا دیار بوو
ئەوانە لەبەر گوناهەکانیان بەوە تاوانبار کرابوون
بەر تووڕەیی ئاسمان بکەون، هەر بە خاتری هەڵگەڕانەوەیان
بێبەش بوون لە مەزنی ئەبەدی، لەگەڵ ئەوەشدا هەر بە دڵسۆزیش مابوونەوە
شکۆیان ژاکاوهەڵگەڕابوو، هەروەکو داربەڕووی جەنگەڵ، یا دارکاژی کوێستان
ئاگری ئاسمان پێستی لەشیانی داکەلاندبوو، ئاگری بەسەرا باراندبوون
بەڵام قەدی پتەو و بەهێزیان، بە هەموو گەڵا و بەریانەوە
هێشتاکەش هەروا بەسەر پێوە وستا بوو

## 97

خۆی بۆ قسە ئامادە کرد، پۆل پۆل ڕێك و ڕەوان وستا بوون
لە لایەکەوە بۆ لایێ، بە دەوری ئەودا دەچەمینەوەوە
رابەرانی خۆیان گرتبووە خۆ،بایەخی زۆری ئەوان ئەویان بێدەنگ دەکرد
سێجار ویستی قسە بکات، سێجار سەرەڕای ئەوەی کە هەوڵی دا خۆی بگرێ
بەڵام لەگەڵ ئەوەیش فرمێسکێکی ئاوەهای لە چاوەکانیدا هاتە خوارەوە
مەگەر هەر بەتەنها فریشتەکان بتوانن فرمێسکی وەها هەڵبڕێژن

## 98

وشەو هەڕەشە، تێکەڵ بە یەك بوون و گوتی :
ئەی هەزاران هەزار ڕۆحی جاویدانی

ئەی ئەو سەربازانەی کە جگە لە ئاسمان، کەس بەسەرتانا زاڵ نەبووە
ئەم ڕووبەڕوو بوونەوە شورەیی نییەو هەرچەند ئەنجامەکەی ئازاربەخشە
وەك چۆن هەمان ئەو شوێنە شاهێدی بۆ دەدات
ئەو کودێتا ئیهانەت ئامێزە، یادەوریمان شەق دەکات
بەڵام کام ئەندێشە لە بۆتکەی ئەزموونی رابردوو یا ئێستادا؟
قودرەتی پێشبینی کردنی ئەوەی هەبووو سەبارەت بەوەی کە تازە روویدا؟

## 99

یا توانای گەشبینی ئەوەی هەبوو، تا بتوانێ لە ئەنجامەکەی بترسێ؟
کە ئاوا هەموو هێزە خوداوەندییەکانی، کە پاڵپشتی یەکتریا دەکرد بشکێت
پاشان کێ بەڕاستی دەزانی هەتا دوای دۆڕانیش
ئەو هەموو ئاپۆڕە ئاوارە بکرێ وئاسمان چۆل بکەن؟

## 100

رادەپەڕێ و شوێنی خۆی بەدەست دەهێنێتەوە؟
یا هەموو ئەوانەی لە فیردەوس کۆبوونەتەوە شاهێد بن
ئەگەرمن بیروراکانم لە ڕای ئەوانیترجیاواز بوو
یا ئەگەر من ڕایەکی ترم هەبووبێ، یا مەترسیم لەسەر خۆم لادابێ؟
ئەوە هیواکانمان هەمووی وندەبوون
بەڵام ئەوەی کە حوکم لە مەملەکەتی ئاسمان دەگێڕێ
تاوەکو ئێستاش لەسەر کورسی خۆی دانیشتووە
ناوو ناوبانگی کۆنینەی خۆی پاڵپشتی دەکات
یا بە حوکمی داب و نەریت یا دەسەڵات

کورسی مەلەکی خۆی بە تەواوی وەرگرتووە
بەڵام تا ئێستاس هێزی خۆی دەشارێتەوە

## 101

هەمان ئەو شتانە بوون، کە ئێمەی خستە ئەو هەوڵەوە بووە هۆی شکستمان
ئێستاکە توانایی خۆمان دەزانین و توانای ئەویش دەزانین
تا ئیدی ئاگری جەنگ هەڵنەگیرسێنین و نەترسین
ئەگەر جەنگێکی تر ڕوویدا، باشتر وایە کە بە دزییەوە، بە مەکرو فێڵ، کار بکەین
تا ئەوە بەدەست بهێنین، کە بە هێز نەمانتوانیوە بە دەستی بهێنین
بەڵکو ئەویش لە ئێمەوە فێردەبێ
ئەوەی کە تەنها بە هێز، بە سەر دوژمنی خۆیدا زاڵ دەبێ
ئەوە نیوەی سەرکەوتنی خۆی بە دەست دەهێنێ و بەس

## 102

لەوانەیە لە فەزادا دونیای تازە بێتە کایەوەو قسەیەکی واهەیە لە ئاسماندا
کەئاسمان دەیەوێ بەمزوانە، ئەو دونیا تازەیە خەڵق بکات
سەلالەیەك دەچینێ و وای دادەنێ، کە یەکسانە بە کوڕانی ئاسمان
دەبا بەرەو ئەو دونیایە بچین، هەرچەند بۆ زانینیش بێت و بەس
لەوانەیە ئەمەیان سەرەتای دەست پێکردنمان بێت
جا بۆ ئەوێ بێت یا بۆ شوێنێکی تر

## 103

لێناگەڕێین ئەو خەرەندە دۆزەخییە، ئەو ڕۆحە ئاسمانیانە بکات بەکۆیلەی خۆی

هەروەها ناهێڵین ئەو قووڵاییە، لە لەژێر تاریکاییدا بمانشارێتەوە
بەڵام ئەگەر هەموومان بەیەکەوە نەبین، ئەوە لە ئاشتی نائومێد دەبین
کێ لە ئێمە بیر لەوە دەکاتەوە، کە خۆمان بەدەستەوە بدەین؟
جەنگ، کەواتە جەنگ، جا بە نهێنی بێت یا بە ئاشکرا، هەر دەبێت
بکرێت

## 104

کە لە قسەکانی خۆی بۆوە، ملیۆنەها شمشێری ئاگراوی
بۆ سەرکەوتنی قسەکانی سەرۆك، بەرزبۆوە بۆئاسمان
ئەو شمشێرانەی بەسەر باشووری فریشتە گەورەکانی شیروبیم (١)
لە کاڵان هاتبوونە دەرەوە

## 105

لە ناکاو لەدوورەوە ، دەوروبەری دۆزەخ
لە بەر تیشك وتاوی ئەو شمشێرانە ڕووناك بۆوە
ئەهریمەنییەکان لە بەرامبەر ئاسماندا، لە تووڕەیان کەوتنە خرۆشانەوە
بە قۆنداغی ئەو چەکانەی کە گرتبوویانە دەست
بە زرێپۆشێ دەنگ لەرینەوەی خۆیانەوە، تەپڵی جەنگیان لێدەد
هات وهاواری جەنگیان بەرەو گومەزی ئاسمان دەچوو

## 106

لە دەمی ترسناکی شاخێ، کە ئەوەندە دوو نەبوو
مەشخەڵی ئاگرو دوکەڵی شەپۆلێکی بەخووڕهەڵدەچوو

1- شیروبیم، فریشتە

ئەوەی کە تیایا دەمایەوە، رووپەڕێکی بریقەدار بوو
ئەوەیش هێمایەکی ڕاست و ڕەوان بوو
بۆ ئەوەی بزانین کە ئەم شاخە
کانزای لە ناو ڕەحمی خۆیدا شاردۆتەوەو لە گوگرد پەیدا بووە

## 107

تیمێکی گەورەی ئەهریمەنەکان، خێرا بۆ ئەوێکەوە بە خۆ و بەبێڵ و کوتکەوە
وەك ئەوەی چەکداری پێشەنگ بن، رایانکرد
پێش لەشکری پاشا کەوتبوون، تا سەنگەر لێدەن و مەتەرێز دروست بکەن
مامون[1] یش رێبەرایەتی دەکردن
کە لە هەموو ڕۆحە دەرکراوەکانی ئاسمان، بێ تواناتر بوو
هەتا لە فیردەوسیشدا بیروڕاکانی، هەربەرەو ژێرەوە دەچوو
زۆری شادی بەو سامانەی سەر شۆستەکانی ئاسمان و
ئەو زێڕەی کە دەکەوتنە ژێر پێیەوە دەهات

## 108

هیچ شتێکی پیرۆزو زیاتر لەوزێڕە، ئەویان دڵخۆش نەدەکرد
یەکەمین کەس بوو کە مرۆڤی هاندەدا ، ناخی زەوی تاڵان کەن
بە دەستێکی چەپەڵ، هەناوی زەوی پاکی دایکی خۆیان دەردەهێنا
تا ئەو زێڕو زیو و زەبەرەی، کە بە توندوتۆڵی شاردرابۆوە دەربهێنن
زۆر بە خێرایی، تیپەکەیان برینێکی گەورەیان
لە جەستەی ئەو چیایە کردەوە

1- مامون، واتە سامان، لەوانەیە ملتون باسی کەسێتی مامون بکات، لە داستانی سبنسردا، بەناوی شاژنی ئەجندان.

ڕەگەی زێڕیان دەرهێناو کەسیش سەرسام نەبوو

## 109

سەروسامان لە دۆزەخ شین دەبێ
خاك و خۆڵ باشترە بۆ پاراستنی ئەوبکوژە گرانبەهایە
بریا لێرە ئەوکەسانەی کە لافی شتە ناپایەدارەکان لێدەدەن
بە سەرسامییێکی گەورەوەوە
قسە دەربارەی بابل[1] و تەلاری شاکانی مەمفیس[2] دەکەن
ئاگایان لەوە دەبوو کە گەورەترینی تەلارەکانیان
چ لەڕووی ناوداری یا لەڕووی هێزو قودرەتی هونەرییەوە بێ
بە ئاسانی دەتوانرێ لەلایەن رۆحە بکوژەکانەوە
سەر هونەری ئەوان بکەون لە سەعاتێکدا
کە ئەوان بە زەمەنێکی دوورو درێژو ماندووبوونێکی زۆرەوە
ناتوانن ئەمە بکەن
ئەوەیشیان دەستی مرڤگەلێکی زۆر، وەبەری هێناوە کە ناژمێردرێ

## 110

بە تاسووقەوە لەو ژوورانەی
کە بەسەر دەشتاییە پان و فروانەکانەوە ئامادە کرابوون
لەوێدا لە لای ژێرەوە ئاگرێکی سادە، لە دەریاچەکانەوە هەڵدەقولا
ئاپۆڕەیەکی تر بە هونەری مەزنی خۆیانەوە
خەریك و هیلاك بوو بوون، خەریکی تاواندنەوەی پارچە کانزایەکی گەورە بوون
هەموو جۆرێکیان لە یەك جیا دەکردەوە

1- بابل، هێمایە بۆ بورجی بابل کە نەمرود دروستی کرد.
2- مەمفیس واتە ئەهرامە گەورەکانی میسر.

له کاتێکا تیپی سێیەم لەسەر زەویدا
قالبی جۆراوجۆریان دورست دەکردو زێڕیان تێدەکرد
خاپەرۆکەکەشیان وەك کەف، بەسەر رووی زێڕاوەکەوە کۆدەکردەوە

## 111

بە شێوەیەکی سەیر دەیانگواستەوە
کە هەموو سوچێکی بۆشیان پڕکردەوە
وەك چۆن پفە بایێ بەسەر ئورگۆنەوە هەڵبکا
دەگوازرایەوە بۆ ناو پۆلەکانی دووزەلەی جۆراوجۆرو
نەغمەی چەند نەفەسێکی جۆراوجۆری لێ بەرز دەبۆوە
هەر زوو تەلارێکی زەبەلاح، بەسەر زەویدابەرز بۆوە
دەنگ و ئاوازێکی رێك و گونجاو وسروودێکی خۆشی لەگەڵدابوو

## 112

تەلارەکە وك پەرستگا وابوو، دەوروبەرەکەشی
ستوونی چوارگۆشە یا ستوونی خڕ بوو، سەری ستوونەکانیشی
بە گەچی زێڕین ڕازابۆوە، وێنەی چەند پەیکەرێکی تیا نەخشێنرابوو
ستوونی ژێر میچەکە بە زێڕ نەخشێنرابوو، کە نە بابل و نە قاهیرەی مەزن
هەمان ئەو شکۆداییەیان بە خۆیانەوە نەبینیوە
لەو کاتەی بۆ رێز لێنانی خوای بوعل[1] و سیرایس[2] تەلاریان ئامادە دەکرد
پایەی ئەو تەلارە نەدەگەیشتە پایەی تەلاری ئەوانەوە
لەو کاتەی کە میسرو بابل، لە رووی زێدە خەرجییەوە
رکابەری یەکتریان دەکرد

1- بوعل، خواوەندی ئاشوری نەک میسری.
2- سیرایس، خواوەندی میسری کەناوی ئەبیس ە.

## 113

یەکسەر دەرگا مسینەکە کەوتە سەر پشت، فراوانی ناوەوەی بە دیار کەوت

بۆشاییەکی فراوان، بەسەر زەوییە لووس و راستەکەوە ڕاکشابوو

چەند چرایەك مینا ئەستێرەو مەشخەڵ داگیرسابوون

وەك ئەوەی بە جادوی جادوکارێکی مەکریازەوە، هەڵواسرابن

بە نەوت و قیر دادەیسان

رووناکیەکیان بڵاوە پێکردبوو، وەکو نووری ئاسمان وابوو

## 114

ئەو ئاپۆڕەیە بە پەلە چوونە ژوورەوەو سەرسامی دایگرتن

یەکیان ستایشی تەلارو یەکیان ستایشی کارامەیی وەستاکەی دەکرد

کە لە فیردەوسدا پەیکەری خودان بورجیگەلێکی

بەرزی زۆری دورست کردبوو، فریشتە تاجدارەکان تیایانا دادەنیشتن

لە هەر یەکێ لەو بورجانە ئەمیرێ حوکمی دەکرد

کە پاشای باڵا دایمەزراندبوون وئەوانی گەیاندبووە ئەو پلەوە پایەوە

هەموویانی کردبووە دادوەروئەو شوێنەیان کردبووە بارەگای خۆیان

## 115

موڵکیر[1] ناوێکی ئاشکرا و ناسراو و رێز لێگیراو بوو

لە لایەن یۆنانییە دێرینەکانەوە، یا لەسەر زەمینی ئوسرانیا

---

1- مولکیر، لەقەبی فولکلنوسی خوداوەندە، سەرپەرشتیاری ئاسنگەری و کانزاکان، وشەکە بە مانای ئەو کەسەی ئاسن دەتاوێنێتەوە.

مرۆڤ ئەو ناوەیان لێنابوو
بەڵام سەبارەت بە دەرچوونیان لە دۆزەخەوە ، ئەفسانەکانیان دەڵێن
جوف[1] لێی تووڕە بوو بوو و رووت و قووت، تووڕی هەڵداوەتە
سەر دیوارە بەللوریەکانەوە، ئیدی لە سپێدەوە تا نیوەڕۆ
بە درێژایی ڕۆژانی هاوین، هەر لە کەوتن دابووە
پاشان لە کاتی خۆراوابوون، وەك ئەستێرەیەکی ڕەونەقدار
لە ناو جەرگەی ئاسماندا، بەسەر لیمنوس[2] دا کەوتۆتە خوارەوە
کە دوورگەیەکی دەریای ئیجەیە

## 116

ئەوە ریوایەتی درۆیینەی ئەوانە، چونکە ئەو لەگەڵ ئاپۆرە هەڵگەڕاوەکەدا
بەر لە زەمانێکی دوور کەوتبووە خوارەوە
شەفاعەتیان بۆ نەکردو بە هەموو فێڵێکەوە توانی ڕابکات
خۆی و کرێکارە زیرەکەکانی
دەستیان کرد بەبەرزکردنەوەی تەلارەکان لە دۆزەخدا

## 117

لەوکاتەدا جاڕچیە باڵدارەکان
بە فەرمانی سوڵتانی گەورەیان، لە کۆنگرەدا بوون
مەراسیمە ترسناکەکانیان بە جێ دەگەیاند
دەنگی کەڕەنایان دەنارده گوێچکەی ئەو ئاپۆڕەیە
ئەوانیش یەکسەر ئەنجوومەنێکی، بە هەیبەتیان لە باندیمونیام[3] ڕادەگەیاند

1- جوف،جوبیتێری حوداوەند.
2- لیمینوس، دورگەیەکە لە یۆنان.
3- باندیمونیام، شوێنی بەیەک گەیشتنی ئەهریمەنەکان.

که پایتەختی گەورەی ئەهریمه ن  و سەرانی دەرباری ئەو بوو

**118**

بەم بانگەوازە، لەهەر دستەو لەهەر تیپێ، ئەو کەسانەیان بانگ کرد
کە شایستە تر بوون لە ئەوانی تر و پلەو پایەیان هەبوو
ئەوەندەی نەخایاند گروپ گروپ، سەد سەد و هەزار هەزار
لەگەڵ لایەنگرانی خۆیان ڕوویان کردە ئەو بارەگایەوە
هەموو دەروازە و مەیدانە پان و پۆڕەکان پڕ بوونەوە

**119**

بەڵام پێش هەر شوێنێکی دیکە لە تەلاری گەورەدا
کە لە گەورەییاندا وەك ئەو مەیدانە سەر داپۆشراوە بوو
لەوێدا سوارە چاپووك و دلێرەکان لە بەرامبەر
شوێنی دانیشتنی سوڵتان، بۆ هەموو لایەکدا تاویان دەدا
سوارانی بتپەرستیان بانگهێشت دەکرد
بۆ زۆرانبازیێکی کوشندە ، یا بۆ ڕمبازی

**120**

ئاپۆڕەکە کۆببوونەوە، ئەو کۆمەڵە چڕو تێکچڕژاوە
کە هەم زەوی هەم فەزایان، بە ورشە ورشی باڵەکانیان مشت کردبوو
وەك هەنگ  وابوون لە وەرزی بەهاردا
کاتێ کە مەشخەڵە ئاگری بورجی مانگا بەرز دەبۆوە
هەنگە نەوجەوانە بێژمارەکان، هەڵدەڕژانە ناو پووڕەی هەنگوینەوە
ڕەوە ڕەوە، لە میانی ژاڵە و خونچەکانەوە هەڵدەفڕین

## 121

یاخود بەسەر تەختەی نەرم و بۆندارەوە
وەك ئەوەی گەڕەکێ بێ، لە گەڕەکەکانی قەلا لە کا
دروستکراوەکەیان
کە بە چێنێ لە هەنگوینی بۆندار داپۆشرابوو
دەسووڕانەوەو لەبارەی کاروباری دەوڵەتەکەیانەوە، گفت و گۆیان دەکرد
وای ئەم ئاپۆڕەیە چەند چەند قەرەباڵغ بوو، بەو بوونەوەرانەی هەوا
چەند شان بە شانی یەکەوە بوون و ئاپۆڕەکەیان چەند تەنگ بوو
هەتا ئەو کاتەی هێمایەك هات

## 122

شتگەلێکی سەیرو سەمەرە ڕوویاندا، ئەوانەی بە گەورەیی خۆیان دەنازین
ئەو فەلامەرزانەی کە کوڕی زەوی بوون
لە ناکاو بوونە بوونەوەرێکی بچووکتر، لە کورتەبالا هەرە
بچووکەکانەوە
بەیەکەوە خۆیان لە شوێنێکی بچووك پەستا بوو
کە قەت لە ژمارە نەدەهاتن
وەك ئەو کچە بچووکانەی ئەجندان، کە لە پشت چیای هیندەوە دەژیان
ئەوانەی کە لە کەنار جەنگەڵێ، یا لە نزیك کانانیاوێکدا
لە بەزمی نیوەشەوانی پەریەکان گرد دەبوونەوە

## 123

ئەو گوندینییەی کە درەنگ وەختان، دەگەڕایەوەماڵەوە دەیانبینێ
یاخەونی بەوە دەبینێ کە بیانبینێ

لەو کاتەی کە مانگ لە باڵای سەرییەوە، وەك داوەرێ لە ئاسماندا
لە ئەنجوومەنی حوکمدا دادەنیشێ، تا بیانبینێ، پاشان
بەپەلە بە هەنگاوی زمرد[1] هەڵگەڕاوی، لەزەوی نزیك دەکەوێتەوە
ئەوانیش بە نەغمەی خۆش، بەردەوام دەبن لە یاری و سەما
گوێچکەی گوندنییەکە دەخەنە سیحرەوە
لە خۆشیان و لە ترسان دڵی دەکەوێتە خورپەوە

## 124

ئابەمجۆرە ئەو ڕۆحانەی بێجەستانە، توانیان پەیکەری زەبەلاحی خۆیان
بچووك بکەنەوە بۆ چەند بوونەوەرێکی ورد ورد
سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیان لە بن نەدەهات
ئازادانە تاویان دایە ناوەندی ڕاڕەوەی تەلارە دۆزەخیەکەوە

## 125

بەڵام ئاپۆڕەیەکی تر لە فریشتە پیرەکانی ساروفیم[2] و شاروبیم
بەهەمان قەبارەوە، لە گۆشەیەکی دووری ئەو تەلارەوە
کۆبوونەوەیەکی داخراو ودانیشتنێکی نهێنییان گرێدا[3]

---

1- تەواژەیەکی شکسبیرن، لە شانۆ گەری خەونی شەوانی هاوین، بەشی دووەم لە دیمەنی 28 کە مانگ لە ئەنجوومەنی فەرمانڕەوایەتی دادەنیشی، لە میانی جنۆکاندا، چونکە مانگ شای جنۆکان بوو.

2- سارۆفیم و شارۆبیم ، لێرەوە تا دوا بەش، ئەم دوو ناوە دووبارە دەبنەوە، کە دوو جۆر لە فریشتەکانی ئاسمانن.

3- لەزۆر جێگەی ئەم بەشەدا ئەهریمەن خۆی وەک پاڵەوانێکی ترژیدی پیشان دەدات، بەڵام لە ڕاستیدا شەیتان وەک پاڵەوانێکی مەلحەمی شەڕەکە هەڵدەسووڕێنێ، بە بێ هیچ هەستێک کە دژایەتی تێدا بێت، ئەو فریشتانەی کە لە گەڵ ئەهریمەندا هاتبوون ژمارەیان لە سێیەکی فریشتەکانی ئاسمان زیاتر نەبوو، کاتێ کە ئەو کارە ناڕەوایەی کرد دەرهەق بە ئاسمان.دەیگووت کە ئەو بیروڕای ئەوانی تری جێبەجێ کردووە، ئابەمجۆرە لۆمە

هەزاران کەس لە نیوە خوداوەندەکان[١]، بە سەر کورسی زێڕەوە دانیشتن دوای بێدەنگییەکی کورت و دوای خوێندنەوەی دەستوری[٢] دانیشتنەکە گەنگەشە گەورەکەیان دەستی پێکرد[٣].

داوێتە سەر ملی هەموویان.

1- لەزۆر شوێن کە باس لە ئەهرامات دەکرێت، دەڵێن نموونەی غرووری خۆبەزلزانینی پاشاکان بووە، ملتون لێرەدا باس لە مانای ئەهرامەکان ناکات، بەڵکو باس لە ماندووبوونی مرۆڤەکان دەکات لە کاتی دروست کردنییان کە بیست ساڵی خایاندووە. لێرەدا ئاسان نییە باس لە ماندووبوونی فریشتەکان بکەین، لە ڕووی بیناکردندا، بەڵام دیارە یەکەمجار کانزا گرانبەهاکانیان تاواندۆتەوە لە ڕێگەی دەریاچە ئاگرینەکانەوە، پاشان لەناو خەرەندەکانیان کردووە، تا ببێتە بناغەی بیناکان، هەربۆیەش وەک کاری سیحر دێتە بەرچاو.

2- لەم بەشەدا ملتون هەوڵ دەدات مۆزیک و دروستکردنی کانزا بەیەکەوە شەتەک بدات، دەڵێت مرۆڤ کارامەیی فریشتە ئاسێکانی ئاشکرا کردووە، بەڵام پەیوەست دانی موزیک بە پیشەسازی دەگەڕێتەوە بۆ یوبا و (توبال و قایین) کە دوو زڕبرابوون، کە یەکیان هەموو ئامێرەکانی پیک و دووزەلەی دەزانی و شارەزبوو، دووەمیشیان ئامێرەکانی مس و ئاسن، تەکوین 21-4

3- ناوی مولکیر هاتووە، کە جادوبازی قەڵای خۆرەتاو بووە، ئوفید لە کتێبی مەسخی کائینات دا باسی کردووە، بەڵام سەبارەت بەوەی کە دەربارەی بابلەوەیە ، کتێبی پیرۆ باسی بابل دەکات، وەک سیمبۆلی زوڵم و خراپەکاری دۆزەخ بەڵام قاهیرە وەک شارێکی مەزن.

## 1

ئەهریمەن لەبەرزاییەکی زۆرەوە، بە سەر عەرشی مەلەکییەوە
کە ئەو عەرشە، هێجگار درەوشاوەتر بوو
لەسەروسامانی دورگەی هورمزو[1] هیند ،
ئەو سەرزەمینانەی کە لەو ڕۆژهەڵاتە پڕ شکۆیەدا
بە دەستی پڕ بەرەکەتەوە، بارانی مرواری و زێڕ
بەسەر سەری پاشا وەحشییەکاندا دەباری

## 2

قەدەرهەرماسی[2] بەرز کردبۆوە
بۆ بالاترین پایەی خراپەو خراپەکاری
بێئومێدیشی وای بەرزکردبۆوە، هەتا تێپەڕی هیواکانیشی کردبوو
مرخی خۆی لە شتی لەوە بەرزتریش خۆش کردبوو
تێنووی ئەوە بوو بکەوێتە، شەڕێکی بێهوودە لەگەڵ ئاسماندا

## 3

ئیدی خەیاڵ و مەرامەکانی خۆی ئاشکرا دەکردو دەیگووت:
ئەی خاوەنی دەسەڵات[3] و سەرکردایەتی، ئەی ئەربابی ئاسمان
لەبەر ئەوەی لە دۆزەخی قووڵدا
دەریایەکی وا فراوان نییە بۆ هێزی جاویدانی ئێوە
دوای ئەوەی کە چەوساینەوەو کەوتینە خوارەوە

---

1- هورمز، دورگەیەکی کەنداوی فارسییە.

2- هەرماس واتە شەیتان یا ئەهریمەن یا ئیبلیس. و.

3-خاوەن دەسەلات، ئەو جۆرە لەقەبانە لە پەیامی بولس کولوسی دا هەیە 16-1.

## 4

من خەیاڵی ئەوە ناکەم، فیردەوسمان لەدەست چووبێ
هەربزانە لەو دابەزینەدا، چاکەی ئاسمانی
بە شکۆیەکی زۆرترو بەهێزتر لەوانە کە دانەبەزیون، بەدیار کەوت
متمانەتان بەخۆتان هەبێت
کە ئێوە، ئیدی دووبارە لە قەدەرێکی تر ناترسن

## 5

من شوێنی ڕاستەقینەی خۆم گرتووە
یاساکانی ئاسمان منی کردۆتە ڕێبەری ئێوە
پاشان ئیرادەی ئازاد هات
وەك چۆن لە ئەنجوومەن یا لە مەیدانی شەڕدا
ئەو ڕاستیە بەدیارکەوت و ئەو ئیمتیازە بۆ من چەسپا
کە من خۆم، چاوم لەوە نەبوو

## 6

ئێستاش ئەو کارەساتە هاتە پێشەوە
وێڕای ئەو هەمووەش، ڕۆژە تاڵەکانی ئێمە، تاوەکو ئێرە پڕبۆتەوە
بۆیە ئێمە دەبێ خۆمان لەم دۆخە، رزگار بکەین چاك بینەوە
ئەوەش وایکردووە عەرشەکەم زیاتر بچەسپێ
بە ئەرخەیانی و بێ ڕکابەر، ئێوەش بوون کە ئەوەتان بە منتان بەخشی

## 7

لەوانەیە بەختەوەری فیردەوس، کە دوای کەرامەت دێ، لە پلەو پایە
حەسوودی لە دەروونی بنکردایەتیدا بوروژێنێ
بەڵام ئەمڕۆکە کێ حەسوودی بە سەرکردایەتی کردنی ئێوە دەبات؟
کە کەوتۆتە بەر تیری، خاوەن برووسك و هەورەتریشقەوە[1]؟
لەگەڵ ئەوەشدا، ڕووبەڕووی دەبێتەوەوە
وەك ئەوەی کە ئەو سەرکردایەتییە، زرێی پاراستنی ئێوە بێت
نەك هەر ئەوە، بەڵکو بە زۆرترین بەشی عەزابی هەمیشەیی
بەسەریا زاڵ دەبێت

## 8

جا ئەگەر هیچ چاکەیەك نەبێ، کە ئێمە خەباتی بۆ بکەین
ئەوە هیچ خەباتێکیش لە ترازان و پەرش و بڵاویدا نایەتە کایەوە
بە دڵنیاییەوە کەس لە دۆزەخدا ئارەزووی پێشەوە ناکات
بەشی کەسیش لەو ئازارەی ئێستادا، بچووك و کەمتر نابێتەوە
مەگەر ئەقڵی تەماحکاری وای لێبکات ، زیاتر حەزی لە ئازار بێت

## 9

ئابەم سیفەتەوە یەکدەگرین، باوەڕمان بەهێز دەکەین و
زیاتر لەوەی کە لە ئاسماندا هەبوو، ڕێککەوتنمان دەپارێزین
ئێستاکە ئێمە دەگەڕێینەوە، تا داوای میراتی دێرینەو ڕەوای خۆمان بکەین
ناخۆشی و وەڕەسی متمانەی زیاتری
لە پێناوی بەختەوەری گەورەترەوە، پێبەخشیوین
لەو متمانەیەیئەگەر لەکاتی بەختەوەریدا هەمانبوو

1-هەورەتریشقە، هێمایە بۆ زەیوس و بەو لەقەبە ناودرابوو.

## 10

دەبا بە دوای باشترین ڕێگەدا بگەڕێین بۆ هێنانە دی
جەنگ  جا بە ئاشکرا بێت یا بە فێڵی شاراواوە بێت
با دەست بە گفت و گۆ بکەین و ئەوەیش کە بیروڕایەکی هەیە با بیڵێت
ئینجا لەقسەکردن وەستاو پاشان مولوکی خاوەن سۆلجان هات وەستا
ئەو ڕۆحێکی بەهێزو دڕ بوو، لە ئاسماندا شەڕی کردووە
نائومێدیش لە ئێستاکەدا، دڕندەتری کردووە

## 11

وای باوەڕ بوو کە ئەبەدییەت یەکسانە بەو، مادامەکێ یەکسانە بە هێز
پێی باشتر بوو لەوەی کە عەدەم بێت، لەوەی هێزی لەوکەمتر بێت
بە نەمانی ئەو متمانەیە، ترسێکی لا نامێنێ
ئیدی هیچ حسێبێکی بۆ ئاسمان یا دۆزەخ نەدەکرد
هەروەها حسێبی بۆ لەوەش تاڵ و ناخۆشتر نەدەکرد

## 12

گوێی بە هیچ نەدەدا، ئابەمجۆرە دەستی بە قسان کردو گووتی:
بیروڕای من لە گەڵ جەنگی ئاشکرادایە
بەڵام من فڕوفێڵ نازانم و شانازیشی پێوە ناکەم
ئەو کەسەی پێویستی پێیەتی
یا کاتێ پێویستی پێ دەبێت،  با بۆخۆی بیکات ،بەڵام ئێستا نا

## 13

له کاتێکا ئەوان نەخشە دادەنێن، ئایا ئەوانی تر دادەنیشن[1]؟
که ملیۆنەها کەس، تا لووتیان پڕچەکەو وەستاون
بە شەوقەوە چاوەڕوانی هێمای سەرهەڵگەڕان دەکەن
لێرە دانیشتون وەك ئەوە ئەوەی کە لە ئاسمان دەرکرا بن!
لە جیاتی واری خۆیان، رازین بە بێشەلانی تاریك و قێزەوەنی
سەرشۆڕی، یا بەو زیندانەی کە ئەو هێزمەندە
بەسەرئێمەی سەپاندووە، بە هۆی دواکەوتنمان؟

## 14

نەخێر. دەبێ پێکەوە خۆمان بە زمانی تووڕەیی وئاگرینی دۆزەخەوە تەیار
بکەین
لە دژی بورجە بەرزەکانی ئاسمان. وایان لێبکەین بەرگری نەکەن
ئیدی ئازارەکانمان بکەین بەچەکێکی ترسناك
لە دژی ئەوەی ئازارمان دەدات

## 15

لەبەرامبە هەراو زەنای داشقەی برووسك وهەورە تریشقەی فیردەوسی
دەبێ بە تووڕە بوونێکی یەکسان بەوە، گوێی لە ئاگری ڕەش و ترسناکی
ئێمەوە بێت
کە ڕووبەڕووی عەرش و فریشتەی ئەو دەبنەوە
ئیدی گۆکردی تەرتاری[2] و ئاگری سەرسوڕهێنەر تێکەڵ بە یەك دەبن
ئەو ئاگرەی کە بۆ ئازار دایهێناوە

1- لێرە دانیشتووین، میلتوون وا دەری دەخات، کە قسەکانی قسەکەر دژ بەیەکن، لە میانی دانیشتن و هەستانەوەیدا.

2- تەرتاری، هێمایە بۆ ترتارۆس، کە قووڵترین خەرەندی دونیای ژێرەوەیە، بەپێی میتۆلۆژیای یۆنانی.

## 16

بەڵام لەوانەیە ئەم ڕێگایە ئەستەم و ترسناك بێت، بۆ ئەوانەی بە سەریا دادەڕۆن
دەبێ هەڵفڕین بەرەو دوژمنێ، کە شوێنەکەی لە ئێمە بەرزترە
لەوانەیە بتوانین، ئەگەر ئەو شەرابە هۆشبەرەی
کە لە دەریاچەی لەبیرچوونەوە[1] خواردمانەوە
هەستەکانمان لە پەل و پۆ نەخات

## 17

لەوانەیە بتوانین بگەڕێینەوە، سەرسروشتی جارانی، بزاوتی سەرهەڵگەڕاومان
دەگەینەوە نیشتیمانی جارانمان
دابەزین و شکست و بەزین، دژی سروشتی ئێمەیە

## 18

ئەوە کێیە هەستی بەوە نەکردووە، کە پێش کەمێك دوژمنی وەحشیمان
هێرشی کردە سەر دواوەی لەشکری شکاومان و ئێمەی سەفیل کرد
ئێمەیش لە قووڵایی زەریاوە ڕاومان نان
چۆن بە هەڵاتن وڕاکردنی تاڵ و ناخۆشی خۆمان
ناچار بووین دابەزینە ئەو کارِ کاڕمیە
کەواتە سەرهەڵگەرانمان ئاسانترە[2] بەڵام لە ئاقیبەتی دەترسین

## 19

---

1- دەریاچەی لەبیرچوون، ڕووباری لیتی لە میتولۆژیای یۆنانی، کە دانتی لە مەتهەر بەکاری هێناوە، هەرکەسێ لەو ئاوە نوقم بێت، ڕزگاری دەبێت لە گوناهەکانی.

2- سەرهەڵگەڕان ئاسانترە، بەپێچەوانەی میتولۆژیای یۆنانی، سەرهەڵگەڕان سەختترە، وەک چۆن ئورفیۆس نەیتوانی ژنەکەی بگەڕێنێتەوە ، فیرژیل و دانتیش گوتیان سەرهەڵگەڕان سەختترە لە دابەزین.

جا ئەگەر گەڕاینەوە بۆ تووڕە کردنی ئاسمان، ئەوەی کە لە ئێمە بەهێزترە
ئەومیش ڕێگایەکی ڕەشە و تووڕەییەکەی ئەو وێرانمان دەکات
بەڵام ئایا لە دۆزەخ زیاتر، ترسێکی ڕەشتر هەیە بۆ وێران کردنمان؟
ئایا ناخۆشتر لەوە هەیە، کە لەم دۆزەخەدا دانیشتووین؟

## 20

لە فیردەوسی خۆشییەکان دەرکراوین و لەو قووڵاییە ترسناکە
حوکمی ئازاری هەتا هەتاییمان بەسەرا دراوە
بەڵکو بە عەزابی ئاگرێ، کە پشکۆکانی هەرگیز ناکوژێنەوە
بەبێ هیچ هیوایەك بۆ کشانەوەی ئەو ئاگرە و پێیەوە دەسووتێین
بووینەتە خزمەتکاری تووڕەییەکانی ئاسمان
قامچی ئازاریش دەکشێ بەسەرماندا

## 21

کاتێ کارەسات و ئازار بانگمان دەکات بۆ تۆبە کردن
جا ئەگەر وێرانیەك لەوە توندتر بێت، ئەوە کۆتایی مردنە
کەواتە لە چی بترسین، ئەدی بۆچی دوودڵین
لە وروژاندنی ترۆپکی تووڕەیی ئەو؟
ئەو خۆی ئەوەندە تووڕە بووە، بەتەواوی لە ناومان دەبات
گەوهەری کیانی ئێمە بەرەو عەدەم دەبات
ئەوەش زۆر پیرۆزترە لەوەی، کیانی ئێمە لە ناو ئەو عەزابەدا بژیت

## 22

بەڵام ئەگەر کیانی ئێمە، کیانی خوداوەند بێت و قەت نەفەوتێ

ئەوە ئێمە لەم ڕووەوە لە دۆخێكی خراترلە هەموو شتێكداین، بە ئاوارتەی عەدەم
ئێمە بەڵگەمان پێیە، كە هێزەكانمان بەسە بۆ وەڕەس كردنی ئاسمانەكەی
دەتوانین لە ڕێگەی شەبەیخوونی بەردەوامەوە هەڕەشە
لەعەرشی توندو تۆڵی بكەین، عەرشی ترسناكی ئاسمان
ئابەمجۆرە ئەگەر سەرنەكەوتین ، با ببێتە تۆڵە سەندنەوە

## 23

بە تەوێڵی گرژییەوە لە قسەكانی بۆوە
لە شێوەو شەمایلی را بڕیارەكەی دیار بوو، كە بەپەلە تۆڵە بسەنێتەوە
هەروەها اشەڕێكی گەورە بەرپاكات بەسەر خوداوەندە هیچەكان

## 24

لەلایەكی ترەوە بلیئال هەستایەوە سەرپێ و
بە رەسمێكی نەرم و نیان و بزاوتێكی سووكەڵەوە، وەك ئەوەی
هەرگیز ئاسمان ئەفرێنراوێكی جوانتری لەو لە دەست نەدابێ

## 25

كابرایەكی خاوەن كەرامەت و كاری گەورە گەورە
بەڵام بۆش و گەلۆر و درۆزن بوو، زمانی لووسی هەنگویناوی[1] لێ دەچۆڕایەوە

1- هەنگویناوی، ئەمە جۆرە مژادێکە، خوا ناردوویەتی بۆ بەنی سەرائیل لە بیابان تا لە برسان نەمرن.

دەیتوانی سەخیفترین بەڵگە، لە چوارچێوەی باشترینیان ڕابخات
هەروەها پوختەترین ئەنجوومەنی ڕاگۆڕی
بەناو یەکا وەرچەرخێنێ ورێی خۆی بکاتەوە

## 26

چونکە ئەندێشەکانی ئەو، هەمیشە ڕوولە شەڕ بوو
بەڵام بۆ کاری باش، ئەوە خۆی لێ نەبان دەکرد و لێی دەترسا
ئابەمجۆرە گوتارەکەی بەشێوەیەکی ڕازیکەر بەدیار کەوت:
ئەی گەورانی قەوم، منیش لەمڕووەوە، کە رق و قینم کەمتر نییە لەوانی تر .
زۆر هەواخوازی جەنگی ئاشکرام

## 27

بەڵام ئەگەر ئەوەی کە وروژاوە، هۆیەکی سەرەکی بێت بۆ جەنگێکی فەوری
ئەوە زۆرم هان نادات و وابەدیار دەکەوێت کە هێمای فالێکی خراپ بێت
بۆ سەرکەوتنی تەواوی ئێمە، ئەوەی کە هاواری ئەوە دەکات
پەنا ببەینە بەر چەك، جا مەشوەرەتەکەی چی بێت و تیژڕەویەکەی
چی بێت لە بارەی نەبوونی متمانەوە
ئەوە ئازایەتی خۆی بەسەر نائومێدی و پەرش و بڵاوی ڕەها بونیات دەنێ
وەك چۆن ئامانجی ئەوە دەنوێنێ
دوای ئەوەی کە تۆڵە سەندنەوەیەکی تۆقێنەر، بەدی دەهێنێ

## 28

جا یەکەمجار با بپرسین کام تۆڵەسەندنەوە؟
بورجەکانی ئاسمان بە چاودێرە چەکدارەکان سیخناخ کراوە
لە هەموو لایەك  بە دیوار دەورەیانداوە
وەکو خووی خۆیان،  دەگەنە سنووری ئێمەوە و فەیلەقەکەیان لەوێ
دادەمەزرێنن
بە درێژی و پانی ناو مەملەکەتی شەو، دێن و دەچن

## 29

گوێ بەوە نادەن، کە کێ غافڵگیریان دەکات، یاخود بەهێز رێگەی
خۆمان دەکەینەوە
بە تاوێك لە دۆزەخدا رادەبینە سەر پاشوومان
بۆ شێواندنی رووناکی ساف و بێگەردی ئاسمان
ڕاپەڕینێکی ڕەش بەرپا دەکەین

## 30

لەگەڵ ئەوەش دوژمنەکەمان هەر لە سەر عەرش دەمینێتەوە
هیچی لێ نایەت و هیچ گرفتێکی نابێ و
کیانی کاریگەری خۆی تووشی هیچ گەندەڵییەك نایەت
وەڵامی هەموو ئەزیەتێك دەداتەوە
بە پیرۆزی خۆیەوە، لووتی ئاگری کاڕکاڕە لە ئاسمانەوە دەشکێنێ
ئابەمجۆرە هیوا بڕاو دەین و دوا هیوامان دەبێتە نائومێدییەکی دژوار

## 31

واته ئێمه هەوڵ دەدەین سەرکەوتووی گەور والێبکەین
کە تەواوی توورەیی خۆی بەسەر ئێمەدا هەڵرێژێ
ئەویش یەکجاری لە پەل و پۆمان دەخات
تیماری دەردی ئێمەش لەوەدایە
کەخۆمان لە کۆت و پێوەندی بوون، رزگار بکەین
وای لەو لەو تیمارە، تیمارێکی چەند خەمگینە

## 32

کام لە ئێمە بە هەموو دەردو ئازاری خۆیەوە
کە ئەوش گەوهەری ماناوانی و ئەو ئەندێشەیە یە
کە لە ناو ئەبەدییەتدا لە فڕیندایە
لەدەست بدات عەدەم هەڵبژێرێ؟
واتە قووت بدرێتە ناو رەحمی فراوانی[1] شەوەوە
کە هێشتا دورست نەبووە، بێبەش بێت لە هەست و بزاوت؟
جا کێ دەزانێ؟ باوای دانێین کە لەوەدا چاکەیەك هەیە

## 33

ئایا دوژمنی توورە دەتوانێ یا ئارەزووی لێیە، پێمانی ببەخشێ
گومانم لەوەدا هەیە؟
خۆ ئەگەر ئارەزووی ئەوەی هەبێ، کە ببەخشێ ئەوە مەحاڵە

1–رەحمی فراوانی... هێمایە بۆ شەو و تاریکی.

## 34

ئایا ئەو کە حەکیمە، بە یەکجار تەواوی توومیی خۆی هەڵدەڕێژێ؟
ئەوەیان یا ئەوەتا شتێ نابینێ، یاخود لە هیچ  شتێ ڕانامینێ
کە ئارەزووی دوژمنەکانی بەدی دەهێنێ!
 بە تووڕەیی خۆی کۆتاییان پێ دێنێ
تا بە سزایەکی سەرمەدی عەزابیان بدات، ئەدی بۆچی بوەستین؟

## 35

ئەوانەی کە مشوری شەر دەخۆن، دەڵێن، ئێمە بە عەزابێکی ئەبەدی حوکمڕێژ کراوین
کە کۆتایی نایەت، بەسەرمانا زاڵبووینە و ئاوامان بۆ نووسراوە
خۆ ئێمە هەرچییەك بکەین، لەوە زیاتر تووشی تاڵی و کوێرەوەری نابین؟
ئایا ئەوە خراترەکەیە؟ دانیشین و بیروڕا بگۆڕینەوە
لە هەمان کات چەکیشمان هەڵگرتووە؟ نەخێر

## 36

ئەی هەر ئەوەمان ئارەزوو نەبوو؟ کە خێرا ڕامانکرد و هەڵاتین؟
هەورەتریشقەی ئاسمانیش ڕاوی دەناین و تەفرتووناى دەکردین
ئەدی پەنامان نەبردە بەر خەرەندەکەوە، تا بمانپارێزێ ؟

## 37

ئەو دۆزەخە بۆ تا هەتا پەناگەی هەموو ئەو برینداراونەن
هەر لەو کاتەوەی کە کۆت و پێوەندمان خرایە پێ

ئێمەیان خستە ناو دەریاچەی سووتێنەرەوە؟
بێگومان ئەوە خراترینیان بوو

**38**

ئەی ئەگەر ئەوێ دەمێ، کە ئەو ئاگرە وەحشییەی داگیرساند
دووبارەی بکاتەوەو بەتووڕەییەکی سەد ئەوەندە، فووی پیا بکات
تووڕمان هەڵداتە ناو دڵی مەشخەڵە سووتێنەرەکانییەوە
دووبارە بە چەك ، تۆڵەمان لێبکاتەوە؟
بە دەستی ڕاستەی بەخوێن سووری، تەفروتونامان بکات؟
ئەوکاتە چیمان دەکرد؟

**39**

حوجرەکانی کراوەتەوە، ئاگری ئاسمانی ئەو دۆزەخە
وەکو تاڤگەیەکی ئاگراوی تۆقێنەر، لە هەموو ساتێکا هەڵدەقووڵێ
هەڕەشەی ئەوەمان لێدەکا، کە ڕۆژێك دێت
بە ترس و تۆقاندنەوە، هەڵیڕێژێتە سەرمانەوە
ئەوسا ئێمە چیمان دەکرد؟ لە کاتێکا ئێمە بڕیامان دەدا
کە خۆمان بۆشەڕێکی شانازمەند ئامادە بکەین

**40**

کەواتە رەشەبای ئاگرین، هەموو یەکێك ڕادەماڵێ
کەوا بەسەر تاوێرەبەردەوە پێوەند کراوە
بۆتە بارمتەی گێژەنە توند و بەهێزەکان
یاخود بۆ تا هەتا بە کۆت و بەند کراوی
لە ئۆکیانووسی جۆشدراودا نوقم دەبێ
کە لەوێدا تەنها بەناڵەی ئەبەدی قسەدەکات

## 41

به بێ ڕەحم و شەفەقەت، بەدرێژایی چاخەکان
کە هیچ هیوایەك نییە لە کۆتایی دا، ئەومیە لە هەمووان خراتر
کەواتە شەر چ ئاشکرا بێت چ بە نهێنی، وەکو یەکە
من دەنگ لە دژی شەڕ دەدەم و ئامۆژگاریتان دەکەم دوورکەونەوە لێی
هێزو فرۆفێڵ لە گەڵیا سوودیان چییە؟
یاخود کەسێ کە چاوی لە یەك دیمەندا هەموو شتێ ببینێ
فێڵ لە ئەقڵی دەکرێ؟

## 42

ئەو لە ئاسمانی بەرزی خۆیدا
تیز بە هەموو جووڵەکانمان دەکات، دەبینێ و پێمان دەخەنێ
هێزی ئەو بۆ وردوخاش کردنی ئێمە، کەمتر نییە لە حیکمەتەکانی
بۆ شکست پێهێنانی هەموو کودێتاو فرفێڵەکانمان
ئایا لەسەرمانە کە ئێمە بە سەرشۆڕی بژین؟
ئێمەی خاوەنی ڕەگەزی ئاسمانی بەزیو و ئاوارە کراو
تا لە کۆت و پێوەند و ئێش و ئازاردا بتلێینەوە؟
بە بۆچوونی من ئێستاکە، کە چارەنووس وخواستی غەنیمی سەرکەوتووی ئاسمان
کە هەرگیز ناتوانین خۆی لێ بەدوور بخەینەوە
ئێمە کردۆتە دیلی فەرمانەکانی خۆی

## 43

بەهەر حال شتێکی وا باشترە لە شتێکێ خراپترلەوهێزەی ئێمە
کە بۆ ئازارو ڕەنج کێشان و بۆ کارکردن، وەك یەك و بە هەمان ئەندازەنە
ئەو یاسایەش کە ئەمە دەسەپێنێ، کارێکی ویژدانی تەواوی کردووە
دەبێ یەکەمجار ئەو بیروڕایە ببینین، ئەگەر حیکمەتمان هەبێ
لەو کاتەی کە بەهێزەوە دەچینە شەڕی ئەو دوژمنە
من پێکەنینم بەو کەسانەوە دێت کە بە جەسورییەوە
بۆ لای ڕمەکانیان ڕادەکەن و سواری سەر پشتی مەترسی دەبن
لە هەمان کاتدا بە لەدەست دانی چەکەکانی خۆیان
بچووك دەبنەوەو زەبوون دەبن

## 44

چونکە ئەوانە لەو بەڵایە دەترسن، کە بەڕاستی دەبوایە لە دوای ئەوەی
بە شێوەی ئازارو ڕەنجی ئاوارەیی یا نەنگی و ریسوایی
یا زنجیری سەخت و دژوار،یاخود بە شێوەی سزای تر
بە ویستی غەنیمی زاڵبوو شکستیان هێنا، لە چاوەڕوانیان دابێت
ئێستێ ئەوە چارەنووسی ئێمەیە، جا ئەگەر توانیمان بەرگەی بگرین و
ئارامىمان هەبێ
لەوانەیە جۆش و خرۆشی دوژمنی گەورەمان
وردە وردە دامرکێتەوە و تووڕەییشی بنیشێتەوە
لەوانەشە کە ئاوا دوور بین لەو و دەست لە بێحورمەتکردنی ئەو هەڵگرین
ئەوە ئەویش بەو سزایەی کە بۆ ئێمەی خواستووە، ڕازی بێ و ئیدی بیر لە
ئێمە نەکاتەوە
لەوانەیە ببینن کە ئەو ئاگرە کارەساتە، دابمرکێتەوە
لەو کاتەی کە ئیدی چیتر، هەناسە هەڵناکا بە سەرییەوە

ئینجا گەوهەری پاکی ئێمە زاڵ دەبێ بەسەر ئەو هەڵمە ژەهراویە
یاخود هەستی پێناکەین
یاخود دوای زەمانێکی دوور، دەگۆڕێ و لەگەڵ ئەو شوێنەدا
بە جەستەو بە بیرو زەین رادێی
ئیدی گەرمی ئاگر دەبێتە شتێکی ئاسایی و ئازاری نابێ

## 45

لە تەك ئەو ئاواتەی کە لە ڕۆژانی داهاتووی بێ کۆتاییدا
هەروەها لەگەڵ ئەو بەخت و گۆڕانانەی لەگەڵ خۆیا دەیانهێنێ
وەك چۆن تاریکی کزدەبێ، ئاواش گڕی ئەو ئاگرە قەرار دەگرێ
ئەوەشیان جێگەی چاوەڕوان کردنە
مادەمەکێ بەشی ئەمڕۆکەمان لە شادی و خۆشی کەمە
ئەوە خراپی خراپتر نابێ
ئەگەر ئێش و ئازاری زیاتر بەسەرخۆماندا نەهێنین

## 46

ئابەمجۆرە بلیئال کۆتایی بە گوتاری خۆی هێنا، کە جلی ئەقڵی بەبەرا کردبوو
داوای لە هەمووان کرد کە تەمەڵی و هاسانکاری بپێزوێنن
بەڵام ئاشتی رەت کردەوە، دوای ئەو مامون هەڵسایەوەو قسەی کرد:
ئەگەر جەنگ باشترین ڕێگەی چارسەری بێت
ئەوە ئێمە دەست بە خەبات و جەنگ دەکەین
پاشای ئاسمان لە سەر کورسی لادەدەین
تا مافی ونبووی خۆمان بەدەست بێنینەوە

ئەوە ئاواتمانە ئەگەر قەدەری ئەبەدی
بچێتە ژێر ڕكێفی بەختی ناپایەدارەوەو كاوس[1] فەرمانڕەوا بێت

## 47

نائومێدی پێشوومان لە سەركەوتن بەسەریا
وەك هیوای داهاتوومان وایە بۆ گەڕانەوەوە
كەواتە چۆن ئەوەمان بۆ دێت؟ كە شوێنێ لە فیردەوس بۆ خۆمان بكەینەوە
تەنها ئەگەر بتوانین پاشایانی ئاسمان ببەزێنین
با وای دانێین كە ئەو تۆزێ لوتف دەنوێنێ و لە هەمووان خۆش دەبێ
دوای ئەوەی كە ئێمە پەیمانی گوێڕایەڵی بەو دەدەین
بە چ چاوێكەوە بەسەر شۆڕییەو، لەبەرامبەریا بوەستین؟

## 48

ئەوسا یاسای توندی خۆی بەسەرمانا دەسەپێنێ
بە چڕینی سروودی ستایش كردنی ئەوەوە
ئاهەنگ دەگێڕین و گۆرانی هلیلۆیا[2] ی بۆ دەڵێن
ئەو كات ناچارین سپاس و ستایشی گەورەیی بكەین
ئەویش وەك پاشا بەسەر كورسییەوە دادەنیشێ و ئێمەش حەسوودی پێدەبەین

## 49

لە پەرستگاكەشی عەترێكی مەلەكووتی، لە گوڵەكانی خودایی
هەڵدەستێ

---

1- كاوس، واتە كوێریی، لە عەرەبییەكە العماء دانراوەو لە فارسییەكە پەرێشانی.

2- هلیلۆلیا، وشەیەكی عیبرییە بەمانای درووود بۆ خوا بنێرن، دێت.

- ئەمبروزیا[1] - کە دیاری دەستی ئێمەی کۆیلەیە
ئەوەیە کاری ئێمە لە دۆزەخ، هەر ئەوەشە شادی ئێمەو بەس
وای ئەو ئەبەدییەتە چەند خەمەنگیزە ؟
ئەگەر ئێمە بۆ نوێژکردنی بەسەربەرین، بۆ ئەو کەسەی کە ڕقمان لێیەتی

## 50

کەواتە با واز لە هەوڵی ئەوەبهێنین، کە بگەین بە هێزی مەحاڵ
بەدوای ئەوە نەکەوین کە لە ڕێگەی کاری سەختەوە، نەمانتوانی پێی بگەین
ڕازی بوونی ئێمە بۆ بەدەست هێنانی وقبووڵکردنی کۆیلایەتی پڕ لە باق و بریق. با لە ئاسمانیش بێت، بۆ ئێمە قبوڵ نەکراوە

## 51

لە جیاتی ئەوە با لە خۆماندا، بە دوای خێری تایبەتی خۆمان بگەڕێین
هەروەها لە ژیانی تایبەتی خۆماندا، خزمەتی زاتی خۆمان بکەین
لەو حەشارگەیەد گەورەیەدا ئازادبین و کەس حسێبی ئەوەمان بۆ نەکات
کە ئێمە ئازادی سەختمان بە چاکتر زانیوە، لە کۆتی ئاسان و مەزنی کۆیلایەتی

1- ئەمبروزیا،خواردنی خواکانی ئولیمپە تا نەمر بن، دەلێن کە شەرابی ئەوان بووەو خواردنیشیان عەسیر بوو

## 52

رۆژێ دێ مەزنی ئێمە، بە ئاشکرا بەدیار دەکەوێ
لەوکاتەی کە شتی گەورە، لە شتی بچووك دروست دەکەین
یا لە شتگەلی زیانبەخش، شتگەلی بەسوود دروست دەکەین
یاخود سەرکەوتن لە فەشەل، ئێمە دەتوانین لە هەر شوێنێك لە شوێنەکان
لە ژێر سێبەری شەڕدا بگەشێینەوە
بە هەوڵ و کۆشش و سەبر، خۆشی و بەختەوەری لە ئازاردا دادەڕێژین
ئایا ئێمە لە دونیاقووڵە پڕ لە شەوەزەنگە دەترسین؟

## 53

ئەی چۆن پاشای گەورەی ئاسمان
نیشتنگەی خۆی لەناو هەوری چڕو تاریکدا هەڵبژاردووە؟
کە تووڕەیی و خرۆشی خۆیان تێك دەچرژێنن
ئاسمان وەك دۆزەخ لێدەکەن
بە جیلوەی تاریکی کورسی خۆی دادەپۆشوو
بێ ئەوەی جیلوەی بشاردرێتەوە
ئەو لاسایی تاریکایی ئێمە دەکاتەوە
ئایا ناتوانین لاسایی نووری ئەو بکەینەوە؟

## 54

ئەگەر ئێمە بمانەوێ ، ئەوە ئەو خاك و خۆڵە بیابانییە
خاڵی نییە لە بەردگەلی گرانبەهاو زێڕی درەوشاوەی
ئێمەیش هونەرو کارامەییمان کەم نییە
بۆ دەرهێنانی ئەو هەموو ئەو جیلوەو شکۆیەو شکۆداریان لێ خەڵق دەکەین

ئایا ئاسمان دەتوانێ لەوە زیاتر پێشکەش بکات؟
هەرچەندە ئازارمان زۆرە، بەڵام بە تێپەڕ بوونی ڕۆژان
دەبێتە چەند ڕەگەزێك لە پێکهاتەی ئێمەوە
ئەو مەشخەڵە سووتێنەرانە کە ئەمڕۆ ئازاربەخشن
بەهەمان تواناوە، دەتوانن ساف و گەوارا بن و ببنە ساردی و سەلامەتی
هەست کردنیشمان بە ئازار دەگۆڕێت

## 55

هەموو شتەکان بانگمان دەکەن بۆ ئاشتی و دامەزراندنی دەوڵەتێکی بە نیزام
بە باشترین ڕێگەو بە هەموو ئەمانەتێکەوە
کە بکرێ چارەسەری کارەساتی ئێستەمان بکەین
ئەومیش بە وەرگرتنی ئەوەی، کە ئێستا ئێمە چین و پێشترلە چیدابووین
تەواو دەستمان لە بیرۆکەی جەنگ هەڵگرتووە
بۆیە ئەوەی کە ئامۆژگاریی ئێومم پێکرد وەریگرن

## 56

خەریك بوو کۆتایی بێت کە هۆڵەکە پڕ بوو لەبۆڵەو منە من
وەك چۆن تاوێرە بەردی بۆش بە درێژایی شەو
بە ڕەشەبالی ڕاماڵکەرەوە دەنگ دەداتەوە، کە لە دەریاوە هەڵبکات
ئێستاس بە ریتمێکی هەڵچوو، کەوتە لاوانەوەی ڕێبواران لە دەریادا
کە لە ناو قایغەکانیان چاودێری ئەو شتەیان دەکرد، کە سوتفە هەڵیدابوو
یاخود کەشتییەکەیان کە دوای ڕوشەبا
لە بەندەرێکی بەردیندا لەنگەری گرتبوو

## 57

ئابەمجۆرە دەنگی چەپڵە بەرز بۆوە وبیسترا، کە مامون تەواو بوو
هەموو گوتارەکەیان بە باش زانی، کە ئامۆژگاری بوو بۆ ئاشتی:
هەر مەدایەکی دیکە لە دۆزەخ زیاتر دەیترساندن
ترس لە برووسك[1] و شمشێری میکایل[2]

## 58

ترسیان لەو، هێشتاکەش دەیلەرزاندن، هەرچەندە ئارەزووی ئەومیان هەبوو
بونیاتی ئیمبراتۆریەتی دونیای ژێرەوە بکەن
لەوانیە بە سیاسەت بەهێز بێت
بەدرێژایی زەمانێکی زۆر، دەبێتە ڕکابەرێکی دوژمن بە ئاسمان
کە بوعلزبوب سەرنجی ئەوەی دا کە لەسەر کورسییەکەومیە
کەس لەو بڵند تر نییە جگە لە شەیتان، بە سیمایەکی راستەقینە هەڵسایەوەو
وەك ستوونی تەلارێك بە وەستاوی بەدیار کەوت
چەند لۆچێ بە توێڵییەوە دەرکەوت
گوزارشتی لە هەڵوەستی بەڕاستی کرد و بایەخی بە جەماوەر دا

## 59

هێشتاکەش ڕوخساری ئەمیرەکان، بە ئاستێکی بەرز، لە ڕوخساریا دەدرەوشایەوە
هەرچەند لە وێرانیدا بوو، بەڵام وەك حەکیمێ، پڕلە جیلوە

---

1-ترس لە بروسک، هێمایە بۆ زەیوس.
2- هێمایە بۆ مەترسی، چونکە ئەهریمەنی بریندار کردووە و زوو چاک بووەوە.

كە وەك هێمنی شازادەیەك ئاشكرا دیار بوو، هەڵسایەوە سەر پێ
شانەكانی كە وەك ئەتڵەس وابوو، دەیتوانی هەڵگری گرانترین بار بێ
خۆی نیشانداو وەك هەوای شەو یا نیوەڕۆی هاوین
بینەرانی بەلای خۆیدا ڕكێشا و قسەی دەكردو گوتی:
ئەی خاوەن عەرش و ئیمپراتوریەتەكان، كوڕانی لەفیردەوس نەفیكراو
ئەی بوونەوەرە كاریگەرەكان، ئایا لەسەرمانە كە واز لەو لەقەبانە بهێنین و
بیكەین بە لەقەبی فەرمانڕەوایانی دۆزەخ؟

## 60

دەنگدانی هەموو خەڵك بۆ ئەوەدەچێ، كە هەر لێرە وەمینێین
دەیانەوێ هەر لێرە ئەو ئیمپراتۆرییەتە دامەزرێنن
بێگومان ئەوە هەمان خەونی ئێمەیە
بەڵام ئێوە نازانن كە پاشای ئاسمان وای قەزاوەت كردووە
كە ئەو شوێنە ببێتە زیندان بۆ ئێمە، نەك پەناگەیەكی ئارام
ئێمەیەك لە دەست بازووی بە توانای ئەودا ڕامانكردووە
تا بە بێ شەریعەتی بەرزی ئاسمانی، لێرە بژین
وەك یەكیەتیەك كە لە دژی عەرشی ئەو كۆبۆینەتەوە
بەو مەرجەی كە وەك كۆیلەیەكی تەواو
بە كۆت و پێوەندێكی حەتمیەوە، وەك ئاپۆڕەیەكی دیل بمێنینەوە

## 61

سەرەڕای زۆری دووریشمان لەو، چونکە ئەو بێگومان لەو بەرزاییە یا لەو قوولاییە

هێشتا هەر حاکمی یەکەم و کۆتاییە

وەك پاشایەکی تاتك و تەنیا، کە هیچ بەشێکی لە ئیمپراتۆرییەتی خۆی

بە هۆی هەڵگەڕانەوەی ئێمەوە لەدەست نەداوە

بەڵکو ئیمپراتۆریەتەکەی تا دۆزەخ درێژبۆتەوە

لێرمش هەر ئەو بە قیرقاجی[1] ئاسنینی خۆی، فەرمانڕەوایەتیمان دەکات

ئەوانەیش کە لە ئاسمانن، بە قیرقاجی زێڕین فەرمانڕەوایەتیان دەکات

## 62

بۆچی ئێمە باسی ئاشتی و جەنگ دەکەین؟جەنگ ئێمەی وردوخاش کردووە

بە زیانێکی زۆرەوە تووشی نەکبەتی کردووین

هەتا ئێستاش کەس مەرجەکانی ئاشتی خۆشناوێت، بەدوایدا ناگەڕێ

ئاشتیش جگە لە کۆیلایەتی و ئازارو لێدان و سزای زۆرداری تەواو

هیچی دیکەمان بۆ ناهێنێ

ئاخر ئاشتی چیمان بۆ دێنێ، جگە لە کەمکردنەوەی قودرەتی ئێمە؟

بەسەر دوژمنکاری و رق و قین و بەرگری دڕندانەو تۆڵەی لەسەرخۆ؟

لەگەڵ ئەوەشدا داگیرکارلانی کەم، هەمیشە پیلانمان بەسەردا دەکات

تا بەری سەرکەوتنی خۆی بدورێتەوە

---

1- قیرقاجی ئاسنین، هێمایە بۆ زوڵم و تاکرەوی و قیرقاج جۆرە کەرەستەیەکی ئازاردان و لێدانە.

## 63

بەوەش دڵخۆش دەبێ، کارێکی وابکات، کە ئێمە هەست بە ئێش و ئازار بکەین
بە دڵنیاییەوە هەلێکی ئاوا بۆ ئێمە نایەتە پێش، پێویستیشمان بەوە نییە
هێرشێکی توند بکەین و بۆ ئاسمان بچین
کە دیوارە بڵندەکانی، هیچ ترسێکی لە هیچ هێرشێ
یا ئابلۆقەدانێ، یا کەمینێکی ئەو خەرمەندەی لای خۆمانی نیە
ئەی ئەگەر چەند پرۆژەیەکی ئاسانترمان دۆزییەوە؟
- ئەگەر پرۆپاگەندە کۆنینەکان و غەیبگۆکانی ئاسمان هەڵە نەبن-
کە جیهانێکی تر هەیە، بارەگایەکی خۆشی وەچەیەکی نوێیە پێی دەڵێن مرۆڤ(١)
ئێستا کاتی دروست کردنیەتی، کە لە ئێمە دەچن، بەڵام تۆزێ کەم تواناترن لە ئێمە
وەلێ لای ئەو لە ئێمە باشترە

## 64

ئەوە ویستی ئەو بوو، کە لە ناو فریشتەکاندا باسی کردبوو
پەیمانی بە خۆی دابوو، ئەو پەیمانەی کە
قەڵەمڕەوی ئاسمانی سەرانسەر هێنابووە لەرزە
قسەی غەیبگۆکان راست دەرچوو، جا کەواتە
با بە هەموو بیرکردنەوەیەکی خۆمانەوە، بۆ ئەو جیهانە بچین

١-پێی دەڵێن مرۆڤ، هەتا ئەوسای قسەی ئەهریمەن، بە پێی نووسینی ملتۆن، مرۆڤ لەسەر زەوی نەبووە.

## 65

تا بزانین چ ئەفرێنراوێکن، لەوێ دەژین، شێوەیان چۆنە، لە چ گەوهەرو مژادێکن؟

زیرەکییەکەیان چییە، هێزەکەیان چییە؟

کام شوێنیان لاوازە و باشترین رێگە چییە بۆ فریودانیان

بە توندوتیژی یاخود بە فرووفێڵ و کەڵەك؟

هەرچەند ئاسمان داخراوە و دادوەری بەرزی ئاسمان

بە هەموو هێزێکییەوە،بە دڵنیاییەوە دانیشتووە

بەڵام ئەو شوێنە لای ئەو ئاشکرایە، لە دوا سنووری مەملەکەتی خۆیدا

داکۆکی کردنی لەو شوێنەدا بۆ ئەوانە جێهێشتووە، کە تیایا دەژین

## 66

لەوانەیە بتوانین لەو رێگەیەوە، بەو شێوەیەی کە سوودی بۆ ئێمە هەیە هەڵسینەوە

بە هێرشێکی کت و پڕ، یا بە ئاگری دۆزەخ ، تا ئەو ئەفرێنراوە تازەیە وێران بکەین

یاخود دەست بە سەر هەموویانا بگرین وهەموو شتێ بکەینە موڵکی خۆمان

ئێنجا وەك چۆن ئێمە لە ئاسمان دەرکراین

ئاوا دانیشتوانە بچووکەکانی ئەوێ دەربکەین

ئەگەر نەمانتوانی دەریان بکەین، ئەوە فریویان دەدەین بەگەڵ ئێمە بکەون

ئەوسا خوداکەیان دەبێتە دوژمنیان، بە پەشیمانی دەگەڕێتەوە

هەمووئەوانە وێران دەکات، کە خۆی دروستی کردبوون

## 67

ئەوەیان باشترە لە تۆڵەکردنەوەی باو
چونکە شادییەکانی ئەو بە دیداری پەرێشانییەکانی ئێمەوە تێکدەچێ
خۆشی و شادی ئێمەش بە بێزار کردنی ئەو زیاد دەبێت
کاتێ کە کورە خۆشەویستەکەی خۆی، لە ئاسمان فڕێدەداتە خوارەوە
ئەوانیش دێن لە گەڵ ئێمەدا بەشداری دەکەن و
ئەسڵی گەندەڵی[1] خۆیان بە نەفرەت دەکەن

## 68

ئەگەر ئامۆژگاری من شایەن بوو، ئەوە هەوڵی بۆ بدەن
ئەگەر نا هەر لە ژێر ئەو تاریکیەدا دانیشن و گرمۆڵە بن
دەتانەوێ مەملەکەت لە هەوادا دابمەزرێنن
ئا بەمجۆرە بوعلزبوب کۆتایی بە مەشوەرەتی شەیتانی خۆی هێنا
کە یەکەمجار خودی شەیتان پێشکەشی کرد، بەلکو بەشێکی
پێشنیاری ئەو بوو
جا ئایا ئەو هەموو خراپەکاریەکان لە یەك دانەرەوە هەڵدەقوڵێن؟
ئەو پیسی و پۆخڵیە جانگ ئەستوورە
تەواوی جسنی مرۆڤ بە یەك رەگەزدا گەندەڵ دەکات[2]؟
ئەو هەمووەش بۆ ئازاردانی ئەفرێنەر؟
بەڵام ئەو تەباکاریە گەورەیی ئەو بەرزتر دەکات؟

---

1- ئەسلی گەندەلی، ئەهریمەن مەبەستی ئادەمە، ملتون بە تاک قسەی کردووە ، مەبەستی ئادەم و حەوایە، چونکە لە تاکەوە بۆ کۆ دەچێ.

2- هێمایە بۆ مرۆڤ یا ئادەم

## 69

ئەو نەخشە جەسوورە، لە لایەن هەموو سەرۆك بەشە دۆزەخیەکانەوە قبوڵ کرا
خۆشی و شادی بەچاوی هەموویانەوە دیار بوو، بە گشتی دەنگیان پێدا
کە دەستی کردەوە بە گوتاری خۆی گووتی: باشتان کرد ئەو بڕیارەتان دا
ئەی سنودسی[1] خوداوەندان
باشە، ئەو گفتوگۆیە درێژەتان کۆتایی پی هێنا
باشتان کرد ئەو پرسە گەورەیەتان بڕاندەوە
ئەو پرسەی لە قووڵترین خەرەندەوە، سەرمان دەخاتە بەرزترین شوێن
لە هەواری پێشینمان بە نزیك دەکاتەوە

## 70

ڕەنگە بە بینینی سنووری درەخشانی ئاسمان
بەچەکی ئامادەو هێرشی شەوانەی لایەنگران، بتوانین بچینەوە فیردەوس .
یاخود شوێنێکی مامناوەندی ئاوا
تیایا دەژین و بێبەش نابین، لە ڕووناکی درەوشاوەی ئاسمان کاتێ کەوا
تیشکەکانی ڕۆژهەڵات دەدرەوشێنەوە
ئەو لەو تاریکیەدا پاك دەبینەوە
بەهەوای دڵگیرو نەرم، برینی ئەو ئاگرە لەناوبەرە سارێژدەکەین
بەڵام بەر لە هەموو شتێ، کێ بنێرین
تا بەدوای ئەم دونیا تازەیەدا بگەڕێ و توانای ئەوەی هەبێ؟

1- سندوسی، ئەنجومەنی مەلیسا، میلتۆن بو تاوانبارکردنی کلێسای بەکار هێناوە.

## 71

کێ هەیە بە قاچە ماندوو و شەکەتەکانی
قووڵایی ئەو تاریکیە بێ بن و بێ سنووره تاقی بکاتەوه؟
بەناو شەومزەنگەوه ڕێگەی نادیاری خۆی وەدۆزێ؟
یاخود لە ئاسماندا بە دوو باڵەوه، کە هەرگیز ماندوو نەبێ
بەرز بەرز بفڕێ. بەر لەوەی بگاتە ئەو دورگە خۆشەوه؟
جا چ هێزێ، یا چ هونەرێ یا چ فڕوفێڵێ، سەلامەتی ئەو دابێن دەکەن؟
لەوکاتەی کە بەناو پاسەوانان وناوجەرگەی فریشتەکانەوه ڕەت دەبێ

## 72

ئەوه پێویستی بە تەواوی ئاگا لە خۆبوونی ئێمەوه هەیە
هەروەها پێویستیمان بەوه هەیە
کە ئێمە زۆر ئاگاداری دەنگدان بین بۆ ئەم مەبەستە

## 73

کەواتە ئەوەی کە دەینێرین. باری هەمووانی دەکەوێتە سەرشان
هەروەها هەموو هیواکانیشمان
ئەوەی گوت و دانیشت، چاوی بڕیبووه ئامادە بووەکان
چاوەڕوانی ئەوه بوو یەکێ، بەدەرکەوێ کە قسەی هەبێت
یا نارازی بێ یا ئەو هەوڵە پڕ مەترسییە،بخاتە ئەستۆی خۆیەوه

## 74

بەڵام هەموویان بە کپی دانیشتبوون
لەبیرکردنەوەیەکی قووڵ دابوون، پرسە ترسناکەکەیان لێکدەدایەوە
هەریەك لەوان ترس و سەرسامی تایبەتی خۆی، لە روخساری ئەویتر
دەخوێندەوە
هیچ کەسێ لە میانی بژێردراوەکانی پێشین
ئەو پاڵەوانانەی کە شەڕی ئاسمانیان کردبوو
هێزوتوانای ئەوەیان نەبوو، وایان لێ بکات
ڕازی بن بەوەی بە تەنها، بچێتە ئەو گەشتە ترسناکەوە

## 75

بەڵام دواجار ئەهریمەن هەڵسایەوەوشانازییەکی گەورەی دەستەبەر کرد
بە کبریاییێکی شاهانەوە، بەسەر هاوڕێکانیدا بەرزبۆوە
دەرکی بە شایستەگی خۆی کرد، بێئەوەی جووڵە بکات، دەستی بە قسان
کرد
ئەی ئەوانەی ئاسمان زادگاتانە، ئەی ئاورینگ نشینانی فەلەك
ئەقلی قووڵ بە بێدەنگی و دوودڵی خۆیەوە ئێمەی ڕاماڵی
وێڕای ئەوەیش هەر بە چەسپاوی دەمێنێتەوە

## 76

ئەو ڕێگایەی کە لە دۆزەخەوە دەگاتە نیشتیمانی ڕۆشنایی
ئای کە ڕێگایەکی چەند دوورودرێژو دژوارە
ئەو زیندانەی ئێمە، زیندانێکی توندوتۆڵەو
ئەو گومەزە گەورەیەی ئاگر بۆ قووتدانمان ئاودەدا

به نۆ دیوار[1] ئابلۆقەی داوین و دەرگاکانیشی بەردی ئەدمێنت[2] ە
وەها داخراوە کە هەرگیز ڕێگە بەوەنادات بچینە دەرەوە

## 77

ئەگەر یەکێ بتوانێ تێیپەڕێنێ، ئەوە بۆشاییەکی قووڵی زوڵمەتی دێتەڕێ
کە هیچ جەوهەرێکی نییە، دەمێکی کراوەی قووڵی بێ کەینوونەی بە
دوادا دێت
هەڕەشەی لێدەکاو لەو کەنداوە دا غەرق[3] دەبێت
خۆ ئەگەر ڕزگاری بوو و چووە ناو جیهانێ لە جیهانەکان
یا هەرێمێکی نادیار، ئەوەی کە دەمینێ مەترسییە نادیارەکانە
کە زۆر سەختە لێیان دەرچێ
بەڵام خزمینە، من شایەنی ئەو کورسییە و ئەو دەسەڵاتە ئاورینگیە نیم
کە بە جوانترین شێوە ڕازاوەتەوە، تەیارە بە دەسەڵات
ئەگەرحوکمی پرسە گشتی و گەورەکان نەکەم
لە کاتە سەخت و دژوارەکاندا، یاخود تووشی مەترسی نەبم لە
هەوڵەکانمدا
هەر لەبەر ئەمەشە، ئەو هەموو لەقەبانەم پێ بڕاوە

---

1- نۆدیوار، لە ئەنیادەدا هاتووە، نۆ بازنە لە ڕووباری ستیکس، جیهانی خوارەوە لوولدەدات.

2- ئەدمینت، بەردێکی پتەوو نەرمە لە ئەڵماس، لەسەرچاوەی تر بە بەردی داغ هاتووە.

3- کەنداوی غەرق، لەوانەیە مەبەستی بێت، کە بە سرووشتی نەهاتۆتە بوون.

## 78

ئەگەر ڕەتی ئەومم کردبایەوە، کە بەرگەی ئەو کارانە بگرم
دەبوایە ڕەتی پاشایەتی خۆشم کردبایەوە، وەك شەرمەڤێك بۆ من؟
ئەی پێویستی سەر شانی پاشا نیی، ڕووبەڕی مەترسییەکان بێتەوە
هەرچەند ئەوانی تر ڕووبەڕووی مەترسیەکان ببنەوە و
شەرمەفی ڕێز لێگرتنم بەدەست بهێنم؟ هەربۆیەشە ئەی گەورە سالاران
ئەی ئەوانەی کە ئاسمان دەترسێنن
سەرەڕای ئەوەی کە کەوتنە خوارەوە بۆ ناو ماڵەکانتان
لەکاتێکا کە ئێرە هەواری ئێمەیە، بیر لەوە دەکەینەوە
کە ئاخۆ ئەو شتە چی بێت، کڵۆڵیمان کەم دەکاتەوە؟
تا وا لە دۆزەخ بکەین، زیاتر بەرگەی بگرین، ئەگەر چارەسەرییەك یا جادوێك هەبێت
کە ئازاری ئەو ئەو وارە ناپیرۆزە. دوا بخات یا نەهێلێت یا بەپاشی بدات

## 79

نەکەن خافڵ بن لەوەی کە چاودێری دوژمنی بە ئاگا بکەن
من لەو میانەدا دوور لە ئێوە
سنووری هەوارە وێران و تاریکەکان تەی دەکەم
بە دوای ڕێگەیێ دەگەڕێم، بەرەو ئازادی[1] و رزگاری هەمووان
لەو کارەشدا کەس بەشداری من ناکات
پاشا ئەوەی گوت و هەڵسایەوە و نەیهێشت کەس وەڵامی بداتەوە
هەلبەت ئەوە ژیری ئەو بوو، ئەو ترسی لەوە هەبوو
کە لەمیانی هەندێ لە سەرانی قەوم

1- بەرەو ئازادی و رزگاری، ئەهریمەن خۆی بە مەسیح دەچوێنێ، بەوەی کە ڕزگارکەری دونیایە.

لەسای بڕیاری ئەوەوە ئازایەتیان پەیدا کردبێ و ئەوانیش وەکو ئەو بکەن
کە سەرەتا لێی دەترسان

## 80

ئەوەیش وادەکات کە ئەوانەی ڕەتی دەکەنەوە، دەبنە ڕکابەری ئەو لە بیروڕادا
ئەو کاتە بە نرخێکی هەرزان، ناووناوبانگێکی باش پەیدا دەکەن
کە پێشترتەنها لە ڕێگەی، خۆدانە بەرمەترسی گەورە بە دەستیان هێناوە
ئەوان لە سەرکێشی نەدەترسان، وەك چۆن لە دەنگی کاسکاری ئەودەترسان
یەکسەر لە گەڵیا هەڵسانەوە، دەنگی پێکەوە هەستانەوەی هەموویان وەك هەورەتریشقە وابووو لە دوورەوە دەبیستررا
هەر هەموویان، بە ڕێزگرتنێکی بە هەیبەتەوە، بەرەو لای ئەو لاربوونەوەو کەوتنە سەر سگ، وەك خوداوەندێك، ڕێزیان لێناو هەر زوو کەوتنە ستایشیەوە

## 81

ئەولە پێناوی سەلامەتی گشتیدا، سەلامەتی خۆی بەهەند هەڵنەگرت
هەتا گیانە نەفرەت لێکراوەکانیش، هەموو باشییەکان لە دەست نادەن
خەڵکە شەڕاوییەکان، شانازی بە فریودراوەکانیان دەکەن لەسەرزەوی
تا ئەو شانازیەیان بەرکەوێ، کە بە حەماس پەردەپۆش کراوە
ئابەمجۆرە کۆبوونەوە گوماناویەکەیان کۆتایی هات
دڵخۆشبوون بە ڕابەرەکەیان وەك ڕابەرێکی بێ نموونە

## 82

وەك چۆن هەورە ڕەشەكانی ئاسمان، بە خەوتنی بای باكوور
بەسەر ترۆپكی كوێستاناندا بەرزدەبنەوە
تاوای لێدێت ئەو هەورە ڕەشە، بچمی خەندەئامێزی ئاسمان دادەپۆشێ
رەگەزی ئەو تاریكییە، بەفر یا باران، پەرش وبڵاوی سەر زەوی سێبەرپۆش دەكەن
چونكە لە پڕێكا بە سوتفە، خۆرەتاوی گەرم وگوڕ
ڕووناكی ئێوارانی خۆی بۆ ماڵاوایێكی دڵگیر، پەخش دەكات
ئیدی كێڵگەكان دەبووژێنەوە وگۆرانی و باعەباعی مێگەڵ نوێ دەبنەوە

## 83

وای بۆشەرمەزاری وسەرشۆڕی مرۆڤ؟ ئەهریمەنێكی نەفرەت لێكراو ،
لەگەڵ ئەهریمەنێكی تری نەفرەت لێكراودا
پەیمانێكی بەهێزیان لەگەڵ یەكدا مۆر كرد
بەڵام تەنها مرۆڤ لە ململانێدان لەگەڵ یەكتریدا
لە میانی بوونەوەرە ئاوەزمەندەكان تەنها مرۆڤن
كە لەگەڵ ئەوەیش ئومێدیان بە بەخششی خوا هەیە
ناتوانن لەگەڵ یەك سازش بكەن و پێك بێن

## 84

شەڕی زاڵمانە دادەگیرسێنن و زەوی پیس دەكەن
ئەوەش لە پێناوی ئەوەی، كە یەكتری وێران بكەن
وەك ئەوەی كەمرۆڤ، هیچ دوژمنێكی دۆزەخیی نەبێت
كە شەو و ڕۆژ دەورەی لێدابن و بیەوێ وێرانیان بكات

هەرئەوە وامان لێدەکات، کە دەبێ ڕێکبکەوین
ئا بەمجۆرە بە ڕێکی، ئەنجومەنی دۆزەخی کۆتایی هات
هەموو گەورە سالاری ئەهریمەنەکان، ئامادە بووبوون
لە ناوەندی ئەوانەوە، فەرمانڕەوای پڕ زەبریان لە جووڵە دابوو
بە سیفەتی گەورە سالار و توانای دۆزەخییەوە
بە شکۆداریی بەرزی مەلەکوتییەوە، کە کۆمەڵێ لە سیرافیم
بە ئاگری داگیرساو و چەکە سوارەکراوەکانی خۆیانەوە دەوریان دابوو

## 85

بە هاواری بەرزی کەڕەناکانیان و بە دەنگێکی ڕێکوپێك، ڕایانگەیاند
،کە ئەنجامی گرنگی دانیشتنەکەیان کۆتایی هات
چوار فریشتەی شیروبیم لەوان ئامادە بوون
ئامێرێکی کیمیایی[1] لەرینئامێزیان دەژەنی، تا هەرچوار بای کەون کەون
دەنگی موژدە بگەیەننە هەموو بایەکان

## 86

دوای ئەوەی کە ئەقڵیان حەسایەوەو پشتیان بەو هیوایە درۆزنەوە بەستا
هێزە رێك و پێکەکە بڵاوەیان کردو هەریەکەیان ڕێگەی خۆیان گرتە
بەر
هەریەکەیان وەك چۆن هەوای سەریان، یا بژاردەی خراپی خۆیان
جڵەوی گرتبوون، دەستیان بە ڕۆیشتن کرد
بۆ هەر شوێنێ کە تیایا هێمنیەك، بۆ نیگەرانی و سەرسامی خۆیا بدۆزنەوەو

1- ئامێی کیمیایی،هێمایە بۆ کیمیای کۆن، کە شەیتانەکان دروستیان دەکرد، میلتۆن ئەوەی بەکارهێناوە، وەک تێکەڵەیەک لە کانزا، تا زوڕنای دۆزەخ لە زوڕنای سەر دۆزەخی زێڕین، جیا بێتەوە.

پیشوازی له وەرسی کاتەکە بکەن، تا سەرۆکی گەورەیان دەگەڕێتەوە
هەندێکیان بە نێو دەشتاییەکاندا پەرش و بلاو بووبوونەوە
هەندێکیشیان لە هەوادا هەڵدەفڕین
یا ئەوەتا لە ڕکابەری پێشبڕکێی یارییەکانی ئۆلیمپیدا بوون

## 87

یا بەشێکیان لە کێڵگەکانی بیتی[1] دا، سواری ئەسپی ئاگرینی خۆیان بووبوون
هەندێکیشیان لە کەناری سنوورەکانی دۆزەخەوە، بە داشقە خێراکانیان
یاری تێپەڕکرنی تەگەرەکانیان دەکرد، یا وەك ئەوان وەختان
بە شێوەیەکی ڕووبەڕوو داهۆڵەکانیان دەپێکا
وەك بڵێی بۆ بێدارکردنەوەی شارە پڕ غرووورەکان
ئاسمانی پەرێشان، وەك مەیدان ساف و بێ گرێ و گۆڵ بووبێ
سویا خەباتگێڕەکان، خۆیان دەهاوێشتە ناو دڵی هەورەوە
لە بەرانبەر هەموو پێشەنگەکان، شاسوارە فەزانشینەکان
بەخۆیان و بەڕمی سەربەرەو خواریانەوە، بۆ پێشەوە تاویان دەدا
تا ئەو کاتەی ،فەیلەقە گەورەکان لەگەڵ یەك پەیوەست دەبوون

## 88

هەر لەو پۆلبەندییە رازاوەیەدا ، لەم سەر تا ئەو سەر
وەك بڵێی ئاسمان غەرقی ئاگر بووبێ ، وا دەهاتە بەرچاو

1- بیتی، یارییە ئولیمپییەکان قەدەغە کرابوون، لەسەردەمی میلتون، بەلام لەسەدەی نۆزدەهەم دەستی پێکردەوە، میلتون بۆ گەمەکردن بە کلێسا ، ئەوەی هێناوەتەوە چونکە کلێسا پێی وابوو گوناهە.

هەندێکی تریان، کە توورەیی تیفۆنی[١] کۆنترۆڵی کردبوون
داروبەردو بانەکانیان دەرکێشاوسواری گێژەنی هەوا بوون
هەتا دۆزەخیش تەنگی پێ هەڵچنرا لەبەر ئەو هەراو زەناو و ئەو ژاوەژاوە

## 89

ئاوابوو کە هەرقەڵ لە ئوکالیا[٢] دا گەڕایەوەو جلە ژەهرایەکەی لەبەرکرد
لەبەرسەختی دەردەکەی دارکاژەکانی لە بێخەوە هەڵکێشا
لیکاس ی لە لوتکەی ئەتاوە[٣] فڕێدایە دەریای ئوبیٚ[٤]

## 90

هەندێکی تر کە خووێکی هێمنتریان هەبوو، لە دۆڵێکی خامۆشدا
پەنایەکیان بۆ خۆیان هەڵبژارد، بە ئاوازی فریشتەیی، وێڕای نەوای سێتار
داستانی خەباتی دلێرانەی کەوتنە خوارەوەی پڕ فەلاکەتی خۆیان

1- تیفۆنی، هێمایە بۆ تیفونی وەحشی، کە هەمیشە ئەو ناوە دووبارە دەبێتەوە.

2- نوکالیا، هێمایە بۆ شاری تیسالیا، کە هەرقەل بوو بە پاشای ئەو شارە ، پێشتر کچەکەی – ویلی – سەرداری ئەو شارەبوو، بەلاَم نەیبەخشی بە هەرقەل، بۆیە هەرقەل دەیکوژێ، پاشان هەرقەل ویستوویەتی دیاری بدا بە زەیوس ، لیکاسی هاوڕێی دەنێرێ بۆ لای ژنەکەی، کە جلێکی بۆ ئەم مەبەستە بۆ بنێرێ، ژنەکەی جلێکی ژەهراوی بۆ دەنێرێ، لە ئاوی خۆشەویستی و وروژاندنی سیکسی وەردابوو، کە لەبەری کرد تووشی ئازارێکی زۆر توندهات ، درەختی لە بن و بۆتکەوە هەڵدەکێشاو لە چیای ئیتادا تووشی هاوڕێکەی هات، وای زانی کە ئەو وایکردووە، زۆر هەوڵی دا ئەو جلە لەبەرکاتەوە بەلاَم بە جەستەیەوە نووسابوو، ناچار ئاگرێکی گەورەی کردەوەو خۆی تێ هاوێشت و بوو بە پەڵە هەورێ و بووە یەکێ لە نەمرەکان، میلتون لێرەدا ئەفسانەی ئوفید دەنووسێتەوە نەک سوفوکلیس.

3-ئیتا، هەرقەل لیکاسی هاوڕێی لە لوتکەی چیای ئیتا فڕێدایە خوارەوە، خزمەتکاری ئەمینی خۆی بوو.

4-نۆبی، دورگەی بەشی خۆراوای دەریای ئیجە.

کە بە حوکمی جەنگ ببووە بەشیان، گۆرانیان بۆ پاڵەوانێتی و خەمگینی خۆیان دەچڕی
وەك چۆن قەدەر وای حوکم لە سەر کردبوون، شکاتیان لە قەدەر دەکرد
کە چۆن ئازادەکان بە هێز یا بە سوتفە دەکات بە کۆیلە
مانای سروودەکانیان نەشازوجیاوازبوون وئاوازیان لەگەڵ یەك گونجاو بوو

## 91

ئەی چۆن بوو، ئەگەر ڕۆحە نەمرەکان ئەو سروودانەیان چڕی با؟
دۆزەخیان پڕ لە شەوق دەکردو بە سیحری کوشندەیان[1] کۆنترۆڵی ئاپۆرەکەیان دەکرد
(کاریگەرێتی ڕەوانبێژی[2] بەسەر دەروونەوە
وەك سیحرە بەسەر ئاوازی ڕوونەوە )
هەندێکی تریش کە بەسەر چیایەکی دوور دوورەوە دانیشتبوون
ئەوانشیان خستبووە ئاخاوتنێکی شیرین و قووڵەوە
دەربارەی چەند بیرۆکەیەکی قووڵ، سەبارەت بە عینایەتی خوداوەندی و زانین و خواست و قەدەرو زانستی ئەزەلییەوە
نەگەیشتنە هیچ ئەنجامێك و بە هەنگاوی شەکەت[3] و هیلاکەوە بە ڕێگادا دەڕۆیشتن

## 92

---

1- سیحری کوشندە، سیحری سیرس ، جۆرە سیحرێکە بەشەراب دێتە کایەوە و گۆرانی پێ دەچڕین.
2- کاریگەرێتی رەوانبێژی..... میلتۆن پێی وایە ئەو سروودە قولابیە ، چونکە لە ناو دۆزەخ بوو، بە پێچەوانەی ئاسمان بوو .
3- بە هەنگاوی شەکەتەوە...... هەمان هەنگاوەکانی ئادەم و حەوا بوو، دوای گوناهە گەورەکە.

گفتوگۆیەکی زۆریان لە بارەی خێرو شەڕو خۆشی و ناخۆشی و
شانازی و شەرمەزاری وهەڵچوون و داکشان کرد
کە هەمووی لە تەونی حیکمەتی درۆو فەلسەفەی درۆیین بوو
بەڵام هەموویان کاریگەرێتی سیحرو شیرینی سیحریان هەبوو
کە بۆ ماوەیەك ، خەم و ئێش و ئازار سڕ دەکەن
هەروەها ئاواتی درۆزنانە زیندوو دەکەونەوە
یاخود چەکی سەبرو ئارامییەکی بەهێز، دەبەخشن بە دڵ
سەبرێکی ساردو پتەوتر لە پۆڵای سێ جار درێژراو

## 93

هەندێکیشیان دابەشبوون بەسەر چەند گروپ و دەستەی گەورە گەورە
قسەیان لە بارەی ئەو سەرکێشیە بێباکانە دەکرد
سەبارەت بە دۆزینەوەی ئەو جیهانە خەمبارەوە
ئێ بەڵکو پەنایان دەدا یاخود هەر هەرێمێ
کە ببێتە پەناگەی نیشتەجێبوونیان، لەجیاتی ئەو شوێنەی کە تیایا دەژین
بەپەلە چوار ڕێگایان گرتەبە، بەدرێژایی کەناری ڕووبارەکانی دۆزەخ
کە جۆگەلە جوانەکانی هەڵدەڕژایە ناو دەریاچە ئاگراویەکەوە
ئاوێکی شەڕاوی لەخۆ بارکردبوو

## 94

یەکەمیان ڕووباری ستیکسی ڤێزەوەن[1]، ڕووباری رق و قینی بکوژ
دوومیان ڕووباری ئەخیروونی کڵۆڵ، ڕووباری ڕەش و قووڵی خەمو سێهەمیان

١- ڕستووباری یکسی ڤێزەوەن و ئەخیرۆن و کۆسیتۆس و فلیکتۆنی ڤێزەوەن یا کرێت، میلتون کە وەسفی ئەو ڕووبارانە دەکات ، لە فیرژیلی ئەنیادەو دۆزەخیدانتی و لە شاژنی جنۆکانی سپێنسەر ی وەرگرتووە، بەڵام میلتون دەڵێ ئەو ڕووبارانە دەڕژێنە ناو دەریاچەی ئاگرەوە. یەکەم ستیکسی ڤێزەوەن ، دووەم ئەخیرۆنی کڵۆل و سێهەمیش کوسیتۆسی لوورەو، فلیکتۆنی توندوتیژ.

کۆسیتۆس
ڕووباری لوورەی بیستراوی سەر ڕووی ئەو جۆگەلە خەمگینە
چوارەمیان فلیکتونی توندو تیژ
کەتیایا شەپۆلەکانی بە توورەیی و تووندوتیژییەوە تێکدەچرژێن

## 95

دوور لە هەموو ئەوانەوە، ڕووبارێکی تر هەبوو،کە هێمن و لەسەرخۆ ، ئەویش ڕووباری لە بیرچوونەوەی لیتی بوو
کە بە ڕێگایەکی پڕلە پێچ و پەناوە هەڵدەقولا
هەر کەسێ لەو ئاوەی بخواردایەوە، ڕابردوو و ئێستای خۆی لەبیر دەکرد
خۆشی ناخۆشی، ئازارچەشتنی لەبیردەکرد
لەپشت ئەو ڕووبارەوە، قارەیەکی بەستەڵەك و تاریك و وەحشی هەبوو
هەمیشە ڕەشەبای گێژەن و سەرماوەزی ترسناکی بەسەرەوە بوو
لە سەر زەمینێکی رەق و بەستەڵەك، کەهەرگیز توانەوەی بۆ نەبوو

## 96

نەدەتواوایەوەو بەسەریەکا کەڵەکە دەبوو، دەتگووت وێرانەی تەلارێکی کەونارە
کە تەنها گەلە بەفرێکی بەرزو بەستەڵەکی بەدەورەوە بوو
ئەو بەفرو بەستەڵەکە خەرمەندێکیان مشت دەکرد،
وەك ئەوەی زەنەکی سیربونیس[1] بێ، لە میانی دمیات[2] و شاخی کاسیوسی دێرین
کە یەکسەر لەشکرێکی تیادا غەرق بوو بوو
وەك زەمهەریر هەڵدەچوو، ساردییەکەی کاری ئاگری تەواو دەکرد

1- سیربۆنیس، جۆرێک لە سەرابی لیمە، لە دەریاچەی سیربونیس لە ڕێژگەی نیلدا.
2- دمیات، شارێکە لەبەر ڕێژگەی نیل.

## 97

ئەو کەسانەی کە نەفرەت لێکراو بوون،بەچەند دەورەیەکی ئاسمانی
دیاریکراودا، بۆ ئەو شوێنە دەبردران
خوداوەندە چڕنووکدارەکانی[١] سزابەخش، ئەوانەی ڕادەدایە ناو ئەو دۆڵەوە،
تا چێژی تاڵی ئەو وەرچەرخان و گۆڕانە دژوارانەی، پلە بەرزەکانی ساردی و
گەرمی بکەن

## 98

ئەو گۆڕانانە دژوارتر دەبوون، کە لیتەی ئاگریان بۆ بەستەڵەك
دەگواستەوەو
ئیدی هەموو گەرمییەکی کیانی ئەثیری و نەرم و نیانی ئەوانی
لەبێن دەبردو بەبێ جووڵە عەزابیان دەکێشا
بۆ چەند ساتێ لە ساردی سەرمادا، رەقدەبووونەو دەبوونە بەستەڵەك
ئێنجا دووبارە پەرتەی ناو ئاگریان دەکردنەوە
بە قایغێکەوە بە رووباری لە بیرچوونەوەدا دەپەڕینەوەو خەمیان زیاتر دەبوو
هەرچەند دەپەڕینەوە، تەمەنا و خەباتیان دەکرد، بگەنە ئەو ئاوەی کە
ئامانجیان بوو
یەك دڵۆپ ئاوی ئەو ڕووبارە، هەموو خەم خەفەت و خەمبارییەکی
لەبیردەبردنەوە

## 99

بەڵام قەدەری ئەزەلی لەدژی ئەوان لە بۆسەدابوو
میدوزا[٢] خۆی و هەموو ترس و تۆقاندنی گۆرگۆنی خۆیەوە

1- چڕنووکدارەکان، واتە خوداوەندی تۆقاندن تۆڵەیان لە گوناهبارەکان دەکردەوە، بۆ گواستنەوەی مردووەکان، خارونیان بەکار دەهێنا، میلتون لە دۆزەخی دانتی وەریگرتووە

2- میدۆزا یەکێکە لەو چوار خوشکەی پێیان دەگووتن گورگونات، ڕوخسارێکی جوانی هەبوو، بەڵام کەزییەکانی مار بوون، هەرکەسی سەیری ئەوی کردبا، ئەو کەسە دەبووبە بەرد، کە ئۆدیسا دەچووە دونیای ژێرەوە، لەوە دەترسا سەیری بکات، دوا

پاسەوانی لەو خەرمندە و کەنداوە دەکرد
بەڵام ئاوەکە تا دەهات ڕایدەکردو دەنیشتەوە، هیچ جەستەیەکی زیندوو
نەیدەتوانی ئەو ئاوە تام بکات
وەك چۆن ئاوەکە لە لێوارەکانی تەنتالوس[1] دەنیشتەوە

## 100

ئابەمجۆرە ئەو دەستە سەرگەردانە بە هەنگاوی شڵەژاوبە کلۆڵی و سەرسامی
ڕەنگ پەڕیو و لەرزیو، لەشوێنی خۆیاندا چەقی بوون
بۆ یەکەمین جاربوو،کە چاوە ماندوو بوومەکانیان، بەختی ڕەشی خۆیان ببینن
ئیدی پەیان بەوە برد کە تا ئەبەد، هیچ ڕێگایێ[2] بۆ حەسانەوەو رزگاربوون نییە
بەناو دۆڵگەلێکی ترسناك و تاریکی زۆرەوە تێپەڕی بوون
بە هەرێمگەلێکی یەکجار زۆری ئێش و ئازاردا ڕەت بوو بوون
بەناو بەستەڵەکی زۆرو چیای ئاگرین و بەردو ئەشکەوتدا

## 101

هەر ئەوەنا بەڵکو جەهانێك لە مردن، کە بە نەفرەتی ئاسمان، بووبە بەدکاری خراپە
چونکە خەڵقەندمیەك لە خراپە[3]، بۆ خراپە نەبێت بۆ هیچ شتێك نابێت

---

جار بیرسیوس لەڕێگەی ئەوەی کە لە ئاوێنەدا سەیری کردو، کوشتی.

1- ئەنتلۆس، ئەو کەسە بوو کە لە جیهانی ژێرەوەدا، حوکمی ئەبەدی بەسەردادرا بوو، لەناو گۆمێکدا زنجیر کرابوو، ئەگەر تینووی با ئاوەکە دەنیشتەوە، ئەگەر برسی با خواردنەکە دووردەکەوتەوە.

2- هیچ ڕێگایێ بۆ حەسانەوە.... مەتی 12:43

3- خەڵقەندەیەک لە خراپە.... هێمایە بۆ ئەوەی کە خراپە ڕێگەیەکە بۆ چاکە، واتە مرۆڤ لەخراپە فێری چاکە دەبێت، ئەگینا وەک ملتون دەڵێت خوا دروستی نەدەکرد.

جیهانێ کە ژیانی تێدا دەمرێت، مەرگی تیا دەژیت
سروشتی هەرزە خوو ، بوونەوەری ناپەسندو سەمەرەو بەدو
وەحشی و شتی ترسناك هەڵدێنێ
خراپتر لەو چیرۆکە ئەفسانەییانەی گۆرگونات و هیدراو خیمیرای[١] دڵبەرد
کە ترس و تۆقانیان خستە ناو وە ئادەمیەکانەوە
لەوانەیش ئەهریمەنی غەنیمی خوداو ئینسان

## 102

کە هەردوو باڵی کردەوەو بەرەو دەرگاکانی دۆزەخ چوو،
تا هەڵفڕینی خۆی ئەزموون بکات
هەندێ جار بە تەنها لە کەنارەکانی بەندەری لای ڕاست
هەندێجاریش لای چەپ، خۆی لە خەرندەکە دەدا
بەرز دەبۆوە بۆ بەرزایی لوول پێچ و قووچەوە، کاتێ بەرەو دەریا دەچوو
دەتگووت ئەستۆلێکە و بە هەور هەڵواسراوە، بە بایەکی مام ناوەند
بە نزیك بەنگاڵ ویاخود بە ناو دورگەی تەرناد[٢] و تیتۆلدا ڕەت دەبوو

## 103

لەوکاتەی بازرگانەکان دانەوێڵەو بەهاراتیان بەرێگای بازرگانی دەریاوە
لە ئەسیوپیای حەبەشە ی فراوان تا کیپ - دەهێنا
شەوانە بەرەو جەمسەرەکان لە دەریایان دەدا
ئابەمجۆرە ئەو ئەهریمەنە باڵدارە، کە بەدوور دەکەوتەوە، بەدیارکەوت

١- هیدراو خیمیرا، ئاژەڵی ناو زۆنگاوەکان کە نوسەری هەبوو، هەرقەل کوشتی و خیمبیراش کچێ بوو بەسەری شێر و جەستەی بزن و کلکی مارەوە، ئاگری لەدەم دەردەدا، بیلەرفون کوشتی. ئەفسانە.

٢- تەرنادو تیتۆلدا، دوو دورگەبوون کە بە بەهارات ناوبانگیان دەرکردبوو.

دواجار تخووبه بەرزەکانی دۆزەخی، تا بنمیچە تۆقێنەرەکانی بۆ بەدیارکەوت
- ئەسیوبیا رێگایەکی دەریایی بوو بۆ گواستنەوەی بەهارات.

## 104

دەرگاکان کە لە سێ چینی مسین پێکهاتبوون و سێ هەندەش کرابۆوە
هەروەها سێ دەرگە لە ئاگرو سێ دەرگاشی لەبەردی ئەڵماس بوو
کە هەرگیز تێپەڕ نەدەکراو چواردەورەشیان، ئەلقەیەکی ئاگر بوو
کە کوژانەوەی بۆ نەبوو، لەم لاو لەملای دەروازەکاناو لە بەرامبەریانا
دوهەیکەلی دێو پەیکەر قیت بووبوونەوە
یەکەمیان تا نیوەی وەك ئافرەتێکی جوان وابوو
بەڵام باقی جەستەی شتێکی قێزەوەن بوو
تێکالاّوێك بوو لە پوولەکەی درێژو[1] چوونە باریەك و داپۆشرابوو
وەك ئەوەی مارێکی چەکداری تەیار بە ژەهرێکی کوشندە وابوو

## 105

کەمەریشی بە چەند سەگێکی لمووز پانی، سیربیریە[2] ی دۆزەخی دەورەدرابوو
کە هەرگیز ، لەوەڕین و خرۆشان نەدەکەوتن، هەراوزەنایەکی نەفرەئامێزیان بەرپا کردبوو، ئەگەر کەسێ رێگەی لە وەڕینیان بگرتایە ، ئەوە دەچوونەوە ناو ڕەحمی ئافرەتەکەوە
لەناو رەحمییەوە دەستیان بەلووره دەکردو دەوەڕین، بێئەوەی ببینرێن

1-پولەکەی درێژ، بەکارهێنانی شتێ لە مار بۆ ژن هێمایە بۆ گوناه، وەک چۆن لە کتێبی شاژنی جنۆکانی سبنسردا هاتووە.
2- سیربیریە ، سەگی سێ سەر .

قێزمونی خۆیان لەو سەگانە زێتر دەکرد ، کە هێرشیان کردبووە سەر سیلا[1]
لەوکاتەی کە لەو دەریایەدا مەلەی دەکرد

## 106

ئەو دەریایەی کە هەردوو کالابریا و کەناری ترینا کاریا ی دەنگ گڕی
لەیەك جیا دەکردەوەو جادووگورەکی شەوانەیان زێتر دەبێزواند
کە ئەگەر بە نهێنی بانگ کرابا، دەهات سواری پشتی هەوا دەبوو
بەبۆنی خوێنی منالآن سەرمەست دەبوو
تا لەگەڵ جادوگەرەکانی لبلاند[2] دا سەما بکات
لەکاتێکا ئەو جادووگەرانە کاریان دەکرد بۆ ئاوابوونی مانگ[3]
مانگیش لەبەر جادوی ئەوەوە ئازاری دەکێشاو ون دەبوو

## 107

بەڵام شێوەی پەیکەرەکەی تر[4]- ئەگەر قسەکە گوتنی تەواوە بێت -
چونکە هیچ شێوەو شەمایلێکی نەبوو، نە ئەندامێ نە جومگەیێ نە قاچێ
یاخود مژادێ، کە بتوانین بڵێین وەك تارمایی دەردەکەوێ
شێوەی سێبەرەو سێبەری شێوەیە، کە قیت دەبێتەوە تاریکە وەك شەو
توندوتیژە وەك خوداوەندەکانی تۆڵەسەندنەوە[5]، ترسناکە وەك دۆزەخ ،

---

1- سیبیلا، کچێکی جوان بوو، سیرسی سیحرباز جادووی لێکردو کردی بە وەحش و پاشان سەگ و دەحەپی.

2– لبلاند، هەرێمێکە لە فنلندا گوایە هەوارگەی جادووکەرانە.

3- واتە صقلیە.

4– شێوەی پەیکەرەکەی تر، واتە مەرگ و میر.

5– خودای تۆڵە سەندنەوە، لەوانە ئەلکتو و تیسیفۆنی و میگارا . وەک لە میتۆلۆژیادا هاتووە

گورزێکی ترسناکی بەدەستەوەیە، لەسەرسەری خۆی دادەنێ و
واخەیاڵ دەکات تاجێکی مەلەکییە

## 108

ئەهریمەن لێی نزیك بۆوە و وەحشەکە بە پەلەو بە هەنگاوی ترسناك، کە
بۆ لای چوو
لەکاتی ڕۆیشتنیدا دۆزەخ کەوتە لەرزەوە، بەڵام ئەهریمەنی سەرکێش پێی
سەرسام بوو
کە ئەوە چ شێوەیەکە، بێ ئەوەی لێی بترسێ، چونکە ئەهریمەن جگە لە
خوداو مەسیح[1]
نرخی بۆ هیچ کەس و خەلقەندەیەك دانەدەناو بە چاوی بێزەوە سەیرێکی
کردێ و گووتی:
تۆ کێی و لەکوێ هاتوویت ئەی چەپەڵ شێوە؟
کە بەهەموو نەگبەتی و ناشیرینی خۆتەوە زاتت کردووە
بە تەوێڵی کرێتی خۆتەوە ڕێگای ئەو دەرگانەم لێ بگریت؟

## 109

بە یەقین بزانە من بڕیارم داوە، بەم دەرگایانەدا تێپەڕم و مۆڵەت لە تۆ
وەرنەگرم ، دوورکەوە یا ئەوەتا گەمژەڵی خۆت بچێژە، تا بە کردەوە فێر
بیت نەك بە قسە
تۆ کە زادەی دۆزەخی[2] فێری ئەزموون بە، کاتێك لەگەڵ گیانی ئاسمانی
جەدەل دەکەی

---

1- باوەڕی مەسیحیەت لەسەر سێینە دەوەستێ ، خوداو تاقانەیی و ڕۆحی پیرۆز
2- زادەی دۆزەخیی. ئێستا شەیتان لە دۆزەخە، بەلام زادەی ئاسمانە، تەمەنی ئەو پێش دۆزەخە، بەلام مەرگ زادەی دۆزەخە .

دێوەکە بە ڕق و توورپییەوەمو وەڵامی دایەوە:
ئایا تۆ فریشتە خائینەکە نیت؟ تۆیەکەم کەس نەبووی کە ئاشتی ئاسمانت تێکدا؟
بیروباوەڕت وردوخاش کرد.، کە پێش تۆ وردوخاش نەکرابوو؟

## 110

هەروەها بە چەکی هەڵگەڕانەوە، سێبەشی کوڕانی ئاسمانت[1] فریودا
کە لە دژی ئاسمان بوەستن و خواش هەمووتانی دەرکرد
مەحکوم بەوە بوون ؟کە تا هەتایە لە شین و ئێش و ئازاردا بەسەر بەرن؟
ئایا خۆت بە فریشتەی ئاسمان دەژمێریت؟کە تۆ مەحکومی بە دۆزەخ؟
ئینجا زاتی ئەوە دەکەی کە هێرشم بکەیتە سەروبێزم لێ بکەیتەوە؟
کە من پاشام و فەرمانڕەوایەتی تۆ دەکەم
بۆ ئەوەی زیاتریش تووڕت کەم، ئەوە من پاشاو گەورەی تۆم
بگەڕێوە بۆ ئەو شوێنەی پێی سزادراوی؟

## 111

ئەی ڕاکردووی فێڵباز، خێراییت دوو ئەوەندە لێبکە و بگەڕێوە
ئەگینا بە گورزی دووپشك[2] دەکەومە دواتەوە، تا هێورت کاتەوە
یا بە یەك زەربەی ئەو گورزە کوشندەیە، وات لێدەکەم
ترس وتۆقانێکی غەریب سواری سەر ملت بێت
ئازارێکی وا بکێشی کە پێشتر نەتچەشتبێ

---

1- سێبەشی کوڕانی ئاسمانت، دێوێک پەیدا بوو حەوت سەری هەبوو و دە شاخی هەبوو ، حەوت تاجی بەسەرەوەبوو، کلکەکەی سێبەشی ئەستێرەکانی ڕادەکێشا ، هێنایە سەر زەوی و وەستا، تا ژن منالی ببێ و قووتی بدات . رۆئیا: 4-12:3

2- دووپشک، لە ملووکی یەکەمدا هاتووە - من بە دووپشک فێری رەوشتتان دەکەم کە باوکم.

له كاتی قسه‌كردن و هه‌ڕه‌شه‌كانیدا، هه‌ڵده‌فاو ئه‌ستوور بوو
هه‌تا له ڕووی بەدخوڵقی و ترسه‌وه، ده‌هه‌نده‌ی خۆی لێهات

## 112

له‌ولای تریشه‌وه تووڕه‌یی، ئاگری له چاوی ئه‌هریمه‌ن هه‌ڵساندبوو
بەبێ ترس وه‌ستاو وه‌ك ئه‌ستێره‌یه‌كی كلكداری داگیرساو ده‌بریقایه‌وه
ئاوره‌كه‌ی به قه‌د درێژی ئاگری ئه‌فیكوسی[1] حه‌زیا هه‌ڵگر بوو
له ئاسمانی جه‌مسه‌ری باكووردا
پرچی ترسناك و تێكئاڵۆزاوی، بۆنی نه‌كبه‌تی جه‌نگ و تاعونی لێده‌هات
هه‌ریه‌كه‌و ڕمی كوشنده‌ی خۆی، هه‌ڵكێشایه سه‌ر سه‌ری غه‌نیمی خۆیه‌وه
هه‌ریه‌كه‌و ده‌یه‌ویست به ده‌ستی وێرانكه‌ری خۆیه‌وه
زه‌ربه‌یه‌كی وا بوه‌شێنێ كه دووه‌می نه‌بێت
وه‌ك ئه‌وه‌ی كه دوو هه‌وری ڕه‌ش بن و به مه‌تره‌لۆزی ئاسمان ته‌یاركرابن
به‌سه‌ر ده‌ریای خه‌زه‌ره‌وه به‌جۆش و خرۆش و نه‌ڕڕه‌وه
ڕووبه ڕووی یه‌كتری وه‌ستان

## 113

به‌ر له‌وه‌ی با كه‌ڕه‌نای خۆی بژه‌نێ، ئه‌وان تۆزێ ده‌سووڕێنه‌وه
ئینجا له ئاسمانی ناوه‌ند یه‌كانگیربوونی نادیاری ئه‌وان ڕاده‌گه‌یه‌نرێ
ئه‌و دووجه‌نگاوه‌ره پۆلا بازووانه، برۆیان وه‌ها تێكنابوو
كه له‌به‌ر گرژومۆنی ئه‌وانه‌وه، تاریكی دۆزه‌خ زیاتر بوو
هه‌ردووكیان به بازووی به‌هێزی وه‌ك یه‌كیانه‌وه
له‌به‌رامبه‌ر یه‌كتریدا وه‌ستابوون

1- ئه‌فیكۆسی، گه‌وره‌ترین ئه‌ستێره‌ی جه‌مسه‌ری باكووره، پێی ده‌ڵێن هه‌ڵگری مار.

چونکە لەمەوپێش جگە لە یەکجاری تر نەبێ، نەئەو و نەئەم
دوشمنێکی وابەهێزیان[1] لە بەرامبەری خۆیاندا نەبینیبوو

## 114

پاشان یەکانگیری یەکتری بوون و کەوتنە شەڕێکی سەختەوە
لە هەموو دۆزەخدا دەنگی دایەوە .
مارتن[2] ی جادووباز[3] کە لە دەروازەی دۆزەخ دانیشتبوو و
کلیلی شوومەکەی بەدەستەوە بوو، بە هاوارێکی کوشندەوە
خۆی هاوێشتە مینیانەوەو لەیەکی کردنەوە و گووتی:
ئەی باوکە ئەوە خەریکە دەستی تۆ، چ لە کوڕی تاقانەت دەکات
ئاخ کوڕەکەم ئەو تووڕەییە چییە وا دایگرتووی
خەریکە تیری کوشندەت دەکەیتە سەری باوکت؟

## 115

تۆ دەزانی ئەوە لە پێناوی کێیە؟
لەپێناوی ئەوەی کە بەسەر سەرمانەوە دادەنیشێ و بەتۆ پێدەکەنێ
زەلیلترین کاری بەسەرتۆوە فەرز کردووە
تووڕەییەکەت چیت پێدەڵێ تۆ ئەوە دەکەیت
ئەوە ئەو تووڕەییەیە، کە پێی دەڵێن دادپەروەری
کە ڕۆژێ دێ هەردووکتان لە ناو دەبات

## 116

کە ئاوای گووت، بەو قسانە بەڵای دۆزەخ لە شوێنی خۆی وەستا

---

1- مەسیح بە مردن، بەسەر شەیتاندا زاڵبوو ، نامە بۆ عیبرانیەکان 14-2
2- مارتن، عەڕرافە مارەکە.
3- ملتون هەرسێ لە شەیتان و مەرگ و گوناهی دۆزەخ، وەک سێینەی ئاسمان، بە سوخریەتەوە دەهێنێتەوە .

ئەوکاتە ئەهریمەنیش وەڵامی دایەوەو گووتی :
هاواری تۆ چەند غەریب و سەرسامکارە، دەستی پێ شلکردم
رێی لەوە گرت کە خەبەری دەستکارەکان و نیەتی خۆمت پێ بڵێم

.

## 117

سەرەتا پێم بڵێ تۆ کێیت؟ تۆ چیت و بۆ دوو شێوەی؟
بۆ لەم دۆڵە دۆزەخییەدا و لەیەکەم بینیندا، بە باوك بانگت کردم؟
ئەی بۆچی واخەیاڵ دەکەی، کە ئەو تارماییە ناشیرینە کوڕی منە؟
من ناتناسم، نەخێر و قەتیش بەر لە ئێستا
دیمەنی وا کرێت و ناشیرینی وەك تۆ و ئەوم نەبینیوە
لێرەوە پاسەوانی دەرگاکانی دۆزەخ وەڵامی دیەوەو گووتی
دەبینم لە بیرت کردووم؟ئایا ئێستاکێ لەبەرچاوی تۆ ناشیرینم ؟
کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ئاسماندا بە جوان ناودار بووم؟

## 118

بەبیرت نایێ لەبەردەم هەموو فریشتەکانی سارۆفیم
کە هاوکاری تۆیان کرد، لە تەگبیری پیلانە جەسوورەکەتان
لە دژی پاشای ئاسمان، کە لەناکاو تووشی ئازارێك هاتی؟
چاوەکانت تاری بوون و سووڕان، لە تاریکی دا مەلەیان دەکرد
لە کاتێکا لە سەری تۆدا، چەند مەشخەڵێکی گەورە دەرپەڕی
تا لە دواییدا، ئەو سەرەت لە لای چەپەوە
شەقێکی گەورەی برد [1]، من کە لە شێوەی شایستەی تۆ بووم

1- شەقێکی گەورەی برد، واتە چوونە دەرەوەی گوناه لەسەری شەیتان، وەک چوونە دەرەوەی ئەسینای خوای حیکمەتە، لەسەری باوکی، لای چەپ لە لای کریستانەکان بە مانای گوناه دێت، هەموو گوناهکارەکان، لە لای چەپی باوکەوە دەوەستن، لە رۆژی پەسڵانێدا.

جیلوەو جوانی ئاسمانیم هەبوو، دەدرەوشامەوە و چەكدار بووم
من لە ناو سەری تۆ هاتوومەتە دەرەوە

## 119

ئەو ئاپۆرەیەی كە ئەوسا لەوێ بوون، واقیان وڕما
یەكەمجار لە ترسان پاشەكشەیان كرد و ناویان نام گوناه
وایان بینیم كە بەڵگەی نەكبەتی و ناپیرۆزیم
دوای ئەوەی كە لە من ڕاهاتن، ئیدی منیان خۆشویست
جوانی و دڵڕفێنیم، سەختترین دوشمنانی فریو دەداو خۆشیان دەویستم
بەر لە هەموویان تۆبە تایبەت، زۆرجاران خۆم لە تۆدا دەبینی
وێنەی خۆم لە وێنەی تۆدا دەبینی
بووم بە گراوی تۆ و بە نهێنی لەززەتت لێوەردەگرتم
تا ڕەحمم لە تۆ پڕ بوو، وردە وردە گەشەی دەكردو گەورە دەبوو

## 120

بەڵام ئەو كاتە شەڕ هەڵگیرسا
دایباوانمان كەوتنە جەنگ لە ئاسمانەوە - جگە لەوە دەبوایە چی ببێ –
سەركەوتنێكی درەوشاوە، بووە نبەشی غەنیمی ئێمە
ئیدی هێزەكانی ئێمە، لە سەرتاسەری ئاسماندا شكستیان هێنا
هەر هەموویان لە تەوقی ئاسمانەوە، كەوتنە ناو ئەو قووڵاییە
منیش لەم كەوتنە خوارەوەیە، بەگەڵ ئەوان كەوتم
لەو كاتەوە ئەو كلیلە بەهێزانە درایە دەستم، فەرمانیان دا كە ئەو دەرگانە دابخەم
هەر لەوكاتەوە هیچ كەسێ، بێ مۆڵەتی من لەو دەرگایانەوە رەت نەبووە
بە تەنهایی و ئەندێشەوار لێرانەوە دانیشتووم

## 121

بەڵام ئەوەندە دانەنیشتم، چونکە سکم پڕ بوو لە تۆ و ئێستاش وا گەورە بووە ، هەستم بە جووڵەیەکی بەهێز کردو ژانم گرت
دواجار ئەو بارە ناشیرینەی، کە ئێستا دەیبینی، بە شێوەیەکی وەها توندوتیژ کە تەواوی هەناوەی هەڵزڕاند، لەدایك بوو، لەدایك بووی تاقانەی تۆ[1] . بە ترس و ئازارەوە ڕێگەی خۆی کردەوە و شێواندمی
ئاوەها بوو کە نیوەی ژێرەوەی جەستەی منی کردە شتێکی تر
بەڵام ئەو کە دوژمنی دژواری منە، هاتە دەرەوە
تیری لەناوبەری خۆی هەڵدەشەکاند، دەیەویست وێرانم بکات

## 122

هەڵاتم و هاواری مەرگم کرد
دۆزەخ[2] کەوتە لەرزینەوە کە گوێی لەو ناوە کرێتە بوو
لە ناو هەموو ئەشکەوتی ئەشکەوتەکانیدا بەسەختی ناڵاندی
بەدەنگدانەوەی ئەو ناڵینە وشەی مەرگ دووگاڕکێ بوو
ڕامکردو بەدوام کەوت (بەرلە تووڕەیی، شەهووت زیاتری دەسووتاند )
بەڵام لە من خێراتر بوو و گەیشتە من، منی دایك، لەسەر هەموو خەمەکانم بە باوەش پێداکرنێکی توندوتیژەوە، چەپەڵانە لەگەڵ من تێکەڵ بوو

## 123

لەو تێکەڵبوونەدا، ئەو هەیولایە بەجۆش و خرۆشانە لە دایك بووین
وەك چۆن بینیت بەردەوام هاواردەکەن و بە دەوروبەرما هەڵدەخزێن
دەمخەنە میانی خۆیانەوە،هەر سەعاتێ کە سکم پڕدەبێ و

---

1- لەدایکبووی تاقانەی تۆ، لێرەدا زایەندی ئەهریمەن، بەشێوەزارێکی تیزئامێزەوە لاسایی ئینجیل یوحنا دەکاتەوە3:14:1: 3ک16 دەکاتەوە

2- دۆزەخ کەوتە لەرزینەوە، هەمان ئەم دەستەواژەیە، لە دۆزەخی دانتیدا وەرگیراوە.

هەر سەعاتێ کە لە دایك دەبن، ئێش وَ ئازار بەسەرما دادەبارێ
چونکە کاتێ لەو ڕەحمەی کە هەڵیگرتوون، لەدایك دەبن
دەگەڕێنەوەو دەلوورێنن و هەناوم دەخۆن
ئەو کاتە دووبارە دێنە دەرەوە، وا بەسەختی ئازارم دەدەن
کە بۆ ئەبەد ناحەسێمەوەو ئارامیم بۆ نامینێ .

## 124

لەبەرامبەر چاومدا مەرگی شووم، کە هەم کوڕی منەو هەم دوژمن
لە شوێنی خۆی هەڵتووتاوەو هانیان دەدات
ئەگەر نەزانن کە من دایکیانم و کۆتاییان بەندە بە کۆتایی من
هەرزوو بەخێرایی دەمخۆن، ئەگەر نێچیرێکی تریان بەدەست نەکەوێ

## 125

دەزانن کەمن لوقمەیەکی تاڵم و لە ناویان دەبەم
ئەوە لەمندا ڕوودەدات، ئەوە حوکمی قەدەرە
بەڵام تۆ ئەی باوکە، لە تیری بکوژی ئەو ئاگادارت دەکەمەوە ڕاکە ،
نەکەی بە ئاواتی درۆزنانە هەڵخەڵەتێی
بەوەی کە تۆ بەو چەکە بریقەدراوە پارێزراو دەبی
یا جەوهەری داڕێژراوی، ئاسمانیش هەبێت
چونکە هیچ کەسێ خۆی لەبەر زەبرەی کوشندەی ئەو راناگرێ
تەنها ئەو کەسە نەبێ، کە فەرمانڕەوایەتی ئاسمان دەکات

## 126

لە قسەکانی خۆی بۆوە و ئەهریمەنی مەکرباز وانەیەکی باشی وەرگرت
هێوربۆوەو بە نەرمی کەوتە ئاخاوتنەوە: کچی خۆم ، مادامەکێ تۆ

من بە باوكی خۆت دەزانی، ئەو كوڕە جوانەی منیشت پێناساندم
كە یادگاری ئازیزی چێژێكە، ئەوە دەسەلمێنی كە لە تۆ نزیك بووم
من و تۆ لە ئاسماندا، ئەو چێژەمان لە یەكتری وەرگرتووە
باسكردنی باش نییە لە ئێستاكەدا، لە كاتی ئەو گۆڕانە تۆقێنەرەدا
لە دوای كەوتنە خوارەوەمان، كە كەس پێشبینی نەدەكرو بیریشمان لێ
نەدەكردەوە

## 127

ئەوە بزانە من بۆ ئەوە نەهاتووم[1]، دوژمنایەتیتان بكەم
بەڵكو هاتووم لەو شوێنەی ئازارو تاریكیە خەمبارەتان رزگاربكەم
تۆو هەموو ئەو ئاپۆڕە ئاسمانییەی كە دەڵێن، شەڕتان بۆ ئێمە كردووە
لە ئاسمانی بەرز كەوتوونەتە خوارەوە، من لە پێناوی ئەوانە هەموویانە
خۆم ڕەپێش كردوومو بە هەنگاوی پڕ لە ترسەوە، ئەو خەرەندە بێ بنە دەبڕم

## 128

لەناو ئەو بۆشاییە پان و پۆڕەدا، سەرگەردان بەدوای ئەو شوێنە موژدە بەخشە
كەوتووم
كەئایندەناسەكان دەڵێن هەیە و بەپێی بەڵگەكان، گەورەو خڕو بازنەیی،
دورست بووە
ئەو شوێنە جێگایەكە بۆ بەرەكەت لە تخووبی ئاسماندا [2]
لەوێدا ئەفرێنراوێ دەژیت كە بەسەر پێوە دەوەستێ
تا ئەو بۆشاییە پڕكەنەوە كە ئێمە جێمان هێشتووە
هەرچەندە كە ئەو شوێنە دوور دوورە

---

1- ئەهریمەن لاسایی مەسیح دەكاتەوە، كە قوربانی لەباتی هەمووان دەدا-
2- تخووبی ئاسمان، سنووری نێوان ئاسمان و دۆزەخ، كە دونیای مرۆڤ بەدیار دەكەوێ.

## 129

تا  ئاسمان پڕنەبێتەوە بە ئاپۆڕەی بەهێزی ئەوانەی
کە لەوانەیە کۆببنەوە و بۆ ئاشووبێکی تر تاو بدەن
جا ئەگەر ئەوە ( بێت یاشتێکی نهێنی تر)
من پەلەی ئەومم هەیە، کە پەی بەو شوێنە بەرم
ئیدی هەر زوو دەگەڕێمەوە و دەتانبەم بۆ ئەوێکەوە
کە تۆو مەرگ بە ئاسانی لەێدا دەژین
بە ئازادی سووکەڵە بە باڵەکانتان ، بەبێدەنگی ونهێنی و بێ هەرا
لە هەوایەکی عەتراویدا هەڵبفڕن، لەوێدا هەتا دەتوانن بخۆن و تێر ببن
هەموو شتێ بۆ ئێوە نێچیرە

## 130

ئەوە گووت و بێدەنگ بوو، چونکە هەردوو هەیولاکان، دڵخۆش دیار بوون
هەتا مەرگیش بە بیستنی ئەوەی کە برسیەتی تێر دەبێ
دەمی بۆگەنی بە وەحشیانە کردەوە و سپاسی سگی خۆی کرد
کە ئەو کاتە خۆشە دەبینێ،دایکی بەدخووشی  لەو کەمتر دڵخۆش نەبوو

## 131

دەستی پێکردو قسەی بۆ باوکی کرد و گووتی :
کلیلی ئەو دۆزەخە قووڵە لە لای منە
فەرمانی پاشای ئاسمانی خاوەن هێزوتوانا، داویەتی بەمن تا بیپارێزم
قەدەغەی کردووم کە ئەو دەرگا ئەڵماسینانە بکەمەوە
جا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەر نەڕڕە هێزێك
ئەوە مەرگ ئامادەیە تیری خۆی بهاوێژێ

## 132

لەوش ناترسیٚ کە بەهێزترین گیانەوەر بیشکێنیٚ، بەڵام بۆ ناچاربم
کە فەرمانی ئەو گەورەیە جێبەجیٚ بکەم، کەوا ڕقی لەمن دەبێتەوەو
منی هاوێشتۆتە ئەو بنی بنەوەیە، بۆ ناو شەوەزەنگی تارتارووسی[1] قووڵەوە
ئەلێرەدا و لەنا ئەم کارە قێزەوەنە گیرم خواردووە
کە ئاسمان شوێنی حەقی منەو لە ئاسمان لە دایك بوویم
بۆچی لێرە لەعەزابێکی سەرمەدی دا بتلێمەوە
کە ترس و هاواری ترسناکی ئەوانەی کە من زایەندوومن
خۆراکی هەناوی خۆمم پێداوەن، لوولم بدەن

## 133

تۆ باوکمی و منت دروست کردووە و ژیانت پیٚ بەخشیوم
ئایا کەسێکی تر هەیە بۆمن تا گوێڕایەڵی بکەم؟
یا بەدوای بکەوم ، کە هەرزوو دەمباتە ناو جەهانێکی تازەوە؟
جەهانی رووناکی و خۆشی.
لەناو ئەوخوداوەندانەی کە بە شادی خۆشی دەژین
لەتەك تۆدا دلبەرانە فەرمانڕەوایەتی دەکەم
دەبم بە دەستی راستەت[2] وەك چۆن شایستەی
کچەکەت و خۆشەویستەکەتە تاهەتایە

---

1- تارتاروس، دۆزەخی خوارەوە، لەبەرامبەر ئەوەشا، تێرمێکی تر هەیە بەناوی هادیس کە دونیای بنەوەی پێدەڵێن.

2- دەستی ڕاستەت، هێمایە بۆ ئەو کەسانەی، کە چاکەکارن، لەلای ڕاستی باوک دادەنیشن

## 134

ئەوەی گوت و کلیلە شوومەکەی لە تەنگەی دەرهێنا
ئەو کلیلەی کە بووە مایەی هەموو دەردسەرییەکانی ئێمە
بەرەو لای دەرگا چوو، کلکە وەحشییەکانی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا
بە بێ دواکەوتن ئەو کلیلە زلەی، لە کێلۆنی ناو دەرگای دەرەوە سووڕاند
تەنها ئەو دەیتوانی ئەوە بکات
هیچ لەو هێزانەی دۆزەخی، ئەوەیان بۆ نەدەکرا
ئەو کاتە کلیلی لە ناو قفلدا سووڕاندو ددانەکانی چوونە ناو یەکەوە
بە ئاسانی جووت بەستە ئاسنینەکانی بە یەکپارچەیی کردەوە
دەرگا دۆزەخیەکان بە سەنگینی بە سەر کرێژنەی دەرگادا سووڕان
ئەوسا یەکسەر بە سیرە سیرێکی توندوتیژەوە بوونەوە

## 135

نەڕەیەکی هەورەتریشقە ئاسا، لە جومگەکانی دەرگاوە هەڵسا
کە لەگەڵیا قووڵترین قووڵایی خەرەندی دۆزەخ، کەوتە لەرزەوە
دەرگاکانی کردەوە بەڵام داخستنیان لە هێزی ئەو بەدەر بوون
بەناچاری دەرگاکان بە کراوەیی مانەوە
دەروازەی ئەو دەرگایە ئەوەندە پان و پۆڕ بوو
یەك لەشکری تەواوی بێبەشکراوەکان[1]، بەهەموو چەك و تفاق و ئەسپەکانیان
هەروەها بە هەمووبەیداخە پەرشوبڵاوەکانییانەوە ، دەیانتوانی بەناویا تێپەڕن

١- بێبەشکراوەکان، ئەو فریشتانەی هەڵگەڕانەوە و لە ئاسمان دەرکران و بێبەشکرا ن.

## 136

وای دەمی ئەو دەرگایە چەند فراوان بوو، وەك دەمی كورمیەكی
هەڵگیرساو
دووكەڵێكی سەخت و مەشخەڵانێكی ئاگرین هاتە دەرەوە
لەناكاو نهێنی خەرمندە قووڵەكە، لەبەرچاویان بەدیاركەوت
كە خەرمندێكی تاریك و نووتەكی بێ كەنارو سنوور بوو
بەدرێژایی و پانایی و بەرزایی و شوێن و كاتەوە هیچ نیشانەیەك نەبوو
تاریكاییەكی هێجگارتۆخ[1] وكاوس، لە ناو گەڕەلاوژەی
جەنگێكی بێ كۆتایی و فەوزادا، هەراوزەنایەكی زۆریان خوڵقاند بوو

## 137

چوار قارەمانی گەردنكەشی ڕەگەزەكانی گەرماو[2] سەرماو شێداری و
وشكی
لەوێدا لە زۆرانبازی دابوون بۆ سەروەری
زەڕاتی جەنینی خۆیان دەنارده ناو مەیدانی شەڕەوە
بە دەوری هەر تیمێكەوە، بەپێی سەنگینی چەك و سووكی چەك
رەقی و نەرمی و بەپەلە یا لەسەرخۆ، ئەو خەڵكە بە ئاپۆڕەیەكی
زۆر گەورەوە، دەورەی ئاڵای تایبەتی خۆیان دابوو

1- تاریكایی تۆخ، واتە كوێریی و تاریكی زەماوەندیان كرد و سروشت لە دایك بوو و هەراو زەنا كەوتە میانەوە، لە عەرەبییەكە- العماء – بەكارهاتووە.
2- گەرماو سەرما، لێرەدا ملتون فشە بە تیوری هەرچوار ڕەگەز دەكات، كە كەونیان دروست كردووە.

## 138

وەك زیخ وچەوی برقە[1] یا خۆڵی سووتێنەری سیرینیکا[2] لەژمارنەدەهاتن
باڵەکانی خۆیان کردبۆوەو بۆهەموو لایەك ڕایاندەکرد
تا بەشداری لە جەنگی بادا بکەن .
جا کێ زۆرینەی ئەو زەڕاتانەی بەدەوریا کۆبایەوە
ئەوە بۆساتێ دەبووە فەرمانڕەوا وکاوس یش لە میانیانا دادەنیشت
تا لێکیان کاتەوە، بەڵام بڕیارەکانی ئەو، لەو جەنگەی
کە ئەو، فەرمانڕەوایەتی لێدەکرد، جەنگەکەی توندتر دەکرد

## 139

لە تەنیشتیشیەوە داوەری باڵا هەبوو، ئەویش ڕێکەوت بوو
کە بەسەر هەموویاندا زاڵ بوو، لەو خەرەندە قووڵەدا
کە رەحمی سروشتە، یاخود لەوانەیە گۆڕەکەی بێت
کە نە دەریایێ نە کەنارێ نە هەوایێ، نە ئاگرێ، هیچی لێنەبوو
بەڵکو هەموو ئەو ڕەگەزانە هەڕەمەکیانە، تێکەڵ بە یەك بووبوون
دەبۆا بۆ تا هەتا لە جەنگدا بان، تەنها ئەگەر ئەفرێنەری توانادار
بیانکات بە مژادی سەرەتا، بۆ ئەفراندنی جەهانێکی تر

## 140

ئەهریمەنی دوودڵ و نیگەران، لەو خەرەندە وەحشیەدا
بە ئاگا لەخۆبوونەوە بەسەر لێواری دۆزەخەوە وەستا
بۆ ساتێ چاوی گێڕاو بیری لە سەفەرەکەی خۆی دەکردەوە

1- بەرقە، بیابانی نێوان میسروتونس.
2- سیرینیکا، تەرابلوسی خۆرئاوا .

خۆ ئەومیان خەرمندێکی هێندە تەنگ نیە، کە ئەو نەتوانێ لێیەوە تێپەڕێ
دەنگە دەنگی وەك نەڕڕەو کوتانەوە، ئازاری گوێچکەکانی دەدا
ئەو دەنگە دەنگە کەمتر نەبوو- ئەگەر بتوانرێ شتی گەورە بە بچووك
پێوانە بکرێ- لە هەرای ڕەشەباکانی بلۆنا[1] ی خوای شەڕ
کە ئامێرە تێکشکێنەرەکانی، بۆ وێرانکردنی پێتەختەکان
هەڵدەسووڕێنێ
بەڵکو بەرزتر لەو هەراوزەنایە بوو، کە لە ڕووخانی پەیکەری ئاسمان
هەڵدەستێ

## 141

یاخود ئەگەر ئەو ڕەگەزانە هەڵگەڕێنەوە
ئەوە ئەو زەویە چەسپاوە ڕادەبێ و لە کرێژنەوە دەردەپەڕێ
دواجارهەردوو باڵی پان و پۆڕی خۆی، هەروەك چارۆگەی کەشتی کردەوە
تیزی بە زەوی کرد، زۆر بەرزبۆوە ومەودایەکی زۆرهەڵفڕی
وەك ئەوەی بەسەر کورسی هەورەوە دانیشتبێ، بە جەسوورییەوە
بەڵام هەرزوو ئەو کورسیە وەرگەڕاو کەوتە بۆشاییەکی فراوان و گەورەوە
بەبێ ئەوەی بزانێ، بینی باڵەکانی بێهوودە کەوتوونەتە فرەفرەوە
خۆی بینییەوە کەوا بۆ ناو قووڵایی دە هەزار باڵا، دەکەوێتە خوارەوە

## 142

ئەگەر ڕێکەوت نەبوایە ، کە لە بەد ساتێکا،
هەورێکی تێکچڕژاوی توندوتیژو پڕ ئاگر هەڵیکردو بەتووندی رایدا
ئەوی بەهەمان مەودا، بۆ سەرەوە تووڕ هەڵدایەوە

---

١- بلونا، خوای شەڕ لای رۆمانییەکان.

پاشان توورِمییەکە هێور بۆوەو لە نازۆنگاوەکانی[1] سیرتا دا کوژایەوە
نە لە دەریا بوو نە لە وشکایی ، سەری لێشوا

## 143

هەنگاوی بەسەرتێکەڵەیەك لە وشکایی و ئاو هەڵدێنا
لە میانییادی رۆیی وهەڵفڕیندا بوو
وەك چۆن گرایفونی[2] باڵکراوە لە بیابان و بەرزایی کوێستانان
یا لە دۆڵی زەنەك، کە لەوێدا هەم سەوڵ و هەم چارۆکەش پێویست بوو
سەری لە دوو ئەریماسپی[3] نابوو، کە بە تەڕدەستیەوە
ئەو زێڕەی لێدزی بوو، کە ئەو پاسەوانی بۆ دەکرد

## 144

ئەهریمەن بەشەوقەوە بەسەر تەلان و زۆنگاوەکانەوە هەڵدەفڕی
بەناو تەنگەنەو گیاوگۆڵی ئاڵۆزوەوە
بەسەرو دەست و باڵ و پێکانیەوە، ڕێگەی خۆی شەق دەکرد
مەلەی دەکردو خۆی نوقم دەکرد، خۆی پیا دەکرد و دەخشی[4] و دەفڕی
دواجار هات و هاوارێکی دژوارو گوێ تەزێن وچەند ئاخاوتنێکی شپرزە
بەرزبۆوە کە لە تاریکستانی ئەشکەوتەکانەوە دەهات
لە شێوەی بەرترین هێز، هێرشیان کردە سەر گوێچکەکانی ئەهریمەن
ئەویش بەبێ ترس بەرەو لای ئەو هێزە چوو

---

١- زۆنگاوەکانی لیبیا.

2- **گرایفون**. بوونەوەرێکی ئەفسانەییە، سەروسینەی پێشەوەی، لە گەڵ باڵەکانی بازە، کلکی هی شێرە.

3- ئەریماس، دانیشتوانی باکورە ئەوروپا بوون، هەمیشە زێڕیان دەدزی و، کە گریفۆن پاسەوانی لێدەکرد،

4- دەخشی و دەفڕی، باس لەو سەختییانە دەکات کەدانتی لە چوونی بۆ مەتهەر- پاکستان- باسی لێوە دەکات .

## 145

وایزانی لە جیهانی خوارەوە، دەگا بە و هێزە یا ئەو ڕۆحە
کە لەوانەیە لەناو ئەو دەنگانەدا بژیت
تا لێی بپرسێ کە ئاخۆ کام ڕێگا، نزکترین سنووری
ئەو تاریکستانەیەو دەیگەیەنێتە ڕۆشنایی؟
لەناکاوعەرشی کوێریی[1] — کاوس — بە دیار کەوت
پەرچەمی ڕەش و پان و پۆڕی خۆی، بەسەر خەرەندی
وێرانەوە کردبۆوە و لە تەکیەوەش خوداوەندی شەو
بە کراسێکی ڕەشەوە، بەسەرعەرشەوە دانیشتووە
کە لە هەموو شتێ گەورەتر بوو
شەریکی کوێریی بوو، لە فەرمانڕەوایەتیدا

## 146

لە نزیکیانەوەش ئارکوس[2] و هادیس و دیمۆگورگورن[3] ی خاوەن لەقەبی تۆقێنەر
دوای ئەوانیش قسەڵۆك و ڕێکەوت و شڵەژان و تێکەڵبوون
یەکانگیر بوو بوون و تێکەڵی یەکتر بووبوون
لەدوای ئەوانیش تێك گیربوون بە هەزار لمووزی جۆراوجۆرەوە
ئەهریمەنی ئازایانە ڕووبەڕوویان بووەوە گووتی :

1- تا کۆتایی ئەم داستانە وشەی – کوێری- هەربەو مانایە دێتە کە لە پەراوێزەکانی پێشوودا ڕوونکراوەتەوە ،واتە کاوس.و.
2- ئاکۆس و هادیس دیموگور، خوایێ لە خواکانی دۆزەخ بوون، یەکەمیا ن رۆمانی و دووەمیان یۆنانی..
3- خوایێ لە خواکانی دۆزەخ لای رۆمانییەکان، دەڵێن هەرناوت هێنابا تۆقاندن دەهاتە ئاراوە.

ئەی رۆحەکانی[1] ئەو کارکارەیە ، کوێریی، ئەی خوداوەندی پیری شەو
نەهاتووم سیخوڕیتان بەسەرەوە بکەم
یا نهێنی سەروسامانتان ئاشکرا بکەم، یاخوخراپ دەسکاریان بکەم
.

## 147

بەڵام ڕێگەی من بۆ ناو ڕووناکی ناو ئیمبراتوریەتی ئێوەدا ڕەت دەبێ
جالەبەر ئەوەی من بە تەنهام و بێ ڕێشاندەرم، تۆزێ سەرگەردان و شڵەژاوم
ناچاربووم لێتان بپرسم، کە ئاخۆنزیکترین ڕێگا کامەیە
کە تخووبی تاریکستانی ئێوە دەگەیەنێ بە تخووبی ڕووناکی؟؟
یا بۆ هەر بەشێکی دیکەی تری مەملەکەتی ئێوە
کە پاشای ئاسمان زەفەری پێ بردووە و لەم زووانە دایبڕیوە
من بەو مەبەستەوە لەو قووڵاییەوە، بەم سەفەرەوە هەڵساوم
کەواتە ڕێگەم پێ نیشان بدەن

## 148

ئەگەر ئێوە ئەوەم بۆ بکەن، بەختێکی مەزنتان بەردەکەوێ
چونکە من ئەو کاتە، ئەو بەشە زەویە ونبووە بەدەست دێنمەوە
کە تیایا  بە غەزەب و قەهرەوە دەرکراوین
دەیگەڕێنمەوە بۆ تاریکایی یەکەم و دەیبەخشمەوە بە سوڵتانی ئێوە
(ئەوش غایەتی ئەو سەفەرەیە)
لەوێشدا بەیداخی خوداوەندی پیری شەو هەڵدەدەم
ئەوکاتەش ئێوە سوودەکەی دەدوورنەوەو میش تۆڵەی خۆم دەکەمەوە

---

1- ڕیکەوت و شڵەژان و تێکەلبوون و قسەلۆک و تێکگیربوون، ئەوانە هەموویان، هێزەکانی جیهانی ژێرەوەن..

## 149

ئیبلیس لە قسەکانی خۆی بۆوە و پیرە کاوس، بە ڕووگرژی و
برۆی تێکهەڵکێشراوی ئاوڕێکی لێدایەوە و گووتی:
ئەی غەریب من دەتناسم و دەزانم تۆ کێی
تۆ لەسەردەمێکی زوودا، ڕێبەرێك بووی لە ڕێبەری فریشتە گەورەکان
جەنگت بەسەرپاشای ئاسمان هەڵگیرساندو شکستت هێنا
من خۆم بینیم و بیستم، کە ئەو ئاپۆڕە گەورەیە بە کپی ڕاینەکرد

## 150

بەڵکو لەناو گەرمەی ئەو جەنگە تۆقێنەرەدا
یەك لەدوای یەك کەوتنە خوارەوە و یەك لەدوای یەك بەزین
ڕیزەکانیان تێکەڵ وپێکەڵ بوون و شپرزە بوون
ئینجا ملیۆنەها لە تیپی سەرکەوتووان، لە دەرگەی ئاسمانەوە هەڵڕژان
تا بەدوایان بکەون، من کە بەسەر ئەو تخووبەوە دەژیم
چەندی پێم بکرێ، داکۆکی لەو بەشە کەمە دەکەم، کە بۆمان ماوەتەوە
هێشتاکەش هەروا کەم دەبێتەوە، بەهۆی ئەوەی، کە شەڕی یەکتر دەکەین
ئەوەیە کە سۆلجانی پیرە شەوی لاواز کردووەو
گەوەری تۆ لە ژێریەوە پان و پۆڕ درێژ بۆتەوە

## 151

پاشان زەوی ئاسمان دێت، جیهانێکی تازەش بەسەرمەملەکەتی منەوە
کە بە زنجیرەیەکی[1] زێڕین بەو لایەی ئاسمانی دەبەستێتەوە
کە ئێوەی تیا ڕمان، جا ئەگەر تۆ دەچیتە ئەو جیهانە

---

1- زنجیرەی زێڕین، زەوی ئاس مان بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، ئەفسانەی یۆنانی.

ئەوە ڕێگەیەکی درێژت لە پێش نیە
مەترسی لە تۆ نزیکە، دەی بڕۆ خێراکە

## 152

لە قسە کردن وەستاو هەرماس وەڵامی نەدایەوە
بەڵکو دڵی خۆشبوو بەوەی، کە بەسەرڕۆخانەی ئەوەوە کەنارێ دەبینێ
ئیدی وەك هەرەمێك لە ئاگر، بەناو دەشتاییە وەحشیەکانەوە بازی دەدا
بەناو ڕێگەی ئەو ڕەگەزانەی کە لە جەنگدابوون و
لە هەموو لایەکەوە دەوریان دابوو، ڕێگەی خۆی کردەوە
کاتێ لە ڕێگەی بۆسفۆرەوە، بە ناو بەردە تێکچڕژاوەکاندا ڕەت دەبوو
مەترسیەکانی زیاتربوو لەوەی. کە دەوری کە شتی ئەرکون [1]یان دابوو
یا ئەوەی دەوری ئۆلیس[2] یان دابوو، کە لە دواوەی کەشتیەکەدا بوو
لەو کاتەی لە تەنگەنەی کاریبدیسدا
ڕێگە دوورەکەی هەڵبژارد بەرەو گێژەنەکەیتر چوو

## 153

ئابەمجۆرە ئەهریمەن بە سەخت و دژواری کەوتە ڕێگاوە
تووشی ڕەنج و ماندووبوونێکی زۆرهات، بەڵام هەرزوو
بەرەو ئەو شوێنەدا چوو، کە پاشان مرۆڤ دابەزی بووە ئەوێکەوە
بەڵام گۆڕانێکی سەرسام ئامێز لە ئارادابوو
چونکە گوناە و مەرگ، بە خواستی ئاسمان شوێنی کەوتبوون
تا لە دوای ئەودا، ڕێگایەکی پان و پۆڕو خۆشکراو بکەنەوە

1- ئەرکون، ئەو کەشتییەی ئەرکۆ دروستی کرد، بۆ هێنانەوەی فەروەی زێڕ، بە سەرۆکایەتی جاسۆن.

2- ئۆلیس، پاڵەوانی ئودیسە، تووشی مەترسی هات دوای شەڕی تەروادە، لە ڕێگەی گەڕانەوەی بۆ نیشتیمان.

بەسەر ئەو خەرمندە تاریکەی، کە ئاوی ناو کەنداوەکەی دەکولاَ
ناچار بوو بەرگەی گرانایی، ئەو پردە دووروودرێژو سەیروسەمەرەیە بگرێ
کە لە دۆزەخەوەڕا درێژ دەبۆوە، تا فەلەکی فەلەکانی، ئەو جیهانە[1] لەڕو
رزیوەدا
کە زۆر ئاسان ئەو ڕۆحە هەڵگەڕاوانەی، بەسەردا تێدەپەڕن و دێن و دەچن
جا چ بۆ فریودانی خاکنشینان بێت، یا بۆ سزادانیان
جگە لە وانەی کە بەر بایەخی تایبەتی خوداو فریشتەکان دەکەون

## 154

دواجار کاریگەرێتی پیرۆزی نوور،لە دیوارەکانی ئاسماندا بەدیار دەکەوێ
سپێدە دەمێکی درەوشاوە ئاشکرا بوو، ئەو درەوشانەوەیە
ئاودیوی دڵی تاریکستانی شەو دەبوو
ئەوەشیان سەرەتای تخووبی یەکەمی سروشت بوو
هەر لێرەوەشە کە – کوێریی – دەوەستێ و پاشەکشە دەکات
وەك پاشەکشێی غەنیمێکی بەزیو و دۆڕاو زمانی لە گۆ دەکەوێ

## 155

ئێستاکێ ئەهریمەن، هیچ سەخت و ناخۆشییەك نابینێ
بەڵکو بۆ ئەو ئاسان بوو، کە لە پرتەوی نووری نیوە ڕەنگدا
وەك کەشتییەکی بەر تۆفان کەوتووی چارۆکە دڕاو
کە بە بەندەر دڵی خۆش بێ، ئاوابوو
بەسەر شەپۆلە نەرم و گونجاوەکاندا هەڵخزێ
یاخود لە بۆشایی ئەو فەزایەدا بفڕێ، کە لە هەوا دەچوو
باڵەکانی هاوسەنگ دەبن و لەسەرخۆ لە دوور دوورەوە

1- جیهانی رزیو و تەپیو ، مەستی زەوییە.

فیردەوسی ئاسمان دەبینێ ، زۆر زۆر فراوان، لە ناو بازنەیەك
یا لە ناو چوارگۆشەیەك، یاخود لە سووڕانەوەیەکی بێسنووردا هەڵدەکشا
.

## 156

ئەو بازنەیە، تژی لە بورجی دوڕڕی پالاوتە و ئەو قەلایانەی[1]
کە بە یاقووتی شینی پڕ لە ژیان رازابۆوەو
ڕۆژێ لە ڕۆژان هەوارگەو جێنشینی وی بوو
لە نزیکی ئەوێکەوە بوو، کە دونیای بەرەو ژوورهەڵواسراوی ئێمە
وەك ئەستێرەیەك لە کەناری مانگدا
بە زنجیرێکی زێڕین بە ئاسمانەوە شەتەك درابوو
پاشان ئەهریمەنی نەفرەت لێکراو، لە کاتێکی شووم ونەفرەت لێکراودا
بە دڵێکی پڕ لە نیەتی خراپەکاری و تۆڵە سەندنەوە
بەشڵەژاوی دەست بە کار بوو.

---

هەندێ روونکردنەوە سەبارەت بە هەندێ وشەو ناوی ناو ئەم بەشە:
- گریفۆن لەزۆرجێگای ئەو داستانەدا هاتووە، بریتییە لە ئاژەڵێك، کە نیوەی سەرەوەی وەك هەڵۆیە، نیوەی ژێرەوەی وەك شێرە، بۆیە لە گەڵ قەقنەس جیاوازە، هەروەها ئەو هۆزەی کە دزی زێڕیان لە گریفۆن کرد، هۆزێکن یەك

---

١- میتۆلۆژیاکە دەڵێت: ئەو قەڵایە بریتییە لە ئورشەلیمی پیرۆز، کە لە لایەن ئەبدئیل هوە هاتۆتە خوارەوە، بۆ زەوی، ئەوەشیان لە خەونی یۆحنای لاهووتییەوە هاتووە،١٨-٢١ ، بناغەی دووەمی لە یاقووتی شینە، بەڵام بە مانای پڕ ژیان بەوە دێت، کە ئەو شارە لە وێنەی یەکەمی خۆی دانەبڕاوە، بەڵکو وەکو خۆی هاتۆتە خوارەوە، لەوەشیان هێمایە بۆ سیفری دەرچوون،٢٠- ٢٥ ، زەیوس لە ئەلیادەدا دەڵێت، ئەو لە هەموو خوداکان بەهێزترە، بە بەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر زنجیرێك لە ئاسماندا بلەرێتەوە، دەتوانێ هەموو خوداکان و زەوی و دەریا هەڵگرێت، بەسەر ئولیمپی بلەرێنێتەوە ٨-١٨ ، ملتون ڕاڤەیەك بۆ ئەو زنجیرەیە دەکات بەوەی کە گونجانێکی جیهانی و یەکبوونێکی شیرینە، لە میانی هەموو شتەکاندا، کە فیتاگۆرس ئەندێشەی کردووە،

چاویان هەیە، لە خوارووی رووسیای ئێستا دەژین، گریفۆن وەك دێوەزمەیەك یا حەزیایەك پاسەوانی لەو زێڕە دەكرد، ئەوە لە میتۆلۆژیای جەرمەنی و یۆنانیدا هاتووە.

- دیمۆگورگور یا گورگور، ئەهریمەنی دونیای ژێرەوەیە، كە بە ئالۆزی دەوردراوە، لە ئەدەبی لاتینی دوای مەسیح و پاشان دواە چەرخی نەهزەدا هاتووە، هەروەها سبنسەر لە شاژنی جندا باسی كردووە، ئەو پەیوەستی بە كوێری یاخود كاوس داوە.

- كەشتی ئارجو، لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا، یەكەم كەشتییە كە زەریای بڕیوە و جاسانی تیا بووە، لە یۆنانەوە هاتووە تا بوسفور و فەروەی زێڕینییان هەڵگرتووە، دەبوایە بە میانی دوو بەرد دا تێبپەڕن، كە هەمیشە لە جووڵاندابوون و بەیەك دەكەوتن، هۆمیرۆس لە ئۆدیسادا دەڵێت:ئۆدیسۆس بە گوێی ئامۆژگارییەكانی — كیركی - بكەو خۆت لە بەردی خاریبدیس بپارێزە.چونكە هەموو بەردێك گێژەنی خۆی هەیە قووتت دەدات، جا ئەوێش دەوو بەردی هەبوو و هەریەكەو گێژەنی خۆی هەبووە، واتە بەردەكانی گێژەنی فەوتێنەری بەدەورەوە بوو.

## 1

سڵاوئەی ڕۆشنایی پیرۆز، ئەی نۆبەرەی ئاسمان[١]،
ئایا بۆم هەیە بێ ئەوەی لۆمەم بکەن بڵێم:
ئەی تیشکی ئەزەلی بەشداربووی ئەزەل؟
مادامەکێ خودا ڕووناهیەو لە ناو ڕۆشناییەکدا دەژیت
هیچ ڕۆشناییەکیش نایگاتێ

## 2

هەر لە ئەزەلەوە لەودا دەژیت، ئەویش لە تۆدا دەژیت
ئەی پایەبەرزی درەوشاوەی، جەوهەری درەوشانەومێ
کە هێشتا نەهاتۆتە بوون، یا دەتەوێ بە ناوێکی ترەوە بانگت بکەم؟
ئەی ڕووباری ئەثیری پاڵاوتە، کە هیچکەس بە سەرچاوەکەی نازانی
تۆ بەر لە خۆرەتاو و ئاسمانەکان، هاتوویتە بوونەوە

## 3

کە دەنگی ئاسمان وەک باڵاپۆشێ
جیهانی ڕابووی لە تاریکی و ئاو و خەرەنددا پێچایەوە
کە لە وێرانی و نەبوون[٢] و هەیولای بێکۆتاییەوە هاتۆتە کایەوە
ئەمڕۆکە من بە پەڕوباڵێکی جەسوورانە ترەوە بۆ
لە دەریاچەی دۆزەخ ڕامکردووەو بۆ لای تۆ دێمەوە
دوای ئەوەی کە ماوەیەکی زۆر، لەو تارکستانەدا مامەوە

---

1- نۆبەرەی ئاسمان، لەسیفری تەکوین1:3 دا هاتووە، یەکەمین ئەفرێنراو ڕۆشناییە.
2- وێرانی و نەبوون، لە سیفری تەکوین1:4 دا هاتووە، کە زەوی چۆل و وێرانەبوو.

## 4

من لە فڕینمدا بەناو تەبەقەی ناوەندو[١]،
ئەو تەبەقە تاریکییەی کە دەوری دابووم
گۆرانی وام دەچڕی، جیاوازبوو لەوەی ئورفیوس[٢] دەیچڕی
لە بارەی کاوس[٣] و شەوی سەرمەدی قسەم کردووە

## 5

خوداوەندی شیعربوو منی فێر کرد
کە چۆن خۆم لە مەترسی دابەزین
لە خەرەندی نادیاردا بدەم و پاشان سەرهەڵگەڕێم و
بە هەمان ئەو دژواییەوە، بفڕمەوە
ئەمڕۆکە بە سەلامەتی بۆلای تۆ دێمەوە

## 6

هەست بە پرتەوی بە تواناو بڕستبەخشی تۆ دەکەم
بەڵام تۆ هەرگیز نایەیتە دیداری ئەو چاوانەی منەوە
کە بەناو چاودانمەوە هەڵدەسووڕێن و هەرگیزسپێدە نابینن[٤]
بە تاسووقی تیشکی مەزنی تۆوە، لە گەڕان و سووڕاندان

---

1- تەبەقەی ناوەند، هێمایە بۆ دووجۆر تاریکی، واتە دۆزەخ و کوێری یا کاوس.

2- ئورفیۆس ویستی لە ڕێگەی موزیکەوە، ژنەکەی لە دونیای ژێرەوە رزگار بکات، بەڵام نەیتوانی.

3- کاوس بە مانای کوێریی دێت، گوزارشتە لەوەی کە دونیا هەمووی تاریکی بووە، دەقە عەرەبییەکە وشەی – العماء – بەکار هێناوە، فارسییەکە وشەی پەریشانی بەکار هێناوە. – و.–

4- سپێدە نابینین، ملتون لە1652 بە یەکجاری چاوی کوێر بوو، لێرە لەگەڵ راویدا دەبن بەیەک،

## 7

نەخۆشیەکی گران سەردانی ئەو چاوانەی منی کردووە
گەردوونیان داپۆشیوەو ئاوی ڕەش پێشی گرتوون
بەڵام ئەوانە هیچیان، ناتونن ڕێگەم لێ بگرن
لەوەی کە لە گەڵ خوداوەندی شیعردا
بە ناوکانیاوە ڕوون و درەختە پڕ گەڵاکاندا
یاخود بە ناو ئەو گردۆلکە پڕشنگدارانەوە پیاسە بکەم
کە بە ئەڤینی سروودە پیرۆزەکانەوە، شێت و شەیدا بووینە

## 8

بەتایبەتی تۆ ئەی کێوی سەهیۆن[١]
ئەو ئەو جۆگەلە پڕ گوڵانەی کە لە دامێنتەوە هەڵدەڕژێن و
قاچە پیرۆزەکانت دەشۆنەوە و بەستەو ئاوازەکانی خۆیان هەڵدەپڕژێنن
زۆرجاران کە بە شەو دێمە دیدەنتەوە
ئەو دووشاعیرەم بیردێنەوە، کە بەشداری قەدەری منیان کردووە
هیوادارم منیش، بەشداری ناوبانگیان بکەم

## 9

تامیریس[٢] کوێرو مینیدیس کوێر
هەروەها هەردوو پەیوار بینە کەونارەکان، تیریسیاس[٣] و فینۆس[٤]
خۆراکی من ئەو ئەندێشانەن
کە شیعری کێش و سەرواداریان لێوە، لە دایك دەبێ

1- سەهیون، ئەو کێوەی کە موسا، لەوێوە پەیامەکانی لە خوادا وەردەگرت.
2- تامیریس ، لە ئەلیادەدا هاتووە، کە خوداوەندی خواکانی شیعر بووە، بەڵام دوایی بەسەریا زاڵ دەبن و چاوی خۆی لەو سەرکێشییە لە دەست دا، مینوس یا مینیدس، دەڵێن هۆمیرۆس خۆیەتی، شاعیرێکی تراقی یە.
3- تیریسیاس ، حەکیم و عەڕڕافی شانۆگەریی ئۆدیب پاشاو و ئەنتیگونەی سوفوکلیس بووە.
4- فینۆس پاشایەکی کوێری تراکی بووە هێزی پێشبینی کردنی هەبوو.

وەکو ئەو بولبلەی لە تاریکیدا گۆرانی دەڵێت و
تا درەنگەشەوان لەناو قەدوگەڵای تێکئاڵۆزاودا دەمێنێتەوە و
هاواری شەوانەی خۆی سەردەداو دەناڵێنێ

## 10

ئا بەمجۆرە بەدرێژایی ساڵ، وەرزەکان، بەدوای یەکترەوە دێن و دەڕۆن
بەڵام هەرگیز، ڕوونایی ڕۆژ بۆ من نایەت
یاخود حەزدەکەم ئەوە بزانم
جوانی نزیك بوونەوەی شەو یاخود سپێدە، چۆنە؟
ئاخۆ دیمەنی گوڵی بەهارو گوڵی سووری هاوینان چۆنە؟
یا مێگەلی مەڕان و ئاژەڵان، یا روخساری مرۆڤی پیرۆز چۆنە؟

## 11

کەچی هەورو تاریکی سەرمەدی دایانپۆشیوم و ڕێگەم گیراوە
نە ژیانی خۆشی مرۆڤەکان دەبینم، نە کتێبی درەوشاوەو[1] تاقانەی زانین
هەرئەوەش نا، لە هەموو شوێنێکەوە تووشی سستی و خاوبوونەوە دێم
جوانییەکانی سروشت شاردراونەتەوەو و نەماون
هەموو ڕێگاکانی حیکمەت[2] داخراون

## 12

بریا ئەی ڕووناکی ئاسمان، لەناو گیانما زۆرتر دەبووی
مێشکت دادەگیرساندم و بەهەرەت ڕووناك دەکردمەوە
چاوێکی ترت پێ دەبەخشیم

1–کتێبی درەوشاوە، ئەوە کتێبی سروشتە.
2– هێمایە بۆ سروشت، کە تاکە ڕێگەی حیکمەتە.

تەمتوومانت دەرەواندەوە پەرش و بڵاوت دەكردەوە
تا ئەو شتانە ببینم و باس بكەم، كە چاوی مرۆڤدا نایانبینێ

## 13

ئێستیاكێ باوك لە ئاسمانی پاك، بەسەر كورسییەوە دانیشتووە
عەرشی لە هەمووان بەرزترە، تەماشای ئەوە دەكات
كە چێكردووە خەڵقەندەكانی چیدەكەن
فریشتەكانی ئاسمان دەوریان داوە و جمەیان دێت
وەك ئەوەی ئەستێرەكان لە پرشنگی ئەودا شادی بخۆنەوە
كە زمان توانای گۆكردنیانی نییە

## 14

لەلای ڕاستییەوە وێنەیەكی درەوشاوەی بەرزی ئەو هەیە
كوڕە تاقانەكەی دانیشتووە
یەكەمجار لەسەرزەویدا، دایباوانی سەرەتاو كەڤناری ئێمەی بینی
جگە لەوان هێشتا هیچ بەشەرێ بوونی لەزەوی نەبوو
لەفیردەوسی بەختەوەریدا دەژیان ومیوەی جاویدانییان دەخوارد
میوەی خۆشی و خۆشەویستی و بەختەوەری

## 15

خۆشیەك كەهەرگیز نابڕێتەوەو خۆشەویستیەكیش نموونەی نیە
لە ناو گۆشەگیریەكی پیرۆزدا
ئەوسا چاوی بە دۆزەخ و خەرەندی خوارەوە گێڕا
لەوێدا ئەهریمەن دادەبەزییە سەر دیوارەكانی ئاسمان
لەبەری تاریكییەوە بە ناو هەوای تاروتیرەدا لەشەققەی باڵیدا

## 16

خۆی ئامادە کرد تا بە باڵی شەکەت و قاچی ئامادەی
هێرش بکاتە سەر لایە ئاشکراکەی جیهانەوە
کە وەك زەوییەکی ڕەق و دووردەستەو شاراوەی بێ ئاسمان
بۆ وی بەدیار کەوت

## 17

دڵنیا نەبوو لەوەی کەزەویەکە  لە ئاوە یا لە هەوا
کە ئەفرێنەر بەسەر عەرشی بەرزییەوە ئەوی بینی
چونکە خۆی  ڕابردوو و ئێستاو ئایندەی لێ ڕوون بوو
ئاوڕی لە تاقانەی خۆی دایەوەو گووتی:
ئەی تاقانەم، ئایا دەبینی تووڕەیی چی لە غەنیمی ئێمە کردووە؟
کە نە دیوارەکانی دۆزەخ، نە ئاسن و زنجیرەکانی
نە خەرەندە قووڵەکان، بە گەورەیی خۆیان، نەیانتوانیوە پەلبەستی بکەن

## 18

بۆیە بڕیاری داوە، بە توندی تۆڵەی خۆی بکاتەوە
خۆی تووشە دۆخێکی زۆر گران دەکات
ئێستاکە لە هەموو کۆت و پێوەندێ ڕزگاری بووە
بەمزوانە لە نزیك ئاسماندا و لە هەرێمی نووردا هەڵدەفرێ
یەکسەر بەرەو دونیای ئەفرێنراوە تازەکان دەچێ

## 19

هەوڵ دەدا تاقی بکاتەوە، ئەگەربە توندو تیژی بێت، ئەوە وێرانی دەکات
یاخود لەوەش خراپتری دەکات
خۆ ئەگەر بەفرۆفێڵی دروزنانەش بێت، ئەوە هەموویان گەندەڵ دەکات
ئیدی گوێ لە درۆودەڵەسەکانی دەگرن و
بەئاسانی ڕاسپاردە تەنهاکە[1] پشتگوێ دەخەن
کەتاکە پەیمانە کە دەبێ گوێڕایەڵی بن

## 20

ئا بەمجۆرە بە ناچار، خۆی وئەوانەی فریودراون دەڕمێن و دەکەون
جا ئەوە گوناهی گەورەی کێیە؟ جگە لەو، گوناهی کێیە؟
وای بۆ ئەو کەسەی کە وەڵامی چاکە بە خراپە دەداتەوە

## 21

هەمووئەو شتانەم پێ بەخشی، کە دەیتوانێ هەڵیگرێت
تەواوی دادو ڕاستڕۆیی، کە بەس بێت بۆئازادی سەرکەوتن و کەوتنی
هەروەها هێزو ڕۆحیشم خوڵقاندووە
تیایانا خۆی ڕادەگرێ و هەشیانە بەهەموو ئیرادەی خۆیانەوە ڕماون
ئەوەی کە خۆی کۆڵی نەدا[2]، ئەوە کۆڵی نەدا
ئەوەیش کە ڕما ئەوە داڕما

---

1- ڕاسپاردە تەنهاکە، وەسیەتێکە بۆ ئادەم و حەوا، کە نابێ لەدرەختی مەعریفەی خێرو شەڕ بخۆن.

2- ئەوەی کۆڵی نەدا، ئەوە کورتەی بیروڕای ملتون ە بۆ ئازادی ئیرادە.

## 22

جا ئەگەر ئەوانە ئازاد نەبن، چۆن بەڕاستی لایەنگیریی ڕاستەقینەی خۆیان
یا چۆن باوەڕی چەسپاو و خۆشەویستی سافی خۆیان دەسەلمێنن؟
نەك بەوەی کە حەزیان لێیە؟ .
ئایا وابە دیار ناکەوێ، کە ئەوە کاری ناچارکراو و بێ دەسەسەڵاتەکانە
یا کاری ئەوانەی کە گوێڕایەڵ وهەڵبژێردراو بوون؟

## 23

جا چ چاکە و پاداشتێکیان بۆدەمێنێتەوە
یا چ چێژێ لەو گوێڕایەڵیە وەردەگرم و هەست بە چ خۆشییەك بکەم؟
کە ویست و ئەقڵ بێهوودەو بێ سوود بێ ( کە ئەقڵیش سەر پشکە)
ئەوەش بێهوودەییەکی بێسوودە
ئەوانە ئەگەر ئازادیان لێ زەوت بکرێ
ئەوە ویست و ئەقڵ خراپ دەبن
ئەو کاتە خزمەتی زەرورەت دەکەن، نەك گوێڕایەڵی من

## 24

ئەوانە بەحەق ئەفرێنراون، ڕەوا نیە ئەفرێنەری خۆیان و
ئەفراندنی خۆیان وقەدەری خۆیان تاوانباربکەن
دەڵێن کە ئەوان بە دەست خۆیان نەبووە و
جەبریەت ویستی ئەوانی ناچار کردووە
بەناچاری خۆیان ڕێگەی هەڵگەڕانەوەیان هەڵبژاردووە

## 25

نەك من وام خواستبێ، ئەگەر نا ئەوە ڕووبەڕوو دیارە
کە چ دەبوو، ئەو پێشزانینە هیچ کاریگەرییەکی نابێت
بەسەر ئەو گوناهانەی کە دەیکەن، هەرچەندە من پێشتر دەمزانی
لە پێشڕازانین ئەوانی ڕانەداوە، تا تاوانی خۆیان ئەنجام بدەن
ئەوان ئەنجامیان داوە، هەرچەند کەس پێی نەزانیوە

## 26

ئابەمجۆرە بەبێ هیچ هۆکارێ یا سێبەری قەدەرێ
بەبێ کاریگەری پێشبینییەکانی من، کە نە دەگۆڕێ و نە وەردەچەرخێ
ئەوان گوناه  دەکەن، چونکە ئەوان خاوەنی ڕای خۆیانن
ئازادن لە بڕیارەکانی خۆیان و لە هەڵبژاردنی ئەوەی خۆیان دەیبینن
من ئەوانم ئازاد خوڵقاندووە و بە ئازادیش دەمێننەوە
هەتا ئەو کاتەی بە خۆیان، خۆیان دەکەن بە کۆیلە

## 27

خۆ ئەگەر وانەبێت، ئەوە دەبێ من سروشتی ئەوانە بگۆڕم و
ئەو مەشیئەتە بەرزو ئەزەلی و نەگۆڕە بگۆڕم
کە ئەوانی بە ئازادی دەوێ
کەواتە ئەوە مرۆڤ هەر خۆیەتی و بە کەیفی خۆی
بە ڕێگەی گوناه وداڕماندا دەڕوات

## 28

یەکەمینی ئەو گوناهکارانە[1]، لەبەر وەسوەسەو خۆپەرستی خۆیان دارمان
بەڵام مرۆڤ بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ، بەدەستی ئەو گوناهکارانەی
یەکەم، بەرێگەی گوناهدا رۆیشتن
ئابەمجۆرە مرۆڤ لێبوردەیی بۆ دەبێ و خۆشی لێدەبینێ
بەڵام ئەوانی ترن کە بێبەشی دەکەن لەو بەخششە
من بەزەیی و دادپەروەری خۆم لە زەوی و لە ئاسماندا بڵاو دەکەمەوە ، هەربەو
بەزەیی دادپەروەریەشەوەیە
جیلوەو جەلالی من، بەسەر هەموو شتێکا بەرزدەبێتەوە
بەڵام بەزەیی من پێش دادپەروەی من کەوت
ڕووناکیەکەشی بەسەر هەموو شتێکا زاڵ دەبێ

## 29

لە کاتێ ئاخاوتنی ئاسمان، بۆن و بەرامەی جاویدانی
بە سەرتاسەری ئاسماندا بڵاوبۆوە، خۆشی و شادییەکی تازەو بێسنووری
شەڵاڵی رۆحە پیرۆزو هەڵبژێردراوەکان کرد
ڕۆحێ لە پاکی کە هەرگیز وەسف ناکرێت
بەڵام تاقانەی ئاسمان کە نموونەی نییە
لەهەموو بەرزییەك بەرزتر بوو، خودانی جیلوەی ئاسمانی بوو
بەزەیی پیرۆزی درەوشایەوە وکەوتە بەر دید
کە دەستی بە ئاخاوتن کرد لەگەڵ ئاسمان

## 30

خۆشەویستیی بێسنوور و ڕوون و ڕەوانی ڕەها هەڵڕژاو گووتی
ئەی ئاسمان، ئەو ئاخاوتنەی کە گوتاری پاشایەتیت پێیەوە کۆتا پێهێنا

1- یەکەمین گوناهکار، مەبەستی ئەهریمەنە.

چەند بەرزو پیرۆز بوو
بەوەی کە دیارە مرۆڤ بەختی ئەوەی هەیە ببەخشرێت
ئەوش وادەکات کە ئاسمان و زەوی، بەدەنگیَ کە هەرگیز لە ژمار نەیەت
بەستەو سروودی پیرۆزت بۆ بنێرن، بتپەرستن و سوپاست بکەن

## 31

دەوری عەرشی تۆ دەدەن و دەنگ دەداتەو، بۆ ئەبەد پیرۆزت دەکەن
ئایا دەبێ مرۆڤیَ، ئەو مرۆڤەی کە ئەفرێنراوی تۆیە
تاوەکو ئەمڕۆکەش، لە وێنەی جوانترین تاقانەی تۆدا
ئاوا جێگەی خۆشەویستی تۆ بووە
ببێتە قوربانی فریودان فڕوفێڵی دوژمن و لە پێ بکەویَ؟
هەتا ئەگەر گەلۆریەکەشی یارمەتی دابێت؟

## 32

ئەوە دوورە لە تۆ، زۆر دوور باوکە، تۆ داوەری هەموو ئەو شتانەی
کە ئەفراندووتە، داوەریی تۆش، هەرگیز هەڵە ناکات
ئایا بەمجۆرە دوژمن، مەبەستی خۆی بەدیدەهێنیَ؟
ئایا چەپەڵی خۆی بەدیهێناو چاکەش بە فیڕۆ چوو؟
ئایا ئەهریمەن لەو کاتەی کە تۆڵەی خۆی دەکاتەوە
بەشانازی نازوفیزەوە، هەرچەندە کە ئامانج و نیەتێکی چەپەڵی هەبوو
بۆلای کەسانی خۆی دەگەڕێتەوە؟ تەواوی نەوەکانی مرۆڤیش
بەدوای خۆی دا بۆ دۆزەخ پەلکێش دەکات
دوای ئەوەی کە هەموویانی گەندەڵ کرد؟

## 33

یاخود دەتەوێ لە پێناویا، ئەفرێنراوی خۆت، لەناو بەریت؟
ئەوە تەفرو تونا کەیت، کە بۆ شانازی خۆتْ ئەفراندووتە؟
ئەو کاتە چاکەو مەزنی تۆ، هەردووکیان بە ئاسانی دەبنە جێ ئامانجی ئەوان
ئەوسا بەدوای رێگایەکی دژواردا دەگەڕێن، بۆ ئەوەی داکۆکی لە خۆیان بکەن
ئاسمانی بەرز وەڵامی دایەوە:
ڕۆڵەی خۆم، ئەی ئەوەی دەروونم پێی خۆش دەبێت، تۆ ڕۆڵەی نزیکی منی
کە نوێنەرایەتی قسەو حیکمەت و هێزی کاریگەری من دەکەیت
هەموو ئەوانەی گوتت لە بیرۆکەی من دەچێ
هەموویان لەگەڵ ئەو بڕیارانەی
کە ویستی ئەبەدی من دەریکردووە ، یەك دەگرنەوە

## 34

مرۆڤ بە یەکجاری لەناو ناچێت
هەرکەسێ ڕزگاری بوێت، ڕێگەی ڕزگاری دەدۆزێتەوە
با بەویستی خۆشی نەبێ ، بەڵکو بە لێبوردەیی من
ئازادیم پێداوە و دووبارە هێزی ڕووخاوی بۆ دەگەڕێنمەوە
هەرچەندە کە ئەو پشتگوێی خست و بوو بە کۆیلەی گوناە
بۆتە دیلی حەزە چەپەڵ و بەدخووەکانی
یارمەتی دەدەم هەتا دەکەوێتەوە سەر پێیەکانی و
لە دژی دوژمنە دڕندەکە دەوەستێتەوە
یارمەتی دەدەم، تا هەست بە لاوازی خۆی بکات
تا بۆ رزگاری خۆی قەرداری من بێت، نەك کەسێکی تر جگە لە من

## 35

هەندێکیانم هەڵبژاردووەو نیعمەتێکی تایبەتیم  پێبەخشیون
هەندێکیانم لەوانی تر پێ باشتر بووە، ئەوە ویستی منە
ئەوانەی ترکە گوێیان لێمەو بانگیان دەکەم و
گوناه بکەن، ئاگاداریان دەکەمەوە
بۆ ئەوەی بەخێرایی داوای لێبوردن لە من بکەن
تووڕەیی من دامرکێننەوەو رازی بکەن
من دەمەوێ تاریکایی هەستەکانیان نەهێڵم

## 36

بۆ ئەوەی دڵی بەردیان نەرم بکەم و پەشیمان ببنەوە وگوێڕایەڵ بن
ئەگەر ئەوە بە نیەتێکی پاك ئەنجامدرا
هەلبەت منیش لەبەرامبەر ئەوەدا چاووگۆیم  داناخەم
ئیدی حوکمی خۆم وەك ویژدان، دەکەم بە رێبەری ناو سینەیان
ویژدانیش داوەرێکی یەکلاکەرەوەیە
ئەگەر گوێیان لێڕاگرت، ئەوە نوور لە دوای نووریان بۆ دەبێ
ئیتر تا کۆتایی  بڕەدەکەن و دەگەن بە دەشتایی رزگاربوون
بەڵام ئەوانەی سەبرو ئارامی درێژخایەنی من و
بریسکەی بەخششی من بەهەند هەڵناگرن و سووك سەیری دەکەن
ئەوانە هەرگیز بەهرەمەند نابن لەوەدا

## 37

ئیدی ئەوەی دڵی ڕەقە، دڵ ڕەقتر دەبێت و ئەوەی کۆێرە کوێرتر دەبێت
زیاتر ڕوودەچێتە ناو شپرزەو شێوانی خۆی و دەکەوێتە ناو قووڵایی
دژوارەوە، هەر تەنها ئەوانەشن، لە بەزەیی من بێبەش دەبن

ئەوە هەموو شتێ نییە، مرۆڤ ئاسێ دەبێت و نارەوایی دەكات
لەپەیمانی خۆی پەشیمان دەبێتەوەو
لەدژی دەسەلاتی بالا ی ئاسمان تاوان دەكات
تەما لە خوداوەندێتی دەكات و هەموو شتێكی لەدەست دەچێ
هیچی بۆ نامێنێتەوە، تا قەرەبووی خیانەتی خۆی بكاو پەشیمان بێتەوە
دەبێ خۆی و هەموو نەوەكانی. نابوود بن و لە ناو بچن
یا دەبێ تەفروتوونا بێت، یا دادپەروەری. تەفروتوونا دەبێت

## 38

تەنها ئەگەر باتیەك بدا بەدەستەوە، توانای هەبێ و ئارەزووی لێبێ
باری گرانی ئەو فیدا بوونە بخاتە سەرشانییەوە
ئەوباتیەش مەرگە لە بەرامبەر مەرگە
جا ئەی هێزەكانی ئاسمان وەرن بۆم باس بكەن
ئێمە لە كوێ ئەو هەموو خۆشەویستییە دەدۆزینەوە؟
ئایا كەسێ لە ئێوە هەیە قبوڵی لە ناوچوونی خۆی بكات
تا خۆی بكاتە فیدای تاوانی كوشندەو مردندەی مرۆڤ؟
ئایا دادپەروەرییەك هەیە زاڵمێ رزگار بكات؟
ئایا لە ناو خەڵكی ئاسماندا، خۆشەویستی و بەزەیی ئاوا ئەوە هەیە؟

## 39

پرسیارەكە كراو تاقمی ئاسمان، زمانیان گیراو ئاسمان كپ هەڵگەڕا ،
كەسێ نەهاتە پێشەوە، بۆ داكۆكی كردن و یارمەتیدانی مرۆڤ
كەسێ زاتی نەكرد خۆی ببەخشێ بە مەرگ و فیداكاری بكات
واتە بە دۆڕان خۆی تووشی فەوتان بكات

هەروا بوو، چونکە مرۆڤ هەمیشە، بێبەش بووە لە کڕینەوەی گوناهی خۆی
لەوانەبوو ون بێ، ئەگەرحوکمی مەرگ و دۆزەخیان بەسەرا دابێت
قەزاوەتێکی سەخت بوو، ئەگەرلەوکاتەدا تاقانەی خودا هەڵنەسابایەوە
ئەو تاقانەیەی،کە تەواوی ئیشق و خۆشەویستی، لە گیانیا دەژیت

# 40

هەڵسایەوەو گوتی :
تۆ قسەی خۆت کرد، چارەیەك نییە، مرۆڤ ڕێی نیعمەت دەدۆزێتەوە
نیعمەتەکانی تۆ هەرگیز رێگەی خۆیان ون ناکەن ، زۆر خێران
بێ پێشەکی و بێ پاڕانەوەو بێ هەوڵ، دەگەن بە هەموو بوونەوەرێك
وای مرۆڤ چەند دڵخۆشە بەو گەیشتنە
بەڵام ئەگەر بەخۆی و هەموو گوناهەکانی بمرێت و ون ببێ
چۆن داوای لێبوردن و بەهاناهاتنەوەی بکات؟
نە قوربانی دادی دەدات، نە کەفارەت
ئێستا ئەوە منم ئامادەم تا خۆم بکەمە قوربانی و
ژیانی ئەو بە ژیانی خۆم بکڕمەوە

# 41

تووڕەیی خۆت بەسەرمندا هەڵڕێژە، بە مرۆڤم دابنێ
بە خاتری ئەشقی ئەو من باوەشی تۆ جێدەهێڵم
بۆ مرڤ خۆبەخشانە، خۆم لەو شانازییانە بێبەش دەکەم
کە تۆ بە منت بەخشیوە و بە رەزایەتی خۆم دەمرم
لێگەڕێ با مەرگ، هەموو رق و قینی خۆی بەسەرمندا هەڵبڕێژێ
چونکە من لە ژێر هێزی تاریکیدا، ئەوەندەم پێناچێ
چونکە تۆ ژیانی جاویدانیت بەخشیوە بە من و بە تۆوە دەژیم

هەرچەندە من خۆم بە دەستی مەرگەوە دەدەم، ئێستاکە قەرزاری ئەوم
ڕەنگە هەموو شتێك، کە لە مندا هەبێت بمرێت
دوای ئەوەی کە ئەو قەردە دەدەمەوە ڕەنگە هەموو شتێ کە لەمندا بێت بمرێت
خۆ تۆ لە نێو ئەو گۆڕە قێزەونەدا، وەك نێچیرێك بۆ ئەو، بەجێم ناهێڵیت؟
هەروەها لێناگەڕێی ئەو دەروونەی من کە پاك و بێگەردە
هەتاهەتایێ لە گەندەڵیدا بژیت

## 42

ئیدی وەك سەرکەوتوو هەڵدەستمەوەو
ئەوە مەرگە دەخەمە ژێر دەستم، کە بەسەرما زاڵ بوو
ئەوەشی لێ زەوت دەکەم، کە زەوتی کردووە
بەمجۆرە مەرگ زەربەیەکی مەرگهێن دەخوات، بە سەرشۆڕییەوە چەك دادەنێ
ئەوسا بە نێو ئەو فەزایە بەرین و بەرفرەیەدا، وەك سەرکەوتوو دەسووڕێمەوە
لە چاوی دۆزەخ، لە دیلەکانی دۆزەخ ڕزگار دەکەم
هێزەکانی تاریکی زنجیر دەکەم و نمایشیان دەکەم
ئەو دیمەنە شادت دەکات و لە ئاسمانەوە سەیرم دەکەیت و پێدەکەنی ، بە پشتیوانی تۆ دوژمنانم وردوخاش دەکەم، دووایینیشیان مەرگ

## 43

جا دەگەڵ ئەو هەموو ئاپۆڕەیەی ڕزگارم کردوون، دوای ئەو هەموو ماوەیە
دێمەوە ئاسمان، دێمەوە باوکە، تا ڕوخسارت بەدی بکەم
دوای ئەوەی کە هەوری تووڕەیی، دەرەوێتەوئاشتی دێتە کایەوە

شوێنێ بۆ توورِەیی نامێنێتەوەو پاشان لای تۆهەرچییەك بێ، شادیێكی تەواوە
كۆتایی بە قسەكانی خۆی هێنا، بەڵام روخساری خامۆش و كپی
وەك ئەوە وابوو كە بئاخفێ، ئەڤینی جاویدانی بۆ مرۆڤەكان دەنارد
ئەڤینێك كە هیچ شتێ لە سەروویەوە نیە، جگە لە گوێڕایەڵی تاقانە
وەك چۆن بە شادییەوە، چاوەڕوانی خواستی باوە گەورەی كرد
تا خۆی بكاتە قوربانی و ببێتە، مایەی سەرسامی هەموو ئاسمان

## 44

مەبەست لەوە چی بوو؟ سەرسام بوون، بەڵام گەورەی ئاسمان
خێرا وەڵامی دایەوە: تۆ كە لە زەوی و ئاسماندا، تاكە پەنای ئاشتی
بۆ ئەو مرۆڤانەی بەر ڕق و قین و توورِەیی كەوتوون
ئەی تاكە سەرچاوەی رەزایەتی من، تۆ زۆر چاك دەزانی
من چەند ئەوشتانەم خۆشدەوێ كە ئەفراندوومن
لەوەیاندا مرۆڤیش بەختی لەوانیتر كەمتر نییە
هەرچەندە نوێترینی ئەفرێنراوەكانن، تۆش دەزانی كە من لە پێناوی ئەواندا
تۆ لە باوەش و لای ڕاستی خۆم جیا دەكەمەوە
تا تەواوی رێ و ڕەچەڵەكی مرۆڤ ڕزگار بكەم
بۆئەمەش تۆ تەنها كەسی، كە توانای ئەوەت هەیە
خۆت بكەیتە قوربانی، هەرچەند تا ماوەیەك تۆ لە دەست دەدەم

## 45

دەبا سروشتی تۆ لە سروشتی مرۆڤ[١] بێت، دەبا ببیت بە پیاوێ
لەناو پیاوەکانی زەویدا، چونکە کاتی ئەوە هاتووە تا لە نەسلی
پاکیزەی پاکدامێنداجەستەڕێژ بیت[٢]، بە شێوەیەکی سەرسام
لە دایك ببیت و جلی گۆشت و پێست بکەیتە بەرخۆت
تۆ لە جێگەی ئادەم بەو ببە بە سەری هەموو مرۆڤەکان
هەرچەندە تۆش بەنی ئادەمی، لەودا هەموو مرۆڤەکان کۆتاییان دێ
بەڵام لە تۆدا هەموویان دێنەوە، وەك ئەوەی لە ئەسڵێکی ترین
ئەگەر تۆ نەبیت هیچ کەس نامینێ، هەرچەند زۆریش بن

## 46

دەبێ تاقانەی ئاسمان، گوناهی هەموو مرۆڤەکان بخاتە کۆڵییەوە
تەنها ئەو تاقانەیەیە، کە تەواوی مرۆڤەکان رزگار دەکات
ئیدی ئەوانە رزگار دەکەیت کە پێ لە کاری خۆیان نانێن
– جا چەند بەختیان هەبێت. لە چاکەدا یاخود لە خراپەدا –
تۆوی خۆیان لە زەوی تۆدا دەچێنن، تا تیایا بژین
بۆ ئەوەی ژیانێکی تازە لە تۆ وەدەست بێنن، مرۆڤ قەت فیداکاری ناکات
تەنها مرۆڤێ کە دادگایی دەکرێ و دەمرێ، ئەوەشیان دادپەروەرییەکی
تەواوە
ئەگەر بمرێ هەڵیدەکێشمەوە ئاسمان
هەروەها ئەوانەیش لە براکانی هەڵدەکێشمەوە ئاسمان
کە ژیانی گرانبەهای خۆیان کردە فیدای ئەو

---

١- مەبەستی جۆری لە دایک بوونی مەسیح ە لە مەریەمی پاکیزەدا. جەستە ڕێژ بێت، واتەلەدایک بوونی مەسیح، لەجەستەی مەریەمی پاکیزە- وشە بوو بە جەستەو هاتە ناومانەوە 1-41 یۆحنا.

٢- بەنی ئادەمی... میلتون سروشتێکی خودایی و بەشەری دەبەخشێ بە مەسیح، هەم کوڕی ئاسمانەوهەم کوڕی زەوی.

## 47

ئابەمجۆرە خۆشەویستی خودایی، بەسەر ڕقی دۆزەخیدا زاڵ دەبێت
دەبێتە هۆی مردن، نرخی مردنیش ، لێبوردن و ڕزگاربوونە
بەڵکو نرخێکی زۆر گرانە، بۆ چاکردنەوەی ئەوەی بە ئاسانییەکی زۆرەوە
رق و قینی دۆزەخی وێرانی کردوووەهەتا ئێستاش وێرانی دەکات
لە سینەی ئەوانەی تا لە توانایاندا بێت، بە بەرەکەت رازی نابن
بەڵام دابەزینی تۆبۆ سەر زەوی و وەرگرتنی سروشتی مرۆڤ
لە پایەی سروشتی تۆ کەم ناکاتەوە، چونکە تۆ
– هەرچەند لە باڵاترین کەسانی عەرشی ئاسمانی وهاوشێوەی خوداوەند-
دانیشتووی و لە شادی و خۆشی ئاسماندا بەهرەمەندی
دەستت لە هەموو ئەو شتانە هەڵگرتووە، تا دونیا لە نەمانی تەواو ڕەها
بکەیت

## 48

سیفەتەکانی تۆ سەلماندی، کە تۆ تەنها کوڕی ئاسمان نیت
سەلماندت کە تۆ شایانی ئەوەی، بۆیە بەوەی کە تۆ چاکەی
نەك بۆ گەورەیی و بەرزی، چونکە خۆشەویستیی، لەشانازی زیاتر
لە تۆدا ڕەگازۆ بووە، هەر بۆیەش خاکەڕایی تۆ و لەگەڵیشتا
هەموو بەشەرییەت بەرزی ئەو عەرشە دەبنەوە

## 49

ئینجا لەوێ بە جلی مرۆڤایەتی دادەنیشی وفەرمانڕەوایەتی
مرۆڤ و ئاسمان دەکەی، هەم وەك ڕۆڵەی ئاسمان وهەم ڕۆڵەی زەوی
وەك پاشای جیهان تاجت دەخرێتە سەروهەموو دەسەڵاتێکت پێ دەبەخشم
بۆ تا هەتا بە هەموو سیفەتەکانتەوە، فەرمانڕەوایەتی دەکەیت
دەبیت بە سەرۆك و گەورەی هەمووان

## 50

کەواتە هەموو کورسی و ئەمیرو سوڵتان وسەرۆکایەتیەکان
دەخەمە ژێردەستی تۆو ئیدی هەموو خەڵك چۆکت بۆ دائەدەن
جا ئەوەی لە ئاسمان بژی  یا لە ژێر زەوی،  یا لە دۆزەخ بێت
کاتێ کە بە جیلوەوجەلالەوە لە ئاسمان بەدیار دەکەوی
گەورە فریشتانی خۆت دەنێریو  تا رایبگەیەنن
کە دانیشتنی ئەنجوومەنی حوکمڕانی  ترسناك گرێدەدرێ
ئەوسا هەموو زیندووەکان یەکسەر،  پەلەدەکەن ولەهەموولایەکی دونیادا دێن
هەموو ئەو مردووەکانیش[1] بانگێشت دەکرێن
دەنگە تەپڵ و کەڕەنا لەخەودا ڕایاندەپەڕێنێ و دەکەونە پەلەوە
ئەوانەی چاخەکانی کۆنیش، بۆئەوەی حسابیان لە گەڵدا بکرێت

## 51

ئەوکاتە هەموو هەڵبژێردراوەکان، بە دەوری تۆدا کۆدەبنەوە
تا حوکمی ئەوانە بکەیت کە هەڵگەڕاونەتەوە، لە خەڵك و فریشتەکان
جا ئەوەی حوکمی خۆی وەردەگرێ، دەخزێتە ژێر باری حوکمی تۆوە
ئەگەر بۆ دۆزەخ ڕەوانە بکرێن دۆزەخ پڕ ببێ، ئەوە بۆتاهەتایێ دەرگەی دادەخرێ
ئەوسا لەوێ دونیا ئاگردەگرێ و دەسووتێ، لەخۆڵەمێشی خۆی دروست دەبێتەوە
ئینجا خودانەکانی دادو دادپەروەی، دوای هەموو ئازارە درێژخاەکانیان
لە ئاسمانێکی تازەو زەوییەکی تازە دادەنیشن
ڕۆژانێکی زێڕین دەبەنەسەر، کەبەرهەمەکەی، کارە زێڕینەکانە

---

١- ئەوانەی چاخەکانی کۆنیش هەمان دادگای رۆژی قیامەت.

ئیدی شادی و خۆشی و خۆشەویستی و ماف و دادپەروەری سەردەکەون
ئەو کاتەش واز لە سۆلجانی پاشایەتی دەهێنی و ئیتر پێویستت پێی نابێ

## 52

هیچ شتێ نامینێ جگە لە ڕوخساری ئاسمان
ئێستاکەش ئەی فریشتەکان درورد بنێرن بۆ ئەوکەسەی
لە پێناوی بەدیهێنانی ئەو هەموو شتەوە دەمرێت
درورودی بۆ بنێرن، وەك چۆن درورد بۆ من دەنێرن
لەوکاتەی کە ئاسمان قسەی تەواو بوو
بانگ و هاوارێ لە ناو ئاپۆرەی فریشتان بەرزبۆوە
هاوارێکی بەرز لە حەشاماتێکی زۆروە، کە لە ژمارە نەدەهاتن
هاوارێکی نەرم و شیرین، لە هاوارە پیرۆزەکان
ئاسمان لێوانلێو بوو لە ئاهەنگی شانازی ئوسنا[١]
کە هەرێمە ئەبەدییەکانی پڕاوپڕ کرد

## 53

هەموویان لە بەرابەر هەردوو عەرشدا کەوتنە سەرچۆك
لە دروودێکی هێمن و شکۆداردا بۆ زەوی لار بوونەوە
خۆیان و تاجە ڕازاوە بە زێڕ وگوولێنەکانیان
گوڵی ئەمێران ی[٢] جاویدانی
کە خەریك بوو لە تەك درەختی ژیان لەفیردەوس شین دەبوو
گوڵی گرت، بەڵام هەر زوو دوای گوناهی مرۆڤ، گواسترایەوە بۆ

١- ئوسنا وشەیەکی یۆنانییە بەمانای گەورەیی بۆ ئاسمان دێت.
٢- ئەمێران، دەڵێن جۆرە گوڵێکی خەیاڵییە و ڕەنگی ئەرخەوانییە، نە دەژاکێ نە دەمرێ، لەسەردەمی گلگامش زۆر بەکاردەهات.

فیردەوس
ئێستاش لەوێ شین دەبێ و بە گوڵەکانی خۆی
سێبەری خۆی هەڵدەخاتە سەر کانی ژیان و کەنارەکانی ڕووباری
خۆشبەختی
کە بە ناوەندی ئاسماندا تێدەپەڕێ و بەسەر گوڵە ئەلیزییەکانی[1] دا
هەڵدەقووڵێ

## 54

ئەو گوڵە هەمیشە بەهارییانە، بۆ ئەبەد ناژاکێن
ڕۆحە بژێردراوەکان، کەزییە درەوشاوەکانی خۆیان پێ دەبەستنەوە
بەڵام ئێستاکە چەند تاجە گوڵێکی
سەرزەمینی درەوشاوەی ڕەنگ ئەرخەوانی نەچنراو
کە زەمینەی ئاسمانی پێ دەگەشێتەوە
وەك دەریایێ لە یاقووتی درەوشاوە خۆی دەنوێنێ

## 55

پاشان هەموویان تاجەکانی خۆیان لەسەرکرد و
سێتاری زێڕینی خۆیان گرتە دەست
کە وەك خورجینی درەوشاوەی تیر
هەمیشە بە تەنکێشیانەوە هەڵواسرا بوو
بەردەوام ئامادەو لەسەرپێ بوون بۆ ژەنین
بە نەوای شیرین و نەغمەی ئاسمانی
دروودی پیرۆزی خۆیان دەست پێدەکەن

١- گوله ئەلیزییەکان، لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا هاتووە، کە شوێنێکی پیرۆزە، بۆ کەسانی پیرۆزو شانازمەند.

## 56

هیچ دەنگێ نییە لەناو ئەو ئاپۆڕەیەدا بە خامۆش بمێنێتەوە
هیچ هاوارێ نییە، نەتوانێ بە ئاسانی، خۆی بگەیەنێتە ناو ئەو دەستە جەمعیەوە
چونکە ئاسمان لە ناو هاوئاهەنگییەکی تەواو تەواو دابوو، یەکەمجار گۆرانیان
بۆ جیلوەو جەلالی تۆ چڕی، ئەی پاشای ئەبەدی، ئەی نەگۆڕو جاویدانی
تۆ کە ئەفرێنەری تەواوی بوونەوەرەکانی
سەرچاوەی نوورو ڕۆشنایی و لەناو عەرشدا
لەبەر درەوشانەوەت لە پەیدایی چاودا، ناپەیدای
تۆ بەسەر عەرشەوە یەکسان دەبیت و کەس ناتگاتێ
کاتێ سێبەر دەخەیتە سەر
گەشانەوەی نووری خۆت و بە هەورێ دایدەپۆشی
وەك ئەوەی کە پەرستگایەکی شەوقداربی ئاوایە

## 57

بەڵام لە دامانی جلی پاشایەتیتدا، کە لەبەر درەوشانەی هێجگار بەشەوقی، تاری بووە
وێڕای ئەوەیش ئاسمان سەرسام بووەوهەتا فریشتەکانی ساروفیمیش
زاتی ئەوە ناکەن و نزیك ناکەونەوە لە تۆ، بە باڵەکانی خۆیان چاویان دادەپۆشن
پاشان سروودیان بۆ هەموو خەڵقەندەکانی کەونارو دێرین چڕی
هەروەها بۆ تاقانەی تۆ، کە یەکسانە بە قەداسەت
کە ئاسمانی بێ هەور، خۆی لە ڕوخساری تیشکینتا، دەنوێنێ
چاوەکان بینیان و ڕووناکی گەورەی ئاسمان گەشایەوە

ئەگینا هیچ ئەفرێنراوێ، نەیدەتوانی ڕووناکی ئەو ببینێ
شکۆمەندی و بەرزی ئەو، لە تۆدا نەخشی بەستاوە
ئەندێشەی بێسنووری ئەو، لە بوونی تۆداماڵی داناوە

## 58

بە تۆومیە کەئاسمانەکان وهێزی فریشتەکانی لە وێدا ئەفراند
بەتۆومیە گەورە تەماحکارەکانی تووڕهەڵدا
تۆ لەو ڕۆژەدا خۆت لە بروسك نەبان نەکردووەك ئاسمان تریشقاندت
تایەی پەیتوونە جەنگییە ئاگراوییەکانی تۆ لە گەڕ نەکەوت
کە پەیکەری ئاسمانی نەمری دەلەرزاند
لەوکاتەی کە ملی شەڕکەرەکانی هەڵگەڕاوت پەلدەدا

## 59

کە لە شەر گەڕایتەوە سەربازەکانت
کەوتنە هەلهەلە و تەنها بۆتۆ درووودیان نارد
ئەی ئەو کەسەی هێزی خۆت لە ئاسمانەوە وەردەگریت و
تۆڵەیەکی توند لە دوژمنەکانی دەکەیتەوە
بەڵام مرۆڤەکان نا، چونکە ئەوان بەهۆی چەپەڵی ئەوانەوە کەوتن
ئەی ئاسمانی بەزەیی و لێبوردە
تۆ زۆر بە توندی مرۆڤت مەحکوم نەکرد و بە بەزەیی بووی بۆیان
کە تاقانەکەت دەرکی بەوە کرد کەوا، تۆ ناتەوێ بە توندی
مرۆڤی لاواز مەحکوم بکەیت، ئەویش پەلەی کرد بۆ دامرکاندنەوەی
تووڕەیی تۆ، بۆ کۆتایی هێنان بە کێشەی نێوان بەزەیی و داد
کە لە ڕوخساری تۆیدا بینی، بێئەوەی گوێ بداتە ئەو پایەیەی
کە هەیەتی لەدوای تۆدا، خۆی پێشکەشی مەرگ کرد

## 60

تا پشتی مرۆڤ بگرێت، وای لەو خۆشەویستییە بێ نەزیرە
خۆشەویستییەك كە بۆ هەموو كەسێ نابێت، لەو ائاستەد نەبێت
سلاو ئەی تاقانەی ئاسمان، ئەی ڕزگاركەری مرۆڤ
لەمەودوا ناوی تۆ دەبێتە بابەتی من وشەلالّی تەواوی سروودەكانم دەبێ
هەرگیزاوهەرگیز، سێتاری من لە ستایشی تۆدا ناوەستێ
ستایشكردنی تۆ لە ستایشكردنی ئاسمانت جیا نابێتەوە

## 61

ئابەمجۆرە بوون، بە سەر مەداری ئەستێرییدا، لە ئاسمان
كاتی بەختەوەری خۆیان بە ژینی شادەوە بەسەر دەبرد
بەلام ئەهریمەن لەو كاتەدا، داڕمابووە ناو قوولاییە
سەخت و تاریكییەكانی دونیای خڕەوە و دابەزی بووە
لای یەكەم ئەو شوێنە بازنەییەی كە دونیای خوارەوە
لە قەڵەمڕەوی كابووس و هێرشی كۆنی شەو جیادەكاتەوە

## 62

لەدوورەوە ئەو تۆپە لە كووڕە دیار بوو
نزیك بوو لە سەرزەمینی بێسنووری
تیرەو تاریك و گرژومۆن و وەحشییەوە
كە شەوێكی بێ ئەستێرەو سامناك باڵی بەسەردا كێشابوو
هەمیشە لە ژێر هەرشەی ڕەشەبای كوێریی دابوو
بە دەوریا هەڵدەڕژاو لە هەموو لایەكەوە لوولی دەدا
بەلام لەولای دیواری ئاسمانەوە، سەرەڕای دووری مەوداكەی

چاوی بە بریقەیێ کەوت، کە لە ئاسمانێکی گەشاوەدا، پێچەوانە بووبۆوەو
ڕەشەبای توندو تیژی تیادا هێور ببۆوە

## 63

لەوێدا ئەهریمەن بە ناو دەشتاییەکی فراواندا، ڕەها بوو بوو
وەك بازێك بەسەر کێوی ئیماوسدا[1]، کە ڕووەزی بە بەفر داپۆشراوی
سنووری سەرزەمینی تاتاری چادر نشینەکان، دەگرێتە خۆ
بە هەڵفڕینەوە ئەو سەرزەمینە بێ خۆراکەی بە جێدەهێشت
تا بەدوای گۆشتی کارو بەرخۆلەدا بگەڕێ

## 64

کە بەسەر گردۆلکەکانەوە لەگەڵ ڕاندا دەلەوەڕین
بەرەو کانیاوەکانی ڕووباری جانگیز [2]و
ڕووباری هیداسبیس[3] لەهیند، کەوتە فڕینەوە
بەڵام لە ڕێگەی خۆیدا، بەسەر دەشتە بێ بەرهەمەکانی
سریکانا [4]دەنیشتەوە، کە لەوێدا چینییەکان
بەسەر داشقەی قامیشییانەوە، کە با ڕایدەدا، بازاڕییان دەکرد

## 65

ئا بەمجۆرە ئەهریمەن بەسەر ئەو دەشتە ڕاخراوەدا

---

١- ئیماوس، چیایێ لە هیمالایێ.

٢- جانگیز، جەنگیزخان.

٣- هیداسبیس ، رووبارێ لە بنجاب.

٤-سریکانا، بانەکانی چین کە خەلکانێک لەوێدا دەژین و بە جۆرە داشقەیەک دێن و دەچن، چارۆگەیەکی بەهێزی هەیەو لەرێگەی باوە دەجوولێ.

کەوەك ڕووپەڕی دەریا وابوو، با بەسەریا هەڵبکات
بە تەنها دەستی کرد بە ڕاکەڕاك، بە دوای نێچیردا
بەڕاستیش تەنها بوو، چونکە ئەم شوێنە هیچ ئەفرێنراوێکی تری
لە زیندووەکان یا لە مژادەکان لێنەبوو
هێشتا هیچ شتێکی تر نەبوو بوو
پاشان حەشامەتێك لە شتەکان، هاتنە سەر زەوی

## 66

بەسەر پشتی هەوا دەکەوتن، وەك بڵێی هەڵمی فڕندە بن
حەشاماتێ لە ڕەنگی جۆراوجۆری زووگوزەر و بێهوودە
دوای ئەوەی کە گوناهکارییەکانیان، مرۆڤی شەلاڵی لەخۆباییبوون کرد
هەمووشتێ غرور بوو، هەموویان بەو شتانەوە
ئاواتی مەزنی وناوبانگی هەمیشەیی و بەختەوەرەرییان
لەم دونیایەو دونیای دوایی بونیات دەنا

## 67

هەموو ئەوانەی لەسەر زەمیندا پاداشتی خۆیان وەردەگرت و
لە ماندوو بوونی خورافەت و کوێرانەیاندا دەیاندووریەوە
هیچیان نەدەویست جگە لە ستایشی خەڵك
ئیدی لێرەدا پاداشتی بەهەقی خۆیان وەردەگرت
کە ئەو پاداشتەش، وەك کاروکردەوە پووچەکانیان بوو

## 68

هەموو ئەو شتانەی کە سروشت دروستی کردبوون
دروست کردنیان تەواو نەبوو
بۆیە یا ئەوەتا لەبار دەچوون، یا بە شێوەیەکی وەحشیانە
یا وەك ئەفرێنراوی کرێت و ناشیرن،سەریان دەرهێنا
لەسەر زەویدا دەتوانەوەو دەڕژانە ئەو شوێنەوە
ئێدی ڕادەبردن و بێهوودە دەبوون، تا ئەوکاتەی ئەلێرە بۆگەن دەبوون
نەك لە و مانگەی[1] کە لە تەکیەوە بوو
وەك چۆن هەندێ بە هەڵە ئەندێشەیان دەکرد

## 69

دانیشتووانی ئەو کێڵگە زیوییانە، وەکو قەددیسەکان [2] وابوون
کە ڕاگوێزکرانەوە ئاسمان، یاخود وەك ئەو ڕۆحانەی
لە نێوان ڕەگەزی فریشتەیی[3] و ڕەگەزی مرۆڤیانە بوون
بەڵام ئەوانەی بەهۆی زاووزێی
نێوان کوڕان و کچانی بەدڕەوشت لە دایك بوون
هێندێکیان بوونە فەلامەرزە دێرینەکان
بەکارەکانی خۆیان و ناوبانگیانەوە، لە خۆبایی بوو بوون

## 70

---

١- ئەریۆستۆ لە داستانی تووڕەیی فۆریوسو دا، خەیاڵی بۆ لیمبۆی نێوان فیردەوس و دۆزەخ چووە،، ملتون بە مەغرووڕەکانی سەرمانگ ناویان دەبات.

٢- قەددیسەکان، ئەوانەی گواسترانەوە ئاسمان و زیندووبوون، وەک ئەخنوخ- تەکوین٢٤:٥ و وایلیا – ملوکی دووەم ٢:١-١١

**٣- ڕەگەزی فریشتەیی، سەلالەیەك لە فەلامەرزەکان کە لە ژنانێك زاون، شوویان بە کوڕانی ئاسمان کردووە.**

لەدوای ئەوانەوە، لەدەشتاییەکانی سینارەوە[١] کچەکانی بابل هاتن
ئەوانیش لە تەماح بەدەر نەبوون
ئەگەر توانایان هەبوایە، شاری تازەیان دروست دەکرد وەکو بابل
ئەوەی تریش بە تەنها هات، ئەویش یا ئەوەتا خودایەتی داوا بوو
بۆیە خۆی هاوێشتە ناو ئاگری ئیتناوە[٢]، کە ئەمبادوکلیس بوو
بەڵام ئەوەی کە دەیەویست، چێژ لەو فیردەوسە وەرگرێ
کە ئەفلاتون وەسفی کردبوو، کلیومبروتوس[٣] بوو
ئەویش خۆی هاوێشتە دەریاوە
زۆری تریش لەو گەلۆرو لەڕانە، کە ژمارەیان بە کۆتا نایەت

## 71

هەروەها ژن و کاهینە ڕیاکارە سپی پۆش و ڕەشپۆش وخۆڵەمێش پۆشەکان
بەهەموو هیچ و پووچییەکانیانەوە
لەوێ ئەو کەسانەی مەودایەکی دووردرێژیایان بڕیبوو
لەگەڕان بە دوای ئەو کەسانەی لە گردی جلجتا [٤]مردبوون
ئەوانەیش کە دەیانەویست فیردەوس دابێن بکەن
کە مردن جلی ڕەشی دومینیك، یا جلی فرینسیسکانیان[٥] لەبەر کرد
پێیان وابوو ئەو جلانە دەیانشارێتەوەو دەچنە فیردەوس
ئەوانە بە حەوتەوانەدا ڕەت دەبن و

١- سینار :دەشتاییەکانی سەنعار، تەکوین ١٠- ١٠
٢- ئیتنا: هێمایە بۆ ئەمبۆدوکلیس ی پێش سوکرات، کە خۆی هاوێشتە ناو ئاگری چیای ئیتنا، تا بیسەلمێنێ خودایە، گرکانەکان قووتیاندا.
٣- کلیومبروتوس، خۆی هاوێشتە ناو دەریا، دوای ئەوەی فیدون ی ئەفلاتوونی خوێندەوە.
٤- جلجتا، گردێکە، کە مەسیح لەوێدا لەخاچ درا.
٥فرەنسیسکان بۆر بوو، ملتون لێرەدا فشە بە کاتولیک دەکات.

پاشان بە ناو فەلەکی وەستاو و فەلەکی بلوورین [1]
ئەو فەلەکەی کە بە ترازووی خۆی، لەرزە و جووڵەی یەکەم، پێوانە دەکات

## 72

ئێستێ بەترۆس لە دەرگای ئاسمانی بچووکدا وەستاوە
وەك ئەوەی چاوەڕوانیان بکات وکلیلەکانی بەدەستەوەیە
ئێستا لە دامێنی ئاسماندا، پێیان بەرزکردۆتەوەو سەردەکەون
لە ناکاو بایەکی توند، لە هەردوو ڕۆخانەوە هەڵیکردو
دە هەزا ر فەرسەخ بۆ دواوەی ڕامالێنە فەزای دوور دوورەوە
دەتبینی کە خۆیان و کەواو تەیلەسان وجلەسپییەکانیان
پەرش و بڵاو بووبوون و دازڕان و پارەپارە بوون

## 73

پاشان تەسبیح و هەموو شتە پیرۆزەکان و چەکی تێپەڕین و بەخشش
هەرهەموویان بە وێنەی بڵقی سابوون، کەوتنە بەرباو تێکی قژقژاندن
هەڵفڕینە لای دواوەی دونیای دوور دوورەوە
بەرەو جیهانی پان و بەرینی لەبیرچوونەوە
ئەو جیهانەی لیمبۆ[2] کە دوایی ناوی بووە فیردەوسی گەمژەکان
کەس لەو شوێنە بێ خەبەر نەبوو
دوای ئەوەی کە ماوەیەکی درێژی بەسەرداچوو
ئێستا هیچ کەسێکی تیادا نیەو کەس پێی پێ نەکەوتووە

---

١- فەلەکی بلوورین یەکێکە لە ٥٥ مەداری بەتلیموسی، دەڵێن پێوانەی لەرزەی مەدار دەکات، واتە جوولەی خولگەکان

٢- لیمبۆ، لەپەراوێزی پێشتر باسکراوە، بۆزیاتر ڕوونکردنەوە، کە دانتی باسی لێوە دەکات، شوێنی ئەو کەسانە بووە کەبەر لە پەیدابوونی چەمکی ئایین و ئاسمان لەدایک بوونەو مردوونە، شوێنێکە لە میانی بەهەشت و دۆزەخ. و.

## 74

ئەهریمەن لە کاتی ڕۆیشتنی، ئەو دونیا تۆپەڵییە تاریکەی بینی
ماوەیەکی زۆر ڕۆیشت، تا لە دواییدا تیشکێکی سپێدەی درەوشاوەی بینی
بەپەلە بەرەو ئەولا چوو، پاشان لەدوورەوە پەیژەیەکی مەزنی بینی
بەدیواری فیردەوسەوە هەڵواسرابوو
پاشان تەلارێکی گەورەی بینی، بەڵام دوورتر بوو لەوەی بیگاتێ
وەکو دەروازەی تەلاری پاشایەتی وابوو
ڕووکارەکەی لەزێڕو بەردی گرانبەها بوو

## 75

بە گەوهەری بریقەداری ڕۆژهەڵاتی ڕازابۆوە
دەدرەوشایەوەو و بریقەی دەدایەوە
زۆر لەوە بەرزتربوو، کەزەوی لەوجۆرە نموونەیەی بینیبێ
یاخود وێنە کێشێکی کارامە نەخشاندبێتی
ئەو پەیژانە وەك چۆن یاکوب[1] خەونی پێیانەوە بینی بوو
فریشتەکان بوو، بەم پەیژانەوە سەردەکەوتن و دەهاتنە خوارەوە
کۆمەڵە پاسەوانێکی درەوشاوە بوون، کە لەبەر ئیسو
ڕایانکردە بادان ئارامەوە[2]، کە لە کێڵگەی لوز بوو
شەو لە خەوی بینی بوو و لەبان سەریشیا ئاسمانی بێ پەردە

---

1 براگەورەی، لە ئیسحاق وەرگرێ، فێڵی لێکرد، وای خەیاڵ کردووە کەخەونی بەو فریشتانە دیوە بەسەر پەیژە دەکەون، لێرەوەیە کە دەستەواژەی پەیژەی یاکوب هاتووە، بەمانای فێل و تەلەکەبازی دێت.
2- بادان ئارام: ماڵی مامی یاکوبە، بوو بە دەرگەیەک بۆ ڕاکردن لە ترسی ئیسو

## 76

که بەیانی لە خەو هەڵسا، هاواری کردبوو، ئەوانە دەروازەکانی ئاسمانن
بۆ هەر پایەیەك مانایەك و نهێنییەك لە نهێنییەکاندا هەبوو
بۆهەمیشە لە شوێنی خۆی نەدەمایەوە
بەڵکو هەندێ جار لە فیردەوس نزیك دەبۆوە، بێ ئەوەی ببینرێت
ئەو فیردەوسەی کە لە ژێریەوە دەریایەکی درەوشاوە
لە یاقووت و لوئلوئی شل هەڵدەڕژا

## 77

ئەوانەی لە زەوییەوە[1] دەهاتن، بەو دەریایەدا ڕەت دەبوون تا دەگەیشتن
یا فریشتەکان هەڵیان دەگرتن، یاخود بە سەریا هەڵدەفڕین
بە و پەیتوونانەی کە ئەسپی ئاگراوی ڕایدەکێشان
لە وێدا پەیژەکانکان بەرەوخوارەوە، سەرەوژێر دەبوونەوە
ئەوسا پەیژەکان دەلەرینەوە
جا یا بۆ ئەوەبوو کە ئەهریمەن بخەنە وەسوەسەوە
یاخو بۆ ئەوەی زیاتر خەمی دەرخوارد دەن
تا دووری بخەنەوە لە دەرگای ئاسمان

## 78

دەرگاکان ڕاستەوخۆ لەبەرامبەر ئەو شوێنەدا، لە ژێرەوە لەسەر پشت بوون
بەسەر شوێنە پیرۆزەکەوە، بە تەواوی لە ناو فیردەوسدا
ڕاڕەوێك هەبوو ، ئەو ڕاڕەوە دەچووە خوارەوە بۆ سەر زەوی
ڕاڕەوێکی پان و پۆڕ بوو
زۆر لەوە فراوانتر بوو، کە لە چاخەکانی داهاتوودا هەبێت

١- لەزەوییەوە دەهاتن، واتا گواستراوەکان بۆ ئاسمان، وەکو ئەخنەخ و ئیلیا، کە بە پێی تەورات ئاسمان ئەوانەی بردەوە.

## 79

بەسەر کێوی سەهیۆنەوە- سەرمرای پان و پۆڕیەکەی -
بەسەرسەر زەوی موژدەبەخشەوە هەڵدەکشا، تا ئاسمان
فریشتەکان بە پێی فەرمانی بالآوە، ئەم ڕێگەیان گرتبووە بەر
تا بچنە خوارەوە، بۆلای هۆزە شادەکان، ئاسمانیش بە لوتفی خۆیەوە
لە بانیاسی[1] سەرچاوەی ئاوی ئوردن، تا بیرسەبع[2] ەوە سەیری دەکردن
کە ئەوێ زەوی پیرۆزبوو، لەتەك میسرو سنووری عەرەبستاندا

## 80

ئاوا بوو، دیمەنی ئەوشوێنە فراوان و کراوەیە، ناکۆتا بوو
سنوورەکەی لەم دوو لایەوە، وەك ئەو سنوورانەی
کە شەپۆلی ئۆکیانووسیان ڕادەگرت، لە تاریکیدا ڕوو چووبوو
ئەهریمەن لەوێ بەسەر نزمترین پایەی پەیژەکەوە وەستا
کە پایە زێڕینەکانی بەرەو دەروازەی ئاسمان دەچوون
وەستا و بە سەرسامییەوە، سەیری ژێرەوەی خۆی کرد
لەناکاوئەو جیهانەی بە شێوەیەکی تەواو بۆ بەدەرکەوت
هەرماس وەکو سیخوڕێ وابوو، تەواوی ڕێگەی
تاریك و توون و بیابانەکانی،گرتبووە بەر، مەترسییەکانی تێپەڕ کردبوو

## 81

بەدرێژایی شەو دواجار، سپێدە دەمێکی شادو گەشاوە
بە سەرگردێکی بەرزو ناهەموارەوە، بەدیار کەوت

---

١- بانیاس، بە شاری دانا ش هاتووە، کە دەکەوێتە لای رووباری ئوردن، سنووری باکووری کەنعانی پێکدێنێت.
٢- بیرشەبع، سنووری باشووری کەنعانی پێکدێنێت.

چاوەکانی بە بێ ئاگا لەخۆبوونەوە
دیمەنێکی جوانی ولاتێکی بیانی دەدۆزێتەوە
کە بۆ یەکەمین جارە ئەو شارە ڕازاوە، بە بورجی بریقەدارو
گومەزی درەوشاوە وە ببینێ
کە تازە تیشکی خۆری گەشاوە بەسەریەوە هەڵدەهات

## 82

ئاوا ئەو ڕۆحە چەپەڵە، هەرچەندە پێشتر ئاسمانی بینی بوو
بەلام ئەمجارە زۆر سەرسام بوو، بە بینینی ئەو هەموو جیهانە جوانە
کە هێجگار جوان بۆ ئەو بەدیار کەوت، حەسوودی زاڵ بوو بە سەریا
بە وردی سەیری دەوروپشتی خۆی کرد، بەسەر گومەزێکی بەرزەوە وەستا
لە نێو ئەو شەوەزەنگەدا بە ناو ئەوپەڕی ڕۆژهەلاتەوە
کە بورجی ترازووی لێیە، تا ئەستێرە نەرمە[1] ی کە ئەندورمیدا
[2]هەڵدەگرێ و
پێیەوە بە شەپۆلەکانی ئەتڵەنتیدا ڕەت دەبێ

## 83

تا دەگاتە پشتی ئاسۆوە، پاشان لە جەمسەرەوە بۆ جەمسەر، چاو دەگێڕێ
تا دەرك بە پانتایی دونیا بکات، پاشان بەبێ ئەوەی بوەستێ
شۆڕدەبێتەوەو خۆی داوێتە ناو یەکەم هەرێمی دونیاوە
لە کاتی هەڵفڕینیدا، هەموو تەگەرەو ڕەشەبایەکی بە ئاسانی ڕەت دەدا
ڕێی لاری خۆی، بەناو هەوای تەمۆخی ڕووندا دەگرێتە بەر

١- ئەستێرە نەرمە، واتە ئەستێرەی فەروە، بورجی حەمەل.
٢- لە بورجی ئەندرۆمیداو بورجی فەروە پێکدێت و ئەندرۆمیدا ، کچی کاسیوبیای شاژنی ئەسیوپییە، کە بیرسیوس ڕزگاری کرد.

بەنێو ئەو ئەستێرە گەشاوانەی، لە ژمارە نەدەهاتن
لە دوورەوە بەڵام لەلای سەرەوە، جیهانی تر بەدەرکەوتن
یاخود لانی کەم، وەك جیهانێکی  تر یا دورگەی خۆشتر
وەك باغی هیسبرد ی[١] کەوناری، کە بە کێڵگەی بە پیت و دارودرەخت و دۆڵی پڕلە گوڵ ناودار بوو

## 84

ئەو دورگانەی سێ هەندەی شادی بۆ زیاد کراوە
بەڵام  دانیشتووانە دڵخۆشەکانی، لەوێدا نامێننەوە و لەوە ناپرسن
تیشکی خۆری زێڕین بەرزتر بوو، لە تیشکی هەموو  ئەستێرەکان
کە وەك ئاسمان گەشایەوە
ئەهریمەن چاوی لێبڕی و بەڕێگەی ئاسمانی کپەوە، بەرەو لای چوو
ئایا سەردەکەوێ یا دادەبەزێ، ئایا لە مەداری ناوەوەیە یا لە مەداری دەرەوە؟ - ناتوانین چ بڵێین لەوە - [٢]

## 85

یاخود لەتەك هێڵی درێژی گەردوونی گورشەی مەزن [٣]
کە حەشامەتی کۆئەستێرەکانی لێ بە دوورە
ئەو ئەستێرانە  تیشکی خۆیان لە دوورەوە دەهاوێشت
بەڵام ئەو سەمای ئەسێرەکان بە ریتمێك نمایش دەکات
 ڕۆژو مانگ و ساڵ بە جووڵە جۆراوجۆرەکانی دەژمێرێ

١- بەپێی میتۆلۆژیای یۆنانی، باغەکان دەکەونە ئەوسەری دونیاو زێڕیان لێ شین دەبێ، گریکەکان دورگەی کەناری و بریتانیان وا ئەندێشە کردووە.
٢ - ناتوانن چ بڵێن، چونکە ملتون دوودڵ بوو لە میانی دونیای کوبەرنیکۆس و دونیای بەتلیمۆس.
٣- گورشەی مەزن، واتە رووناکی مەزن واتە خۆرەتاو

بێ جیاوازی، بەرمو مەشخەڵی گەشاوەی دەچێت
کە بە تیشکە موگناتیسیەکانی [1]فێنکیەکی نەرم و خۆش
بە کەوندا بڵاودەکاتەوە تا دەچێتە قووڵایی

## 86

ئابەمجۆرە بە شێوەیەکی سەرسام، بنکەی گەشاوەی خۆی دامەزراند
لەوێش شەیتان بەسەر ڕووبەڕێك دادەبەزێ
کە هیچ ئەستێرەناسێ، لەکەیەکی وای بە دووربینی خۆی
لە بازنەی هەڵگیرساوی خۆرەتاودا نەبینیوە
ئەهریمەن بینی کە ڕووناکایی ئەو شوێنە لە وەسف بەدەرە
بەبەراورد بە هەر بەردو کانزایەکەوە
هەموو بەشەکانی لەگەڵ یەکدا شێلگیر نەبوون
بەڵام هەموویان تیشکێکی گەشیان، لێهەڵدەستاو تیشکیان دەدایەوە
وەك ئەوەی ئاسن بێ و لەناو ئاگر بگەشێتەوە

## 87

ئەو کانزایانە بەشێکیان زێڕ بوون و بەشێکیشان زیو
بەڵام بەردە گرانبەهاکان، ئاقیق و یاقووت بوون
وەك ئەو دوازدە گەوهەرەی کە لە سەر سینەی
زرێی هاروون دەدرەوشانەوە
تەنها لەناو خەیاڵدابوون، نەك لە بوویەری ڕاستەقینە

١- موگناتیسییەکانی فێنکی،میلتون دەڵێت تیشکی ڕاکێشەر کەون دەگرێ، ئەو کاتە هێشتا کتێبی راکێشان ی نیوتن بوونی نەبووبوو.

ئەوانە بەرد بوون یا کەمتر لە بەرد[1]، کە فەیلەسووفەکان
بێهوودە لەم سەر زەوییەدا بەدوای دەگەڕا ن[2]

## 88

هەرچەند ئەوانە بە زانستی خۆیان هورمسیان [3]کۆتوبەند کردو
پرۆتیوسیان[4] لەدەریادا بەشێوەی جۆراوجۆر دەرهێناو ئازادیان کرد
پاشان دڵۆپاندیانە ناو چەند بۆڕییەك، تا شێوەی خۆی وەرگرێتەوە
ناچار، چ جێگەی سەرسامییە ئەگەر لەو هەرێمانەدا
ئەکسیرێکی ڕوون و ڕەوان هەناسە بدات و
جۆگەلەکان زێڕی تواوەیان پێدا هەڵڕژێ

## 89

چونکە زەوی ئێمە بەهەموو دوورییەکانییەوە، لە خۆرەتاو
یەك وەشانی ئەو خۆرەتاوە کیمیاگەرە گەورەیەی بەسە
بۆ ئەوەی تێکەڵ بە ئاوی ئەم زەوییە ببێت
ئەوسا لێرە لەو زوڵمەتە، شتگەلێکی یەکجار بەنرخ و گرانبەها

---

١- ئەوان بەرد بوون، هێمایە بۆ هارون برای مووسا بوو، هەمیشە ئەو زرێیەی دەپۆشی، کە بەبەردی گرانبەها ڕازێنرابۆوە.

٢- بەردی فەیلەسووفان.

٣- هورمس خوای یۆنانی و کوڕی زیوس بوو، ڕۆمانییەکان پێیان دەگووت میرکۆری، واتە زەنبەق، کە خواوەندی زانست بوو، میلتون دەڵێت هورمسیان زنجیر کرد، واتە زەنبەقیان دۆزییەوە.

٤- خواوەندی دەریا، کوڕی بوسیدۆن یا ئۆکیانووس بوو، لە دورگەی فاروس، نزیک میسر، گاوانی گۆلکەکانی بوسیدون ی دەکرد، پێشبینی تەنها ئەوانەی دەکرد کە دەیگرن، کە یەکێ بیویستبا بیگرێ جۆرەها شێوەی دەگرتە خۆ، تا دوور کەوێتەوە لەو پێشبینییە، کە دەکەوتە بەردەستی یەکێ دەبووە پیاوێکی پیرو ئایندەی دەخوێندەوە،هەموو ڕۆژێ لە کەناران ڕادەوەستا، مەبەستی میلتون زانستە کە ئایندە ئاشکرا دەکات.

بەخۆیان و بە ڕەنگ و کاریگەرییە دەگمەنەکانیان دادەهێنێ
ئەهریمەن لەوێدا هەندێ مژادی دۆزییەوە، کەس پێشترنەیبینی بوون
بەڵام ئەوەندە پێی نەگەشایەوە سەیری ئەمسەرو ئەو سەری کرد
هیچ بەربەست و تەگەرەیەك بەری چاوی ناگرن و سێبەرێ هەڵناکشێ
بەڵام تیشکی ڕۆژ، کە هەموو شتێکی داپۆشی بوو
نیوەڕۆیان دەگاتە بەرزترین تاوی خۆی لە هێڵی ئیستوا
ئیدی هیچ تەنێك لە ئارااادا نییە، سێبەرێك دروست کات

## 90

لەوێ هیچ شتێ وەك خۆرەتاو، ڕوون و ڕەوان نەبوو
نووری دیدەی ئەوی بەهێزترکرد
لەنێو مەودای دیدگادا، فریشتەیەکی ڕووگەشی بینی وەستا بوو [1]
هەمان ئەو فریشتەیە بوو، کە لەناوخۆراد وەستا بوو — یوحنا
پشتی لەو بوو، بەڵام درەوشانەوەی ئاشکرابوو
تیشکی خۆرەتاوی گەش، تاجێکی زێڕینی بە دەوری سەریەوە داڕشتبوو
کەزییەکانی کە لە پشتی تاجەکەوە هاتبوونە خوارەوە
ئەوانیش درەوشانەوەیان کەم نەبوو
بەسەر هەردوو دووشانە باڵدارەکانیەوە، بەدەوریا شەپۆلی دەدا
واخۆی دەنواند کە کارێکی مەزنی پێ سپێردرابێ
یاخود ڕۆچووبێتە ڕامانێکی قووڵەوە

## 91

ئەهریمەنی چەپەڵ چەند دڵخۆش بوو، ئەوسا وای هیوا بوو
کەسێ بدۆزێتەوە تا لە سەفەرەکەیدا، بەرەو فیردەوسدا ڕێی پیشان بدات

١- فریشتەی وەستاوی ناو رووناکی، هێمایە بۆ - فریشتەیەکم بینی لە ناو خۆرەتاو وەستابوون، روئیا١٩-

کە مەنزڵگای بەختەوەری مرۆڤەو دوا مەنزڵگەی سەفەری ئەهریمەنە
بەڵام سەرەتای ناخۆشییەکانی ئێمەیە
ئەهریمەن یەکەمجار بەدوای ئەوە بوو، کە شێوەی خۆی بگۆڕێت
ئەگینا مەترسی لێڕوودەدات و یا بە دوادەکەوێت
بۆیە خۆی بە شێوەی فریشتەیەکی شیرۆبی بچووك نواند
نەك لە بەهاری تەمەن بێت، بەڵام ڕوخساری
بە بزەی گەنجەکانی ئاسمان دەدرەوشایەوە
وای لە خۆی کردبوو، کە زراف و سووکەڵە دیاربێ
وای چەند کارامە بوو، لە خۆشاردنەوەو تەڕدەستی[1]

## 92

لەژێر تاجە بچووکەکەیدا، پرچی کراوەو هەڵڕژاوی
بە چەند ئەڵقەیەك بەسەر ڕوومەتیا شەپۆلی دەدا
دوو باڵی لە ڕیشێکی ڕەنگاوڕەنگی ئاوزێڕکراودا بەستا بوو
کراسێکی کورتی لەبەر بوو، لەبار بوو بۆ ڕۆیشتنی خێرا
عەسایەکی زیوینی لەدەست دابوو، کە پێش هەنگاوەکانی دەکەوت

## 93

فریشتەی تابان کە گوێی لە تەپەی پێی بوو، سەری نوورانی خۆی وەرسووڕاند
هەرزوو ئەهریمەن دەرکی بەوە کرد، کە ئەو ئوریلە [2]
یەکێ لەو حەوت کەسەی لە تەك خودا ڕادەوەستن ونزیکرێن فریشتەکانی عەرشن

---

١- لەم پەرەگرافەدا، میلتون لێرەدا دەیەوێت بڵێت ، کە ئەهریمەن ڕێگەی چوونە ناو مرۆڤەکانی دۆزییەوە، ئیدی کارەساتی مرۆڤ دەستی پێکرد و ناخۆشییەکان بەدەرکەوتن.و.

٢- ئوریل، نووری ئاسمان و دادوەری خۆرەتاوە.

ئەوانە ئامادەو لە سەر پێن بۆ هەر فەرمانێك و
چاوی ئەون و بەئاسماندا دەسووڕێنەوە
یا دادەبەزنە سەرزەوی و پەیامەکانی ئەویان پێیە
بەسەر تەڕاتییەوە بێت یا وشکانی، دەریا بێت یا دەشتایی

## 94

ئەهریمەن دەستی بە قسەکرد لە گەڵیاو گووتی:
ئۆریل، تۆ یەك لەو حەوت گیانانەی
کە لەبەرامبەر عەرشی ئاسمانی بەرزو درەوشاوەدا دەوەستن
تۆ یەکەم کەسی کە ڕاڤەی خواستی هەقمەندی مەزنی ئاسمان دەکەیت
یەکەمین کەسیشی کە لە ئاسمانی بەرزەوە خواستی ئاسمان دەهێنی
هەموو ڕۆڵەکانیشی، چاوەڕوانی پەیامی تۆ دەکەن

## 95

بێگومان لێرەش هەر بە ویستی ئەو سەرمەدییەوە، بە ناونیشانی یەکێ
لە دیدەکانی ئاسمان، هاتوویتە دیداری ئەو ئەفرێنراوە تازانەوە
من ئارەزووێکی وام هەیە وەسف ناکرێت، بۆ دیدەنی و زانینی
هەموو کارە جوان و سەرسامکارەکانی ئاسمان، بە تایبەت مرۆڤ
کە جێگەی بایەخ و لوتفی ئەوە، هەربەخاتری مرۆڤەوەیە
کە ئەفراندنی ئەو هەموو شتە جوانانەی فەرمووە

## 96

هەر ئەوەشە بۆتە هۆی ئەوەی، هەموو فریشتەکانی شیرۆبیم جێبهێڵم
تاك و تەنها لێرەدا سەرگەردان بم، پێم بڵێ ئەی رەوشاوەترین ساروفیم
کە مرۆڤ لەکام یەك لەو دوو فەلەکە درەوشاوەیەدا دەژی

یا هیچ شوێنێکی جێگیری هەیە؟
شوێنێکی نییەو چۆنی بوێ ئاوا بە نێوئەو هەموو فەلەکانەدا دەسووڕێتەوە
وەڵامم بدەوە لەوانەیە بیدۆزمەوەو بە تیچاوێکی نهێنی سەیریان دەکەم
سەرسام دەبم بەوە، تا بزانم ئەوانە کێن ئاسمان بەرەکەتی خۆی پێ بەخشیون؟
تا ببێتە نیشانەیەك لە نیشانەکان ودروود بنێرن بۆ ئەفرێنەری گەردوون
بەڕاستی لەسەر هەق بووە، کە دوشمنە سەرکێش و هەڵگەڕاوەکانی فڕێداوەتە ناو قووڵایی دۆزەخەوە
لەجیاتی ئەوان، ڕەچەڵەکی مرۆڤی تازەو بەختەوەری ئەفراندووە

## 97

تا باشتر لەوان خزمەتی بکەن، وای کارەکانی چەند حەکیمانەیە
ئابەمجۆرە ئەو درۆزن و فێڵبازە قسەی دەکرد
کە نە ئینسان، نە فریشتە، ناتوانن ئەو نیفاقە بەدیار بخەن
ئەوە تاکە شەڕڕێکە، کە بەسەر زەوی و ئاسماندا دەڕواو
کەسیش نایبینێ، خودا نەبێ، ویستی ئەو، ڕێگە بەوە دەدا
زۆرجاران کە حیکمەت ڕادەبێ، گومان لە دەروازەی حیکمەت دەخەوێ
ئابەمجۆرە یورئیل فێڵی لێکراو فریودرا، هەرچەندە دادوەری خۆرەتاو بوو
یەکێکیش بوو لە چاوەکانی ڕۆحی ئاسمان
پاشان ئاوڕی لەو درۆزن و فێڵبازە دایەوەو ڕاستەخۆ وەڵامی دایەوە:
ئەی فریشتەی جوان، ئارەزووی تۆ بۆ زانینی داهێنانەکانی ئاسمان
تا درووود بنێری بۆ ئەفرێنەری مەزنی ئەو داهێنانە
نابێتە زێدەڕۆیی، کە نەگاتە سنووری لۆمە
بەڵکو ئەوە سیفەتێکە چەند زۆر بێت ستایش دەکرێت

## 98

بۆ ئەوەی بە چاوی خۆت ئەوە ببینیت، کە هەندێك تەنها بەوە قەناعەتیان هات
کە گوێیان لە ڕاپۆرتەکەی ئاسمان بێت و بەس
چونکە هەموو کارەکانی مایەی سەرسامین
پێزانینی خۆشە و شایانی ئەوشە هەمووی باسکرێ
هەمیشە خۆشی دەهێنن، بەڵام کام ئەقڵی ئەفرێنراو دەتوانێ بیانژمێرێ
یاخود ئەو حیکمەتە گەورەیەی ئەفراندنیان تێبگات؟هۆیە کانیشی
بشارێتەوە
من بینیم، بە وشەیەك کۆمەڵە قەبارەیەکی بێ شێوەی دروست کرد
کە بوونە مژادی دروستکردنی ئەم جیهانە

## 99

ئەو مژادانە بەسەر یەکەوە کەڵەکە کران و
دەنگی تێکچڕژانی پڕ لە جۆش و خرۆش بیسترا
چوونە ژێر باری فەرمانییەوەو ئاوەها بێسنوور مانەوەە
کە فەرمانی دووەمی خۆی دەرکرد، تاریکی ڕایکرد و رۆشنایی درەوشایەوە
لەناو دڵی نارێکیدا، ڕێکییەك هاتە ئاراوە
هەرچوار رەگەز- خاك و باو ئاگر و ئاو- بەپەلە گەیشتن
پاشان جەوهەری کاریگەریی ئاسمان بەرز بۆوە
لە وێ کەوتە سووڕانەوەو بەدەوی خۆیا پێچی خواردەوە
بوو بە ئەستێرەی درەوشاوە، لە ژمارنەدەهاتن، دەبینران و دەجولانەوە

## 100

هەر ئەستێرەو شوێنی تازەی خۆی هەیەو ڕێگەی خۆی هەیە
ئەوانی تریش لە بازنەی دیواری کەون، کەوتنە ڕێکخستنەوە

سەیری ئەو تۆپەی خوارەوە بکە، ئەو تەنیشتەی ڕووی لە ئێمەیە
تیشکی خۆری لێ پێچەوانە دەبێتەوەو ڕووناك دەبێتەوە
ئەو شوێنە، زەوییە بارەگای مرۆڤەکانە
ئەو تیشك و ڕووناکیەش دەبینی ئەوە ڕۆژی مرۆڤەکانە
بەبێ ئەوە، وەکو نیوەکەی تری زەوی، تاریکی هێرشی دەکااتە سەر
بەڵام ئەو مانگەی بە تەکیەوەیە
( ئەوە ناوی ئەو ئەستێرە جوانەیە کە ڕووبەڕوومانە)
لەو میانەدا دێتە یارمەتیمان وسووڕی مانگانەی خۆی دەکات
تاکۆتایی دێت، پاشان سەر لە نوێ لە ناوەندی ئاسمان دەست پێدەکاتەوە

## 101

مانگ ڕووناکی وەردەگرێ بۆ ئەوەی بە دەرکەوێ
بە سێ(١) شێوەی جیا جیا ڕووناکی دەبەشێتەوە
بە سوڵتانی ڕەنگ زەردی خۆیەوە لغاوی شەو دەکات
ئەو پارچە شوێنەی من باسم کرد ئەوە فیردەوسە
ماڵی ئادەم لەوێیەو ئەوەی گووت و پاشان سووڕایەوە
ئەهریمەن بۆی چەمایەوەو ئەوەیان نەریتی رۆحە بەرزەکانی ئاسمانە
ڕێزگرتن ئەرکە، فریشتەکە ڕۆیی
ئەهریمەنیش بەرەو کەناری خوارەوەی زەوی چوو
لە ژێر بازنەی بورجەکانەوە، بەهیوای سەرکەوتن بوو
بەرز و خێرا هەڵفڕی، دوای چەند گێژەنێکی هەوایی هەر نەوەستا
تا لە ترۆپکی چیای نیفاتیس[٢] دابەزییە سەر پێیەکانی [٣].

١- بەدر ، هیلال، مەحاق
٢- نیفاتیس، لە سنووری ئەرمینیاو ئاشور، ملتون دەڵێت رووباری دیجلە یەکەم رووباری فیردەوسە، بەر لەوەی لقی لێ ببێتەوە.
٣- لە هەمان ئەوبەشەدا هاتووە کە ئەهریمەن چاوی بە یرئیل دەکەوێ، کە یەکێکە

- هەروەها سەبارەت بەوەی کە ئەهریمەن شێوەی خۆی دەگۆڕێت، - برود بنت
- دەڵێت: هەموو گۆڕانێکی شێوە یا سروشت، بە شەڕو خراپە دەژمێردرێت، ڕووکارێکە لە ڕووکارەکانی ڕمانی مرۆڤ، وەك چۆن ئەهریمەن خۆی وەك نیمچە فریشتەیەك نیشاندەدات دوای هەڵگەڕانەوەی لە ئاسمان، لەوکاتەی کی یورئیل دەبینێ و فریوی دەدات.

- لەباسی ئەکسیردا کە ئەوەیش ڕەگەزێکەو نێوەندێکی کیمیاییە، یا سروشتییە دەتوانێ هەر کانزایەك هەبێت، بیکات بە زێڕ، کە ئەوەش بەسەر بەردی فەیلەسووفاندا پیادە دەبێت، کیمیاگەرەکان هەوڵیان دەدا، بگەنە ئەکسیرێك ، کە تەمەنی دریژ بێت، وەك چۆن ناویان نابوو زێڕی شل، هەروەها سەری کیمیا، لەم بەشەدا هاتووە، کە سیفەتی گونجاوی خۆرەتاوە، چونکە کاریگەرێتی تا ناو زەوی ڕوو دەچێت، هەرلەمبارەوە ناوی بەردی ئۆریم هاتووە کە لە سفری دەرچوون٢٨ -٣٠ باسکراوە، گوایە هەر ئەوە بەردی فەیلەسووفانە، باوەڕ وابووە ئەو بەردە کانزا دەکات بە زێڕ چونکە بەردێکی خۆرەتاوییە.

- ملتۆن کەباس لە دوازدە گەوهەرەکانی هاروون دەکات، مەبەستی هەر دوازدە قەبیلەی بەنی سەراییلە، ڕەنگە مەبەستی ئەوەش بێت کە کانزا بکەن بەزێر یا بۆ دوانزە پلەی کانزایی. هەروەها کە باس لە زرێی هاروون

---

لەو حەوت فریشتانەی بارەگای ئاسمان، هەلبەت ئەوە لە سیفری زەکەریا هاتووە، ئەوفریشتانە چاوی خوان لەسەر زەویدا دەسووڕێنەوە، بەلام وەک حەوت فریشتە، لە خەونی یۆحناوە هاتووە١-٤ .
(- ئوریل یا یورئیل بە مانای خوا دێت، هەرچەندە ئەو ناوە لە کتێبی پیرۆزدا نەهاتووە، بەلام لە کولتووری یەهوودییەکانەوە هاتووە، یەکێکە لە گەورە فریشتەکان، لە تەک میخائیل و رۆفائیل و جابرائیل، ئەوانە حوکمی هەرچوار ئەقلیم دەکەن، رافەکاران پێیان سەیرە کە ملتوون بۆ خۆرەتاوی تایبەت کردووە بەم فریشتەیە؟ کە فریشتەکان وزەیەکی زەینین تەنها حوکمی ئەستێرەکان دەکەن، بە ئاوارتەی میکائیل کە ئەستێرەی زوهرەی بۆ تایبەتکراوە، جابرائیل بۆ مەریخ و رافایل بۆ موشتەری، خۆرەتاویش بۆ ئوریل لەگەڵ ئەدۆنیس .
- لە شوێنێکی ئەم بەشەدا هاتووە، کە خوا هەندێ لە زانستەکان بە نهێنی دەهێڵێتەوە، هەتا تا فریشتەکانیش نایزانن، ئەوەیش بەو مانایە دێت کە خودا مرۆڤ لە زۆر زانست بێبەش دەکات، هەتا مەسیحیش پەی بە هەموو نهێنییەکان نابات.

دەکات، کە بە چەندین بەردی گرانبەها رازاوەتەوە، بریتیە لە ئاقیقی سوور لە چینی یەکەم، هەروەها یاقووتی زەردو زومەرەد، هەروەها زەبەرجەد لە جیاتی ئەڵماس لە چینی چوارەم. )

## 1

ئای بۆ ئەو هاوارە بێدارکەرەوەیە[1] ؟ ئەو هاوارەی
کە خەونبینەکە بیستبووی و لە ئاسمان دەنگی دەدایەوە
ئەشکە بووزەکە دوای ئەوەی کە بۆ دووەمجار داڕما
بە تووڕەییەوە هاتۆتە خوارەوە، تا تۆڵە لە مرۆڤ بکاتەوە
(وای بۆ ئازاری دانیشتووانانی زەوی) [2]
بریا هەر ئێستا ئەوەت دەگووتەوە
هێشتا کاتێکی زۆرەیە، تا دایباوانی کەونار ئاگادا بکەیتەوە
کەوا دوشمنی نهێنییان بە ڕاکردنەوە هاتۆتە لایان
بەسوتفە لە داوی هیلاك بوون قوتاری بووە
ئەوە ئەهریمەنە وا دادەبەزێ، یەکەمجار بە تووڕەیی خۆیەوە گڕی گرتووەو[3]
سەرلێشێوانی، پێش گوناهبارکردنی ڕەگەزی مرۆڤ کەوتووە
تا لە تاو بەزینی خۆی، لە یەکەم شەڕو کەوتنە خوارەوەی بۆ ناو دۆزەخ
تۆڵە لە مرۆڤی بێگوناە و لاوازە بکاتەوە
بەڵام دڵخۆش نەبوو بە هاتنی، هەرچەند ئازاو جەسوور بوو
چونکە هیچ هۆکارێك نەبوو تا شانازی پێوە بکات

## 2

ئیدی دەستی بە هەوڵە چەپەڵەکانی کرد، کاتی جێبەجێکردنی هاتووە
سینەی مشتی شڵەژان و هەڵچوون بووە و خێرا وەنزیك دەکەوێتەوە
بەڵام وەك یاسایەکی شەیتانی، لەخۆی هەڵدەگەڕێتەوە
تۆقین و گومان بیروخەیاڵیان پەرش و بڵاو کردۆتەوە

١- ئای بۆ ئەو هاوارە، خاوەنی خەونەکە یوحنایە، دەنگی بێداری وێنەیەکە یوحنا لە روئیای 21: 3-02 بەرجەستەی کردووە،
2- وای بۆ ئازاراری دانیشتووانی زەوی، هاوارێکە خەڵکی لەوە ئاگادار دەکاتەوە، کە ئەهریمەن بە هەموو تووڕەیی خۆی هاتۆتە سەر زەوی.
3- گڕی گرتووە، هێمایە بۆ شەیتان.

دۆزەخی ناخەوەی لە ناوەوەی خۆیا دەکوڵێ
دۆزەخی هێناوەتە ناخی خۆی و دەوروبەری خۆی
نەك هەر ئەمە، بەڵکو ناتوانێ، یەك هەنگاو، لە دۆزەخ نزیك کەوێتەوە ،
تەنها بە قەد ئەوەی کە لە خۆی دوور دەکەوێتەوە
هەرچەند شوێنکات بگۆڕێ، ویژدان ئەو نائومێدییە بەئاگادێنێ و یادەوەرییە ئازاربەخشەکان بێدار دەکاتەوە
یادەوەری ئەوەی کە چون بوو و چی لێهات؟
ئەوەیشیان هیچ چاری نییە، دەبێ خراپتروڕەشتر بێت
چونکە خراپەکاری تەنها بە دووی خراپەزاری دا دەچێت
- دۆزەخی ناوەوەی، میلتون دەیەوێت هەمان مانای مەمفیستۆ بدا بە دەستەوە، لە شانۆگەری دکتور فاوستی کریستۆڤەر مارلۆدا،
کە دۆزەخ سنووری نییەو لە شوێنێ نامینێتەوە، دۆزەخ لە کوێ بێت، ئەوە ئەبەد لەوێیە.

# 3

ئێستا فیردەوسی عەدن[1] لەبەرچاوییەتی، زۆر جوان و دڵگیرە
جارێك چاوی پڕ لە بەدبینی و خەمگینی خۆی دەگێڕێت
جارێك سەیری ئاسمان و خۆرەتاوی درەوشاوە دەکات
ئێستاکە بورجی نیوەڕۆی[2] بەرزو بڵند، سەرهەڵگەڕاوە
بەناو ڕامان و داماندا هەڵیسووڕاند، ئینجا ئاخ و داخ بەسەریا زاڵ بوو و گووتی : تۆ ئەی ئەوکەسەی، کە مەزنی و گەورەیی تاجی تۆیە
لە ئاسماند بە دەسەڵاتی تاکرەهەندتەوە، وەك خوا دیاری بۆ ئەم جیهانە تازەیە بەدیارکەوتنت ئەستێرە جۆراوجۆرەکان دادەپۆشی و دەیانشارێتەوە
من بەدەنگێ بانگت دەکەم، کە دەنگێکی دۆستانە نییە و ناوت دەهێنم

1- عەدن: واتە فیردەوس، ئەم وشەیە لە عەرەبی بە مانای خۆشی دێت.
2- بورجی نیوەڕۆ لە فیرژیل وەرگیراوە، هێمایە بۆ بڕیاردان لە کارێ، کە ئیدی ڕۆژ گەیشتۆتە ناوەندی ئاسمان.

## 4

ئەی خۆرەتاو، من پێت ناڵێم چەند ڕقم لە تیشکەکانتە
ئەو پلەو پایەیەم  بیردەهێننەوە کە لە دەستم چوو
هەر وەها ئەو شوێنەم بیردێنێتەوە کە کەوتمە ناوییەوە
جوانی و گەورەیی من، لە سەرووی جوانی،و گەورەیی تۆوە بوو
تا ئەو کاتەی لەخۆبایی بوونم و ئارەزووی چەپەڵی خۆم، منیان ڕماند [1]
ئەوەش دوای جەنگەکەی ئاسمان بوو، لەدژی پاشا
کە هیچ شتێ وەکو ئەو نییە، نازانم بۆ وامکرد؟
چونکە ئەو شایەنی ئەو پاداشتە نەبوو لەمنەوە
دوای ئەوەی کە منی وەك چۆن کە هەم،  ئاوا ئەفراند
دوای ئەوەی کە ئەو هەموو چاکە و جوانییەی بە من بەخشی
منیش هیچ مەمنوون نەبووم، پەرستنیشی ئەوەندە گران نەبوو بۆ من
لانی کەم دەبوایە سپاسی بکەم
وای  ئەو پاداشتە چەند  ئاسان بوو، دەبوایە سوپاسی بکەم
هەرچەندە شایستەی زۆر زۆرتر بوو

## 5

بەڵام چاکەی ئەو بۆ من، لە دەروونی مندا بوو بە خراپەو بەدکاری
ڕق و قینی لێشین بوو، پایەی بەرزی من وای لێکردم
ڕەتی ئەوە بکەمەوەوسەر بۆ ئەو دانەوێنم
من وام خەیاڵ دەکرد، ئەگەر پلەیەك بەرزتر ببوومایەوە
لە هەمووان باڵادەستتر دەبووم
ئا بەمجۆرە لە یەکساتدا، ئاینی گەورەی من بۆ ئەو داڕما
ئاینی چاکەی هەتا هەتایی، ئەوەیان بارێکی گران و سەنگینە
کە هێشا باجەکەی دەدەم، هێشتاکەش هەر هەق بەوە

1- منیان ڕماند، ئەهریمەن لێرەدا لە دژی خۆی قسەدەکات، لەبەر ئەوەی لە دۆخێکی وادایە، ئەوەی ناخی هەڵدەڕێژێ.

## 6

نەمدەزانی کاتێ دەروون دان بەو چاکە یە دادەنێت، کە قەرزاریەتی
ئەوە لە یەك کاتا،هەم قەرزەکەی لەسەر لادەچێ وهەم قەرزەکەی دەداتەوە
ئیدی ئەو لە یەك کاتدا، هەم پێیەوە قەرزارەو هەم بێبەرییە لەم قەرزە
ئاخ ئەگەر ئەو قەدەرە بەهێزەی ئەو، وای بەسەر مندا قەزاوەت کردبا
ببوومایەوە فریشتەیەکی کەمتر پایە، ئەوە ڕازی دەبووم و بەختەوەر دەبووم
بەڵام کوا ئاواتی ڕەها، ئارەزوو دەهێنێتە کایەوە؟ بەڵام بۆ نا؟
لەوانەیە یەکێ لە گەورە گەورەکانی غەنیمی من
تووشی هەمان ئەو ئارەزووە بێت، کە من لەو نزم تریشم
ئەوە دەچمە ڕیزی ئەوەوە
بەڵام ئەوانەی وەکو من بەهێزو بلیمەتن هەرگیز نابەزن
بەڵکو لە دەرەوەو لە ناوەوە
بەرامبەر هەموو وەسوەسەیەك خۆیان ڕادەگرن

## 7

جا ئایا تۆ ئیرادەیەکی سەربەخۆت هەیە تا ئەوە بسەلمێنی؟
بەڵێ هەتە،کەواتە کێ تاوانبار دەکەیت و چ شتێ تاوانبار دەکەی؟
تەنها ئەو خۆشەویستییەی
کە هەموو ئاسمان بە دادو دادپەروەرییەوە دادەپۆشێ؟
کەواتە نەفرەت لە خۆشەویستییەکەی
ئەگەر خۆشەویستی بێت، یا ڕق و قین؟
لای من وەك یەکن، کە خەرەندی دۆزەخی دەرخوارد دام
نا نا نەفرەت لە تۆ ئەی دەروونی خۆم
کە بەویستی خۆت لە ویستی ئەوهەڵگەڕایتەوە

بێئەوەی کەس ناچارت بکات
ئەو چارەنووسەت بۆ خۆت هەڵبژارد، ئێستاکەش بۆی دەگری

## 8

ئەی تووڕەیی بێکۆتایی و نائومێدی بێ دیماهی
وای چەند چارەڕەشم ؟ ئێستا بۆکوێ سەرهەڵگرم؟
بۆ هەر لایەك بچم دۆزەخێ هەیە، دەروونی خۆم دۆزەخە
لە قووڵترین خەرەندەوە، خەرەندێکی قووڵتر هەیە
هەڕەشەی قووت دانم دەکات و دەمی بەش کردۆتەوە
ئەو دۆزەخەی تووشی هاتووم، فیردەوسە لە چاو ئەوخەرەندە قووڵە
کەواتە با باڵەکانم شۆڕکەمەوە، قاتی مەودایێ هەیە بۆ تۆبەکردن؟
ئایا هیچ مەودایێ نییە بۆ لێخۆشبوون و لێبوردن؟
نا هیچ ڕێگایێ نییە، جگە لە خۆبەدەستەوە دان
بەڵام لووتبەرزیەکەم و ترسم لەوەی کە شەرمەزار دەبم
لە ناو ئەو ڕۆحانەی کە بە وادەو شتی گەورەی تر، فریومدان
بەوەی خۆیان نەدەن بە دەستەوە، لێناگەڕێ ئەو کارە بکەم
- لێبوردن، بەڕای ملتون ئەو لێبوردنە، بەبێ خوا ناکرێ واتە بەرجەستە کردنی کوڕ .

## 9

خۆم بەوە هەڵدەدایەوە، کە من دەتوانم ئاسمان بخەمە ژێر دەستمەوە
ئاخ بۆ خۆم، کەمن ئەوانەی دەرك بەوە دەکەن
کە پابەندیم بەو شانازییە بۆشەوە، چ بارێکی خستۆتە سەر شانم
هەروەها ئەو ئازارەی کە لە ناخەوەم دەناڵێنێ
ئەوانیش لێرە لە سەرەوەی عەرشی دۆزەخدا دەمپەرستن

## 10

تاجم لەسەر کردو سۆڵجانم گرتە دەست و بەرزبوومەوە
دابەزین و دارِمانم هەروا زۆر دەبێ
بە شەقاوەت نەبێ ناتوانم بەسەریا زاڵ بم
ئەوەیە ئەو شادییەی کە ئارەزووەکانم بەدیانهێناوە !
با وای دابنێین کە دەتوانم پەشیمان ببمەوە و
پایەی جارانم بە لێبورد ن، لەودا بە دەست بهێنمەوە
بەوەش هەر زوو بیرۆکە بەرزەکانی خۆم دێتەوە بیر
هەر زوو پاشگەز دەبمەوە لەو سوێندەی کە خواردوومە
چونکە خۆشی و شادی هەمیشە ئەو باوەرِە بە دوور دەخەنەوە
کە لە بەر ئێش و ئازاردا، سوێندم پێ خواردووە و
باتیڵ و بۆشە، ئەو ئاشتبوونەوەیە هەرگیز  گەشە ناکات

## 11

لەبەر ئەوەی بێزواندن و قێزەوەن کردنی ترسناك
برینێکی قووڵی هەڵکەندووە
تووشی شکستێکی خراترو دارِمانێکی توندترم دەکات
ئیدی هەلێکی کورتخایەن و گران
ئێش و ئازارێکی دووئەوەندەم پێدەکرێ
هەڵبەت ئەوەی کە سزام دەدات، دەرك بەوە دەکات
جا بۆیە وەك چۆن ئەو دوورە لەوەی بمبووریێ
ئەوە منیش دەرۆزەی ئاشتی لێناکەم

## 12

ئابەمجۆرە هەموو ئاواتەكان كۆتاییان هاتووە
سەیری ئەو شوێنە دەكەم كە لێیەوە ئاوارە كراین
چۆن بووتە سەرچاوەی تازەی خۆشی مرۆڤ
ئەو مرۆڤەی كە ئەفرێنراو، لە پێناویشیا ئەو جیهانە ئەفرێنرا
كەواتە ماڵاوا ئەی ئێش و ئازار، ماڵاوا ئەی پەشیمانی
ماڵاوا ئەی ترس ، هەموو چاكەیەك لە من چوو و ون بوو

## 13

با خراپەكاری ببێتە چاكەكاری من
لانی كەم بە تۆوە سەرو سامانی ئەم كەونە
لە میانی خۆم و ئاسماندا، دابەش دەكەم
لەوانەیە هەر بە چاكی تۆوە، فەرمان ڕەوایەتی نیوەی بكەم [1]
بەمزوانە مرۆڤ و ئەم دونیایە
دمرك  بە ڕاستی و دروستی قسەكانی من دەكەن
لە كاتی قسە كردنیا هەستەكانی تاریك دادەهاتن
ڕوخساریان تاریك دەكردو سێبەریان بەسەردا هەڵدەخست
سێبەری رەنگزەردی تووڕەیی و حەسوودی بێئومێدی

## 14

ڕوخساری شاراوەی گرژو مۆن بوو وساختەكانی بەرمەلا بوو ، ئەگەر چاوێك هەبوایە بینیبایە

1- فەرمان ڕەوایەتی نیوەی بکەم، ئەهریمەن وای خەیاڵ بوو، کە حوکمی زەوی بکات ، ئەگەر دۆزەخیشی بێتە سەر، لە ئاسمان فراوانتر دەبێ.

ئەو تێکەڵەیە لە چەپەڵی ناتوانێ[1] ، دەروونی ئاسمان لێڵ بکات
بێبەرییە لەو، هەر زوو ئەهریمەن دەرکی بەوە کرد
ڕووی خۆی کپ و هێمن کردەوەو شڵەژانەکانی داپۆشی
ئەو هەمیشە داهێنەری تەڵەکەبازییە
یەکەمین کەسە کە کاری گومڕاکردن، بە تارای قەداسەت دادەپۆشێ
تا ڕق و قینی شاردراوەی ناو تۆڵەسەندنەوە بشارێتەوە
بەڵام ئەوەندەی پرۆڤە نەکردبوو، بەس بێ بۆ فریودانی ئوریل

## 15

ئوریل لە ئەهریمەن بە ئاگابوو، بە چاوەکانی بە دوایدا دەچوو
لەو کاتەی ڕێی خۆی گرتبووە بەرو بەسەر چیای ئاشووریدا دادەبەزی
بینی کە ئەو زیاتر لە ڕۆحە خۆشەکان، شێرزەدەبێ و دەگۆڕێ
ئەهریمەنی وەحشی کاتێ هەستی کرد
کە ئەو نابینرێ و کەس چاودێری ناکات
سەیری بزاوتی خۆی کرد وکەوتە چاودێری کردنی شێتایەتی خۆیەوە

## 16

ئابەمجۆرە بەردەوام بوو لە ڕۆیشتن، تا گەیشتە سنووری عەدنەوە
- فیردەوسی شیرین- ئەوسا زیاتر چووە پێشەوە
وەك تاجێك وابوو بە پەرژین و تانۆکی سەوزییەوە
یاخود وەك گردێکی گوندینی ناو وڵاتێکی دیاروئاشکرا وابوو
کە بە دارودرەختێکی زۆرو بڵندی ناو دەشتاییەکان تاجبەند کرابوو
پرچی چڕوپڕیشی بە شێوەیەکی غەریب و کێوییانە
بەسەر هەردوو ڕۆخانەیەوە شۆڕ بووبۆوە

---

1- تێکەڵەی چەپەڵی، هێمایە بۆ ئەو چوار شتەی جەستەی مرۆڤ دەریاندەدا.

به چەشنێك كەس نەیدەتوانی لێی نزیك بێتەوە
لە سەرووشیەوە درەختی بەرز بەرز بە سێبەرێكی زۆرەوە هەبوو
درەختی ئیرز و كاژو سنۆبەرو دارخورمای جوان
وەك ئەوەی دارستانێ بێ لە دارستانەكان
بەڵام پەیژە سەرهەڵگەڕاوەكان، كە سایە لە دوای سایە بوو
ئەوەیان بریتی بوو لە شانۆی دارین – ئاجام -[١]
دیمەنێكی هێجگار جوانی هەبوو، بەسەرهەموو لوتكەكانیشیەوە
دیواری فیردەوسی سەوز بوو

## 17

به شێوەك كە باوكی گەورەمان- باوكی گەورەمان، واتە ئادەم. [٢]
دەیتوانی
دەوری ئەو مەملەكەتەی دونیای هاوسێی بدات [٣]
بەسەر ئەو دیوارەوە بازنەیەك، لە باشترین درەخت هەبوو
كە هەموویان تژی خۆشترین جۆری میوە بوون
هەموو میوەو چرۆكان لە یەك كاتدا، بە رەنگێكی زێرین خۆیان دەنواند
تێكەڵ بە ڕەنگی جوان و گەشاوە دەبوون

## 18

خۆرەتاو دڵخۆشتر بوو، بەوەی تیشكەكانی هەڵاوێتە سەریانەوە
زیاتر لەو هەورە جوانەكان، یاخود لە پەلكە زێڕینە
كاتێ خودا بارانی بەسەردا دەبارێنێ
وای جیلوەی ئەو دیمەنە چەند تژی داهێنانە

1- ئاجام، ئەوە تەختە شانۆی تراژیدی ئەوە، واتە هی ئەهریمەن.
2- باوكی گەورەمان، واتە ئادەم.
3-دەوری مەملەكەتي هاوسێ..... لە تەكوین وەرگیراوە 82:1

له هەوای سافدا هەوای ساف دێته دەرەوە
دەگات بە ئەهریمەن و دەچێتە دڵیەوە
شادی و خۆشی بەهار هەموو خۆشییەکانی هەرماس
دەسڕێتەوە، نائومێدی نەبێ

**19**

ئێستاکە شنەبایێ هەڵدەکات و باڵەفڕکە دەکات
عەتری ئەو ناوە بڵاو دەکاتەوەو بە چرپە سەرچاوەی ئەو
هەموو دەسکەوتە بۆندارانە ئاشکرا دەکات
سەیری ئەو کەشتییەوانانە بکە
کاتێ راس الرجاء تێپەڕ دەکەن و مۆزەمبیق جێدەهێڵن
بای باکووری ڕۆژهەڵاتی، بەسەریاندا هەڵدەکات
بۆنی عەتری سەبەئی سەر کەناری عەترین
لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێ و دەبات
ئەوانیش بە دواکەوتنی کاروانەکەیان دڵخۆش دەبن
بۆیە لەسەرەخۆ و هێدی هێدی، فەرسەخێکی زۆر دەبڕن

**20**

ئابەمجۆرە ئەو بۆن و بەرامە عەتراویانە گەیشتە بەر لووتی شەیتان
کەچی ئەویش هاتووە وێرانی بکات، کە خۆی زیاتر
لە دڵخۆشی ئەسمۆدیۆس[1] بە دوکەڵی ماسی، دڵخۆشتر بووبوو
سەرەڕای ئەشقەکەی دووری خستەوە لە ئەبو تۆبیتی مێردەکەی
پاشان تۆڵەی لێکردەوە و دووری خستەوە لە وڵاتی میدیاوە بۆ میسر
لەوێ خستبوویانە ناو کۆت و زنجیرەوە

1- توبێتی ئەسمۆدیس، میلتۆن باس لە تۆبیتی ئەبوگریکی دەکات، لە سەفەرەکەی بۆ وڵاتی فارس - ملتون وڵاتی میدیای ناو ناوە- زەماوەندی لە گەڵ سارە کرد، کە ئەسمۆدیۆس ی عەشیقەکەی ئەو، هەر حەوت مێردەکەی ئەوی کوشتبوو، لە شەوی زاوتیەتیدا. فریشتەی خوا رافایل هات و ئامۆژگاری توبیتی کرد، کە دڵي ماسي بسووتێنێ، تا ئەو جنۆکەیە دووركەوێتەوە. کتێبي پیرۆز گوبیت 8:3

## 21

ئێستاکە لە پێناوی سەرکەوتن بەسەر چیایە بەرزە وەحشییەکەوە
ئەهریمەن بە بیرکردنەوەیەکی زۆرو لەسەرخۆییەکی فرەوە
ماندووبوونێکی شەکەت بەخشی ئەو سەفەرەی کێشاوە
بەڵام دواییش هیچ ڕێگایەکی نەدۆزییەوە پێیدا بچێتە ژوورەوە
چونکە ڕووەکەکانی زەوی وەها تێکئاڵۆسکاو بوو بوون
وەك ئەوەی درەختی دڕکێکی بەردوامی گیاو دەوەنی تێئاڵا بێ
بە شێوەیەك کە ڕێگری دەکرد، لە مرۆڤ و ئاژەڵ
هیچ دەرگایەك نەمابوو، تەنها لەو بەرەوە لای ڕۆژهەڵات نەبێ

## 22

کاتێ ئەو تاوانیارە گەورەیە دەرگاکەی بینی
شەرمی بەخۆ بوو بە دەروازەکەیدا بچێتە ژوورەوە
بە بازێکی سووکەڵە[1]، سنوری تەواوی بان و دیوارە بەرزەکانی تێپەڕ کرد
بە تەواوی چوو ژوورەو دابەزییە سەر پێیەکانی خۆی

## 23

وەکو ئەو گورگەی کە بۆنی نێچیر بکات
لەو کاتەی کە برسییەتی ڕایدەدا، تا لە شوێنێکی تازەدا بۆی بگەڕێت
دەچێ تا چاودێری ئەو شوێنە بکات، کە ئێواران شوانەکان
مەڕەکانی خۆیان لەناوهۆبەیەکی دیواربەندی، ناو کێڵگەاد کۆدەکەنەوە
بە ئاسانی بەسەر دیوارەکەدا بازدەداو دەچێتە ناو هۆبەکەوە

1- بە بازێکی سوکەڵە.... ئەوەیان رەخنەیەکی زۆری نایەوە، کە ئاخۆ شەیتان چۆن توانی بە قەڵەمبازێک، ئەو هەموو دیوارانە ببڕێت و کەس نەزانێ، ئایا جۆرێک پشتگوێ خستن هەبووە، لە دروست کردنی دیوارەکان؟ کەشەیتان بە هەلی زانیبێ؟ ئەوەی گورگ و دزەکەش مەسەلەکەی هێندەی تر ئاڵۆز کردووە.

یاخود وەك ئەو دزەی کە دەیەوێت، دزی لە کوڕە دەوڵەمەندێك بکات
کە دەرگاکانی بە توندی بە قوفڵ و زنجیر کلیل داوە و
ترسی چوونە ژوورەوەی کەسێکی نییە
بەسەر پەنجەرە دەکەوێ و پاشان دەچێتە سەربان و ئینجا دەچێتە ژوورەوە

## 24

ئابەمجۆرە ئەهریمەن، ئەو دزە - کەیەکەم دزو گەورەترین دزە - بەدزییەوە
چووە ناو هۆبەی ئاسمان
هەر بەمجۆرەش نەزانەکان، سەردەکەون تا بچنە ناو کەلێساوە
ئەلەوێدا هەڵفڕی و بەسەر درەختی ژیانەوە نیشتەوە
کە درەختێکە لە ناوەند و لە هەمویان بەرزترە
وەکو قەلەڕەشیی ئاو [1] بەسەر ئەو درەختەوە هەڵکورما
نەك بۆ گەڕاندنەوەی ژیانی بە هەق، بەڵکو بۆ بەشینەوەی مەرگ بە سەر زیندووەکاندا
بیری لە چاکەی ئەو نەمامە نەکردەوە، کە ژیان دەبەخشێ
بەڵکو وای دانا کە ئەو نەمامە شوێنێکە بۆ چاودێری
بۆئەوەی بزانێ کێ لە دەوروبەریەتی

## 25

جگە لە ئاسمان زۆر کەمن ئەوانەی، نرخی ڕاستەقینەی چاکە دەزانن
بەڵکو بۆ ئەوە هاتبوو تا باشترین شت، بکا بە خراترین شت، یا بێ نرخترینی
دووبارە سەر لەنوێ سەڕی سووڕما، کە سەیری خوارەوەی شوێنەکەی کرد
ئەوەی بینی، بووە مایەی خۆشی، خۆشییەکی تەواو خۆشی

1- قەلەڕەشی ئاو، هێمایە بۆ کەسێکی مژاد پەرست و تەماحکار، بەلام تێرمێکە بۆ پیاوانی کەلێسا.

تەواوی سەروسامانی سروشت هەمووی، لە پارچەیەکی تەسکدا کۆبۆتەوە
ئاسمانی بەسەر ئەرزەوە بینی، ئەوە فیردەسی پیرۆزی ئاسمان بوو
کە ئاسمان خەڵقی کردووەو لە ڕۆژهەڵاتی عەدنی چاندووە

## 26

بەڵام سنووری عەدن لەهورانی[1] ڕۆژهەڵاتەوە
تا بورجە کانی پاشایی لە سلۆشیای مەزندا هەڵدەکشێ
کە پاشاکانی یۆنان دروستیان کردبوون
کە کوڕانی عەدن لە دێرزەمانەوە لە تەلسار[2] دەژیان
هەر لەو زەوییە جوانەدا بوو
کە خودا ویستی فیردەوسەکەی جوانتر ڕازاوەتر بێت

## 27

ئاسمان ویستی فیردەوسی خۆی خۆش بکات، لە دەرەوەی زەوی بە پیت
وای لە درەختەکان کرد، کە لە ناو ئەو خۆڵە جوانەدا بڕوێن
درەختەکان شین بوون و ڕووکاروبۆن وبەرامەو چێژ و بۆیان گرتە خۆ
لە ناوەندی هەمووی ئەوانەوەشەوە، درەختی ژیان[3] بوو
درەختێکی زێڕ کفتی ڕووەکی پڕبەر[4]، بەرەکەشی زێڕین میوەی ئەبەدی
بوو

---

1- هۆرانی، شارێکە سەرکردەیەکی ئەسکەندەر دروستی کردووە، لە سەر ڕووباری دیجلە، لە ناوەندی عیراق
2- تەلسار، واباوەڕە کە ئەو شارە عەدن بێت بە پێی ملوکی 2- 21- 91
3- درەختی ژیان، درەختێکە لە ناوەندی فیردەوس ودرەختی چاکەوخراپەو مەعریفەیە.
4- میوەی زێڕین،هێمایە بۆ میوەی هیسبیریا ، کە هەرقەڵ سەرەڕای درنجە زەبەلاحەکەی کە پاسەوانی لەم میوەیە دەکرد، دەیڕنی، لە کتێبی ئوفید – میتامۆرفۆس– ەوە هاتووە.

## 28

له تەك ژیاندا مەرگ هەبوو، كە درەختی مەعریفەت  لە نزیكی بوو
مەعریفەی چاكە بە مەعریفەی خراپە
بەرەو باشوورو بەناو عەدن دا، ڕووبارێكی گەورە دەهاتە خوارەوە
ڕێڕەوی خۆی نەدەگۆڕی، بەڵكو بە بنی چیایەكدا ڕەت دەبوو
خوا ئەو چیایەی بۆیە هاوێشتە سەر زەوی
تا ببێتە ستوونی فیردەوسی خۆی

## 29

ئەو ستوونەی بەسەر ئەو ڕووبارە هەڵڕژاوەدا بەرز كردەوە
كە بە ناو دەمارەكانی زەوی كونكوندا ڕەت دەبوو
زەوی بە هێزی تێنوێتی خۆیەوە، ئەو ئاوەی ڕاكێش دەكرد
دەبوو بە كانیاوێكی شیرین و جۆگەلەی لەبەر دەڕۆیشت
فیردەوسییان ئاو دەدا، بۆ خوارەوەی ئەو دۆڵە قووڵەوە شۆڕدەبۆوە
تا دەگەیشتە  ڕووبارەكەی ژێرەوەی
كە ئێستا لە دەرەوەی ڕاڕەوی تاریكیدا دەبیندرێت

## 30

دەبێتە چوار جۆگەلەی گەورە بە پەرش و بڵاوی دەڕوات و
بەناو گەلێ لە مەملەكەتەكاندا دەسووڕێتەوە
ئەو شارانەی كە پێویست ناكات ناویان بهێنین
بەڵام دەبێ وەسفیان بكەین — مەگەر هونەری مەزن  بتوانێ وەسفیان بكات
چۆن چۆنی كانی یاقووتی شین هەڵدەرژایە ناو چۆمی شەپۆل ئامێزەوە
كە بە سەرلمی زێڕین و لوئلوئی درەوشاوەدا هەڵدەقوڵا
ئینجا بە شێوەیەكی خوارو خێچ لە ژێر سێبەرەكاندا وەردەچەرخا

## 31

ئینجا وەك شیلەیەكی ڕوون، بۆ هەموو ڕووەكەكان دەڕۆیی و
خۆراكی بۆ گوڵەكانی فیردەوسی ڕاستەقینە دەبرد
ئەو گوڵانەی كە هێشتا هونەرە جوانەكان
لە نێو گۆڵی ڕازاوەدا، یا لە نێو ملوانكەی ڕەنگیندا
پۆلبەندی نەكردوون، بەڵكو بەخششی سروشتە
كە بە سەخاوەتەوە، ڕژاوەتە سەر چیاو ناو دۆڵ و دەشتاییەكان

## 32

یەكەمجار خۆرەتاوی سپێدەی فێنك درەوشایەوە و
كێڵگە پان و پۆڕەكانی داپۆشی
سێبەرە تۆخەكان داكشان ودارستانەكانیان لە كاتی نیوەڕۆدا
تاریك داهێنا ، ئا بەمجۆرە بوو شوێنەكە، شوێنێكی گوندینی
كپ و خۆش، بە دیمەنی جیا جیاوە، دارستانێكی پڕ لە دارودرەخت
كە شریشی عەترو هەتوانیان لێ دەچۆڕایەوە
جگە لەوانەی كە میوەو بەرو بوومیان، دەدرەوشایەوە

## 33

شیرین شیرین دەلەرینەوەو ئەفسانەی هسبریدیان[1] دەێنایە دی
جا ئەگەر ئەوە ڕاستی بێت، ئەوە چێژێكی خۆشی هەبووە
لە نێوانیاندا ، دەشتایی دەوەن لەوەڕگای پان و پۆڕ بوو
كە مەڕو ماڵات، بەسەر گیای نەرم ونیانیانەوە دەلەوەڕان
یاحود بانەكانی دارخورما، یاخود ئەو گوڵانەی

1 – هسبرید، ئەو چیرۆكانە لە كتیبی میتامۆرفوس ی ئۆڤید 4 :737-086 دا دەدۆزرێنەوە، ئەفسانەی هەرقەل و خواردنی میوەو دێوەكەیە.

لە ئامێزی دۆڵە تەڕو پاراوەکاند
سەریان دەردێناو جوانی خۆیان پەرش و بلاو دەکردەوە
گوڵە بێ دڕکەکان لە هەموو ڕەنگێك بوون

## 34 .

لە لایەکەی ترەوە خەرەندو ئەشکەوتی چڕو سێبەروا هەیە
ئەگەر یەکێ بچێتە ناویەوە بۆ حەسانەوە، ئەوە سەرمای دەبێ
کەپری مێو داپۆشیوە و هێشووی ترێی ئەرخەوانی پێوە دەلەرێتەوە
بە نەرمی بەسەرکەپرەکەدا هەڵدەگەڕێ
لە هەمان کاتدا تاڤگەکان دادەرژێنە ناو تەلانەکان و
پەرش و بلاّو دەبنەوە، یا لە دەریاچەیەکدا کۆدەبنەوە
کە مێرگی ئاس و ڕێحان بەسەر لێوارەکانیا
وەك تاج بە دەوریا سەوز هەڵدەگەڕێن
ڕوون و ڕەوان وەك ئاوێنەی یلووری
لەگەڵ جۆگەلەکان یەکتر دەگرنەوە
باڵندەکان دەچریکێنن و شنەبای بەهاریش هەڵدەکا
کە بۆن و بەرامەی کێڵگەو دارستانەکانی گرتووە
تا گەڵا لەرزیوەکان بەرزەفت بکات

## 35

لەوکاتەی کە بان[1] ی پاشای دارستانەکان
دەستی لە ناو دەستی خوداوەندی نەغمە[2] دەنێت و سەما دەکات

---

1بان، خوداوەندی دراستان، سیمبۆلی سروشت، کە میلتۆن وێنای مەسیح دەکات، وەک شوانێکی هاودژی – بان- ی شوان.

2- -خوداوەندی نەغمە، خوداوەندی نەغمەو سەما لای گریکەکان.

ئەوسا بەهارێکی ئەبەدی بێوێنە، دەنەخشێنێ
لە هیچ کێڵگەیەکی تری جوان و ڕازاوەی ئینا دا ناچێ
کە بروز بینی تیایدا گوڵی دەچنی
کە خۆی گوڵێکی زۆر جوانتر بوو لە هەموو گوڵەکان
دیس ی ڕوو گرژ کەوتە سەری و قرتانذی
ئەوسا کیریس[1] زەحمەتییەکی زۆری کێشاوهەموو دونیای بۆ گەڕا

## 36

هیچ شوێنێ نەدەگەیشتە ئەو فیردەوسە
نە باغستانی دافنی[2] ڕازاوەی تەك ئورینتس وکانیاوی کاستیلیای[3] ئیلهام بەخش
نە فیردەوسی عەدن نە دورگەی نایسا[4] کە رووباری ترابتوون دەوریدەدا
پیرە حام، ئەوەی وسەنییەکان پێی دەڵێن ئامون یا جوف ی لیبی

---

1-ئیناو دیس و کیریس وبروز، لێرەدا ملتون پشت بە ڕۆمانی هومەر دەبەستێ لە - بەستەیەک بۆ دیمیتیر - یاخود خوداوەندی گەنم لای رۆمان، کە - دیس - یاخود هادیس فرِاندی، کە خوداوەندی دۆزەخ بوو، لەو کاتەی کە ئەو ، لە کێلگەی ئینای صقلیەدا گوڵی دەچنی ، ئیدی زەوی هیچی لێ شین نەدەبوو، لەبەر ئەوەی دیمیتیر بە دوای کچەکەیدا دەگەڕا، بەڵام کە - دیسس - ڕازی بوو بەوەی بۆ شەش مانگ بگەڕێتەوە، ئیدی زەوی ناخی خۆی هەڵدایەوەو سەوز هەڵگەڕا، بۆیە دەڵێن زەوی تەنها شەش مانگ سەوز دەبێ لە یەک ساڵدا.

2-باغستانی دافنی، دافنی کچێکی جوان بوو، لەدەست ئەبوللو ڕایکردوە ، داوای لە باوکی کرد، کە خوداوەندی ڕووبار بوو، رزگاری بکات و ئەویش کردی بە درەختی غار، کە ئەبوللو ئەوەی بینی ئەمری کرد ، هەموو پاڵەوانێکی یارییەکانی وەرزشی، تاجی غار لەسەر بکەن، وەک یادەوەری خۆشەویستەکەی، ئەوەشیان لە نزیک ڕووباری ئورینتس بوو، کە ڕووبارێکە لە سوریا پێی دەڵێن – ئاسی – باغەکەی دافنی لە نزیک ئاسیەدا، لە کۆمەڵێک چۆمدا ئاو دەخواتەوە.

3- کاستێلیا کانی ئیلهام بەخشی ئەدەبییە، هرمان هیسە لە گەمەی کەلاشووشەکان باسی کردووە . و.

4- نایسا واتە ئامون ی کوڕی ساتورن و پاشای لیبیا، کە باخۆس کوڕیەتی، تا پارێزراو بێت لە تووڕەیی مێردی – ڕیا- دا ڕەوانەی دوورگەی نیسیای کرد، ئامون لەگەڵ جوبیتر یەکیان گرت، هەروەها لە گەڵ حامی کوڕی نوح

کە ئەمالتیای عەشیقی خۆی  و باخوسی کوڕە تەبەش گوڵینەکەی
لە  ڕیای زرڕدایکی ئەشاردەوە، نەك وەك پاشای ئەسیوپیەکان
کە کوڕانی خۆیان لە چیای ئەمارا دەپاراست
هەندێ پێیان وابوو فیردەوسی حەقیقیە لە هێلی ئەسیوپیدا [1]
لە نزیك کانیاوی نیلدۆسدا[2]، کە بە تاوێرە بەردی درەوشاوە دەورە درابوو

## 37

هەروەها زۆر فراوان و رۆژمرێیەك دوور بوو
لەو فیردەوسە ئاشوورییەدا ئەهریمەن هەستی بەوە کرد
کە هیچ خۆشییەك دڵخۆشی ناکات، هەروەها  ئەو ئەفرێنراوە تازانەش
دڵخۆشی ناکەن ، دوو کەسی خاوەن کەرەمی بالأبەرزی بینی
کە وەك خوداوەندی وەسەنی قیت بووبوونەوە
بە شەرافەتی ڕەسەنییەوە داپۆشرابوون
بە مەزنییەکی ڕوونەوە بەدیارکەوتن
ئەوانە گەورەی هەمووان بوون وشایانی ئەوەش بوون
چونکە لە ڕوخساری پیرۆزیاندا،  وێنەی ئەفرێنەری بەرزو درەوشاوە
لە هەق و حیکمەتی قەداسەتی ساف و ڕووندا
وەك دەسەلأتێکی حەقیقی لە مرۆڤدا،  خۆی دەنواند

## 38

هەرچەند ئەو دووە یەکسان نەبوون
دیار نەبوو کە ڕەگەزیشیان یەکسان بێ
ئەویان بۆ ڕامان و جورئەت ئەفرێنرابوو

1-هێلی ئەسیوپی، جاران وا باوەڕ بوو کە ئەسیوپیا شوێنی فیردەوسی حەقیقییە، لەبەر هێلی ئیستوا
5- نیلۆس خوای نیل بوو لای یۆنانییەکان و لە میسر پێیان دەگووت حابی.

ئەویتریان بۆ نەرم و نیانی و ناسکی و شیرینی
ئەویان ئاسمان بوو[1]، خوا تەنها ئەوی دروست کردوو
ئەویتریشی لەوەوە ئەفراند
توێڵی پان و درەوشاوەی و نیگاکانی بۆ بەرزایی
گوزارشتیان لە دەسەڵاتێکی ڕەها دەکرد
قژی ڕەشیشی ئاڵا بووە دەوری لاجانگییەوە و دەلەریەوە
بەڵام شانەپانەکانی ئەویان نەدەبەزاند

## 39

ئەویان پرچی وەکو چارۆگەیەك نەرم شل
تا کەمەری باریکی هاتبووە خوارەوە
وەك چەند بسکۆڵەیەکی زێڕینی نەڕازاوە و ناڕێك
وەك چۆن تولە مێو، خۆی لە قەد لوولدەدا، کە مانای هاتنە ژێر بارەوەی دەدا
بەڵام هاتنە ژێر بارەویەکی نەرم و نیان، کە ئەویان پێشکەشی بەو دەکرد
ئەویش قبوڵی دەکرد، قبووڵێکردنێکی زۆر باش
بە حورمەتێکی شەرمنانە و کیبریایێکی خاکەڕایی
بە نازوفیزی ئەڤینێکی نەرمەوە دەچووە بنباڵی و ڕازی دەبوو
ئەندامە نهێنییەکانیان شاراوە نەبوون، چونکە هێشتا کارەکانی سروشت
نە شەرمیی گوناهباری هەبوو، نە شورمیی ناپاکیی

40

ئەی شەرەفی ناشەریف، ئەی زایەندەی گوناه
تۆ مرۆڤایەتیت چەند وەڕەس و بێزار کردووە
بەجلی بانگەشەی پاکی، خۆت بەسەر ژیانی خۆشی مرۆڤایەتی وبەسەر

1- ئەویان ئاسمان بوو، باس لەوەیە ئەوکاتە خوا تەنها ئادەمی دروست کردبوو و حەوای لێ زایەند.

بەرائەتی سادەدا زاڵکردووە
سەیرکە ئەوانە بە ڕووتی تێدەپەڕین وەهەتا شەرمییان
لە بینینی خوداو و فریشتانیش نەدەکرد، چونکە نییەتییان پاکبوو
دەست لە ناو دەست، هەر لەو کاتەوە ئامێزیان بە یەکتردا کرد
وەك دڵخۆشترین دوو عاشق گوزەریان دەکرد
ئادەم لە هەموو ئەوانەی کە لە دوایەوە هاتن، باشتر بوو
حەواش جوانترینی کچان بوو
لە ژێر سێبەری کەپرێ لە گیای سەوزدا ڕاوەستان و
بە چرپەیەکی نەرم و نیان کەوتنە قسەوە
لە نزیك کانیاوێکدا، دوای دوو ڕۆژی پڕ ماندوو بوون
بە کارە خۆشەکانی ئەو فیردەوسەی کە تیایا دەژیان
لە نزیك کانیاوێکا، بەسەر زەوییەوە دانیشتن

## 41

لە سای شنەبا ی فێنکەوە، زۆرتر هەستیان بە خۆشی کرد
نانی ئێوارەیان خوارد، کە بەروبوومی درەختەکان بوو
ئەو بەروبوومەی کە لە شیلەی خوداوەندی بوو، بە چڵی درەختەکانەوە بوو
چڵەکان ئەو بەروبوومەیان بۆ ئەوان هەڵدەداو
ئەوانیش بەسەر ڕۆخانەیەکی نەرم و نیانەوە ڕاکشابوون
کە بە گوڵ و گوڵزارفەرشڕێژ کرابوو

## 42

مووخی ئەو مێوەجاتانەیان دەخوارد تا دەگەیشتنە پەلکەکەی
پاشان ئەو پەلکانەیان پڕلە ئاوی ڕوون دەکرد، تا تێنووێتیان بشکێنن
قسەکانیان پڕ لە پاکی بوو و بزەکانیان شیرین بوو

لوتف و دەسبازی گەنجان، لەو دوو نازدارانە دەهات
ئەوانە بە پەیوەندی پیرۆزەوە، بەیەکەوە پەیوەست درابوون

## 43

لەو تەنهاییەی ئەواندا تەواوی ماڵاتی زەوی لە خۆشیاندا یارییان دەکردو ماڵی بوون
لە هەموو شوێنێکی دارستان و بێشەو دەشتاییەکاندا نیشتەجێ بوون
شێر تاوی دەداو بازی دەکرد و هەڵدەسایەوە سەر پاشووی خۆی
ورچ و پڵنگ و بەورو چەقەڵ لە بەرامبەریانا هەڵدەسانەوە
بەڵام فیل کە زۆر قورس بوو
بەهەموو هێزێکییەوە، ئەوانی دەخستە پێکەنینەوە
بە خەرتوومی نەرم و درێژی خۆی، ئەڵقەیەکی تەواوی دورست دەکرد
لە نزیك ئەوانیشدا ماری مەکرباز
ڕێی خۆی شەق دەکرد و گرێی گوردیۆنی[1] خۆی دەهۆنییەوە
هۆنیبوویەوە وەك ئەوەی کە چەپەڵی کوشندەی خۆی بشارێتەوە
ئەوانی تریش هەموو لەسەر گیاکانەوە بوون، تێر خێری لەوەڕگا بووبوون
یاخود بەر لە خەوتن کاوێژیان دەکرد

## 44

ئێستاکە خۆر بەسەر فەلەکی ڕەوە تەلانی خۆیدا، لار دەبێتەوە و بەپەلە شۆڕ دەبێتەوە بۆ دورگەکانی ئەزۆریس
ئەستێرەکانیش لە بورجی ترازوودا، بۆ ئاسمان هەڵدەکشان تا ئێوار ڕابگەیەنن
ئەهریمەن ئەوساکەش هەر لە شوێنگەی یەکەمی خۆیەوە

1- گۆردۆنی، هێمایە بۆ گرێی گۆردونی، کە کەس نەیتوانی بیکاتەوە، بەڵام ئەسکەندەر توانی ، بە برینی نەک بە کردنەوەی.

چاودێری دیمەنەکەی دەکرد
دوای ئەوەی کە زەمانحاڵی خۆی خیانەتی لێکرد
دووبارە گەڕایەوە سەر قسە خەمبارەکانی و گووتی:
وای بۆ دۆزەخ، ئەوە چاوە غەمگینەکانم چی دەبینن؟
ئەوە کێیە شوێنی ئێمەی لەو خۆشییە گرتۆتەوە
ئەو ئەفرێنراوانە کێن وا جوان و تازە شێوە، ئەفرێنراوەن؟
لەوانەیە ئەوانە لە دایك بووی زەوی بن، نەك ڕۆح
بەڵام چی وەیان کەمتر نییە، لە ڕۆحە ئاسمانییە درەوشاوەکان
بیرو بیرکردنەوەی من، بە سەرسامییەوە بە دواندا دەچێت
لەوانەیە خۆشەویستبن، زۆر چالاکانە دەدرەوشێنەوەو لە ئاسمان دەچن ، ئەوە دەستەی کە دروستی کردوون، نیعمەتێکی زۆریشی بۆ هەڵڕشتوون

## 45

ئەی ئەو ژن و مێردە نەرم و نیانە
ئێوە نازانن وادەی گۆڕان و وەرچەرخانتان چەند نزیك بۆتەوە؟
ئەو خۆشیانەتان هەموو لەناو دەچێ وهەموو دەبێتە خەم و خەفەت
هەرچەندەکی خۆشی و شادیتان هەبێ، ئەوەندە بەڵایەتان تووش دەبێ
ئێوە دڵخۆشن، بەڵام ئەو دڵخۆشیەتان بەچاکی تەیار نەکراوە
ئەو خۆشیەتان ئەوەندە ناخایەنێ

## 46

ئەو شوێنە بەرزەی ئێوە بەباشی دیواربەند نەکرا وە
تا بتوانی ڕێگە لە دوژمن بگرێ نەهێڵێ بێتە ژوورەوە
ئێستا دوژمنەکەتان هاتۆتە ژوورەوە، بەڵام دوژمنایەتی ئێوە ناکات
چونکە من دڵم بە ئێوە دەسووتێ، بەڵام لەو کوێرەوەرییەدا

کەس دڵی بۆ من ناسووتێ، من دەمەوێ پەیوەندی لەگەڵ ئێوە ببەستم
پەیوەندییێکی خۆشەویستانەو توندوتۆڵ
پاشان هەردەبێ لەگەڵ من بژین، یا لە گەڵ ئێوە بژیم
هەر لە ئێستاوە ڕەنگە دڵتان بەماڵی من خۆش نەبێت
وەك چۆن ئەو فیردەوسە دڵتان خۆش دەكات

## 47

بەڵام بەوە ڕازی بن، كە ئاسمان بەسەر ئێوەی داهێناوە
كە بەسەر منیشی داهێناوەو داویەتی بە منیش
من بە دڵنیاییەوە بە ئێوەی دەبەخشمەوە
ئیدی دەرگەی دۆزەخ ، بۆ میوانداری كردنی ئێوە دەبێتەوە
گەورەترین دەرگای دەبێتەوە و هەموو پاشاكان دێن بۆ پێشوازیتان
ئەوسا ئەو شوێنە زۆر فراوان دەبێت، بە پێچەوانەی ئەو شوێنە دیاری كراوەی
كە پێشوازی ئێوەی لە ژمارە نەهاتوو كردووە

## 48

جا ئەگەر ئەو ماڵە ناخۆش بوو، ئەوە خەتای ئەو كەسەیە كەمنی لێرە
داناوە
تا تۆڵەم لێبكاتەوە، ئەو تۆڵەیەی كە ڕقم لێیەتی
ئەو شوێنەی كە تۆڵەی تیا لە ئێوە دەكەمەوە
بێئەوەی خراپەكەی بدەنە پاڵ من
ئەومیش وەك تۆڵەكردنەوەیە لەو كەسەی، كە خراپەی لە گەڵ مندا
كردووە
جا ئەگەر نەرم ونیان بووم، لە گەڵ پاكی و بێگوناهی ئێوەدا
وەك چۆن كە ئێستا وام، كەواتە دەبێ ئەقڵی گشتی دادپەروەر بووبێت

شەرەف و مولك داوای ئەومم لێدەکەن کە تۆڵە بسەنمەوە
ئەومیش بە داگیرکردنی هەمان ئەو دونیا تازەیەی ئێوە
ئەوەش ئێستا ناچارم دەکات، ئەوە بکەم، کە ڕقم لێیەتی
هەرچەندە کە من تاوانبار کراوم و نەفرەتم لێکراوە

## 49

ئابەمجۆرە ئەهریمەن لە قسەکانی خۆی بۆوە
زۆردارەکان ئەومیان بۆ دارِشتبوو[1]
کە ئاوا کارە هەرماسییەکانی خۆی جێبەجێ بکات
ئینجا بەسەر درەختە بەرزەکەوە هەڵفڕی و لەسەرخۆ هاتە خوارەوە
بۆ ناو ئەو مێگەلەی کە خەریکی ڕابواردن بوون
ئەوانەی کە خودانی چوار پێ بوون، ئەهریمەن خۆی کرد بە یەکێ لەوان
وێنەی ئاژەڵێکی گرتەخۆ، بەو جۆرەی کە ئامانجی ئەو بەدیبهێنێ
تا بە دزییەوە نزیك بکەوێتەوە، لە بینینی ئەو نێچیرەی کە خۆی دەیەوێ
تا سەیریا بکات و زیاتریان لێ فێر بێت، بەقسەو بە گوفتار

## 50

هەر بەمجۆرە، جارێ لە وێنەی شێرێ بەدەوریانا دەسوڕایەوە
تا بە چاوی ئاگرینەوە هەڵیاکوتێتە سەریانەوە، جارێکیش بە وێنەی پڵنگێ
بە ڕێکەوت لە دەوروبەری دارستان
چاوی بە دوو ئاسکی ناسك کەوت، یارییان دەکرد
یەکسەر سەری خۆی لار کردەوە سەر زەوی و
ناوەناوەش بەرزی دەکردەوەو بە دزییەوە سەیری دەکردن
وەك یەکێ کە باشترین شوێن هەڵبژێرێ
تا بە خێرایی هەڵکوتێتە سەریان وهەردووکیان هەرلووشێ

1- زۆردارەکان ئەوەیان بۆ دارِشتبوو، لێرەدا میلتوەن دەڵێت مادەم ئەقڵ هەیە نابێ زۆرداری هەبێت.

## 51

کاتێ ئادەم، یەکەم پیاو، دەستی بە قسەکرد، لە گەڵ حەوای یەکەم ژندا
ئەهریمەن گوێی بۆ قوڵاغ کردن، تا گوێی لە قسەتازەو گەرمەکانیان
بێت، کە دەیگووت:
ئەی تەنها هاوبەشی من و تەنها بەشی ئەو خۆشیانە
لەهەمووان ئازیزتری بۆ من،
ئەو کەسەی کە ئێمەی ئەفراندبێ و ئەو دونیا فراوانەی بۆ ئێمە ئەفراندووە
چاکەکانی سنووری نییە و بەخشندەییشی یەکجار فراوانە

## 52

ئێمەی لە خۆڵ ئەفراندووە و لێرە نیشتەجێی کردووین
لە ناو ئەو خۆشییەدا،هیچ شتێ لە ئێمە داوا ناکات، پێویستی پێ بێت
هیچ شتێکیشی ناوێت، کە لە سەرمان بێت
تەنها یەك شتی ئاسان نەبێ، کە دەبێت گوێڕایەڵی بین
لە نێوان ئەو هەموو دارودرەختانەی فیردەوس
کە خۆشترین میوەیان پێوە هاتووە
تەنها یەك درەختمان لێحەرام کراوە
ئەویش درەختی مەعریفەیە، کە لە تەك درەختی ژیان چاندراوە

## 53

ئابەمجۆرە مەرگ لە ژیان شین دەبێ
بێگومان مەرگ هەرچییەك بێت، ترسناکە
جا ئایا دەزانی خوا فرمانی داوە،هەرکەسێ لەو درەختە بخوات دەمرێ
کە ئەومشیان تاکە نیشانەی دروودو گوێڕایەلیمانە
لە نێوان جۆرەها ئەو دەسەڵات و حوکمەی کە بە ئێمەی داوە

هەروەها ئەو دەسەڵاتەی[1] کە بە ئێمەی بەخشیوە و
بە هیچ ئەفرێنراوێکی تری نەبەخشیوە، کە لە زەوی و ئاسماندا هەیە

## 54

واخەیاڵ نەکەیت کە حەرام کردنی تاکە شتێ، کارێکی گران بێت
ئازادی تەواومان هەیە، خۆشی لە هەر شتێکی تر وەرگرین،
جگە لەو درەختە، بۆمان هەیە بەشێوەیەکی ڕەها
هەرچییەك کە بمانەوێ لە جۆرەها ئەو شتە جۆراوجۆرانەی
کە لە دەورو بەرماندا هەیە، بۆ خۆمان هەڵبژێرین

## 55

ئیدی با دەست بکەین بە سپاس کردنی و دروودی بۆ بنێرین
دوای ئەوەی کە لە کارە خۆشەکەمان دەبینەوە
دەست دەکەین بە جوانکردنی ئەو ڕووەکانەی
بەرزبوونەتەوە وخزمەتی گوڵەکان بکەین
هەرچەندە کارێکی زەحمەتە، بەڵام لە تەك تۆدا شیرینە

## 56

حەوا وەڵامی دایەوە و گوتی:
تۆ ئەی ئەو کەسەی کە ئەفرێندراوی ئەویت و لەویت، گۆشتی من لە
گۆشتی تۆیە
بێ تۆ من هیچ مەرامێکم نییە[2]، ئەی ڕێشاندەرو سەری من

1- ئەو دەسەڵاتەی کە بە ئێمەی بەخشیوە، ئەمەیان لە تەکوینی 1: 61 وەرگیراوە کە دەڵێت بەسەر هەموو ماسی دەریاو باڵندەی ئاسمان و هەموو دەوارێکەوە دەسەڵاتیان هەیە...

2-هیچ مەرامێکم نییە، باس لەوە دەکات کە ئادەم داوای لە خوا کرد کە هاوبەشێکی پێ ببەخشێ، یەکسان بێ لەگەڵ ئەو و بەو بچێ، بەڵام ملتون لێرەدا حەوا وەک ئەو نابینێ.

ئەوەی کەتۆ وەبەر زمانت خست، ئەوە هەق و دادو دادپەروەرییە
ئێمە بەڕاستی سپێدەو ئێوارە، قەرزاری سپاس و درووودی ئەوین
بە تایبەت من، چونکە بەختێکی گەورەو بەختەوەرییەکی گەورەم هەیە
کە تۆم وەدەست هێناوە و تۆش زۆر چاکتری لە من
لە کاتێکا کە جگە لەمن، هیچ ژنێکی تر نادۆزییەوە [1]
کە خۆشت بوێ بۆ خۆت

## 57

زۆرجاران ئەو ڕۆژەم بیر دەکەوێتەوە، کە من خەوتبووم
لە ژێر سێبەری گوڵەکاندا، خۆم لە نزیکتەوە بینی
سەرسام بووم و وتم ئەوە من لە کوێم و چۆن هاتوومەتە ئێرەوە؟
زۆر لە من دوورنا، گوێم لە چرپەیەك بوو
ئاو لە ئەشکەوتێك تەقییەوەو هەڵڕژایە ناو دەشتێکی جوانەوە
کە وەك ڕووی ئاسمان ڕوون و ڕەوان بوو
پاشان بە مێشکێکی بێ ئەزموون، بۆ لای چووم

## 58

کە بەسەر کەنارە سەوزەکەدا ڕاکشام
بۆ ئەوەی سەیری دەریاچە ساف و لووسەکە[2] بکەم
ئاسمانێکی تر کەوتە بەرچاوم
کاتێ کە سەری خۆم لار کردەوە، بەسەر ئەو دەریاچە سافەوە
وێنەیەکم لە بەرامبەری خۆمدا، لەناو ئاوەکەدا بینی

1- هیچ ژنێکی تر نادۆزییەوە، لێرەدا ملتون دەڵێت ژن تەنها بۆ ئەوە ئەفرێنراوە کەببێتە هاودەمی تەنیایی پیاو.

2-دەیاچەی ساف، ملتون دەیەوێت هەمان ئەفسانەی نەرسیس بڵێتەوە، وەک چۆن لە ئوفید لە کتابی میتامۆرفوس دا هاتوو.

که ئەویش لار بووبۆوە سەیری منی دەکردو پاشەکشەم کرد
ئەویش پاشەکشەی کرد، بەڵام دڵم پێی خۆش بوو،هەر زوو گەڕامەوە

## 59

ئەویش دڵخۆش بوو بە بینینم، لەمان ساتدا ئەویش هاتەوە
تا سەیری یەکتر بکەین، سەیرکردنێکی پڕ خۆشەویستی
دەتوانم بیسەلمێنم، کە تاوەکو ئێستاش چاوم بەسەریەوەیەو
تاوەکو ئێستاس لە تاویا دەتوێمەوە
ئەگەر ئەو دەنگە وەئاگای نەهێنابامەوە کە گووتی :
ئەوەی کە دەیبینی ، ئەی جوانترین ئەفرێنراو، ئەوە خۆتی
کە لەگەڵ تۆدا بەدیار دەکەوێ و لەگەڵ تۆدا وەن دەبێ
بەڵام بەدوام کەوە بۆ شوێنێ، کە سێبەری لێ نییە
تا وێنەی تۆ یا ئامێزی نەرمت پێچەوانە بکاتەوە
ئەویش پیاوێکە کە تۆ وێنەی ئەوی و چێژی لێوەردەگریت
بۆتۆ دەبێ و لێت جیا نابێتەوە، سگت لەو دەبێ ، منداڵت لێی دەبێ
منالآنێکی زۆر، کە بە تۆ دەچن، ئیدی بە تۆ دەگوترێ دایکی بەشەرییەت
- تۆ وێنەی ئەوی، واتە ئادەم، ملتون لێرە لە گەڵ تەورات دەڕوات، تا
کارەساتی مرۆڤ تەواو بکات.

## 60

ئەدی چیم پێ دەکرێ؟ جگە لەوەی بەدوای ئەو دەنگە بکەوم
کە پێشڕەوایەتی دەکردم، بێ ئەوەی خاوەنەکەی ببینم
بەدوای ئەدا ڕۆیشتم، هەتا تۆم دیت
تۆش بەڕاستی جوان و باڵابەرز بووی، لە ژێر ئەودرەختەی دەشتایی[1]

1 - درەختی دەشتایی عادەتەن بەرزو پڕگەڵاو پڕ سێبەرە

بەڵام کە تۆم بینی، کەمتر جوان و شیرین بووی و
سەرمرای گەشاوەییت کەمتر نەرمو نیان بوویت
لە وێنە جوانەکەی کە لە ئاوەکەوە پێچەوانە دەبۆوە، پشتم لە تۆ کرد[1]
بەڵام تۆ بەدوام کەوتی و بە دەنگی بەرز هاوارت دەکرد
بگەڕێوە - بگەڕێوە، حەوایە جوانەکەم

## 61

لە کێ ڕادەکەی؟ ئایا لەو پیاوە ڕادەکەی، کە تۆ لە گۆشت ئێسقانی ئەویت؟
بۆ ئەوەی بئافرێی، بەشێکم لە نزیك دڵی خۆمەوە هەڵپاچی
تا ژیانێکی جەوهەریم بەتۆ ببەخشم، بۆ ئەوەی لە تەکمەوە بیت
بۆیە تۆ تاکە مایەی دڵدانەوەی ئازیزی منیت، تۆ هاودەم و ماڵی منی
من تۆم دەوێت ئەی پارچەیەك لە دەروونم و بەڕاستی دەمەوێ بۆمن بیت
من بەدوای تۆدا دەگەڕام
کە دەستی نەرمی خۆت درێژ کرد و دەستی منت گرت
منیش تەسلیمی تۆم کرد، هەر لەو کاتەوە بینم کە چۆن
پایەی جوانی کەم دەبێتەوە، لە بەرامبەر ڕاستمەندی و حیکمەتی پیاوەتیدا
کە هەر بە ڕاستیش تەنها ئەو جوانە

## 62

ئیدی یەکەم دایکمان لە قسەکانی خۆی بۆوە، ڕوانینەکانی
گوزارشت بوون لەوەی، کە ئەو ئاشقی مێردەکەی خۆی بوو بوو
لەوەشا هیچ لۆمەیەکیشی لەسەرنییە
بەنەرم ونیانی خۆی دابەدەستەوەو دەستی کردە ملی باوکمان

1 -پشتم لە تو کرد، ملتون دەڵێت وێنە پێچەوانە بووەکەی ناو دەریاچەکە، وێنەی حەوا نەبوو، بەڵکو وێنەی ئادەم بوو

لە ژێر ڕێژنەی ئەو زێڕەی، لە کەزییە کراوەکانیدا هەڵدەڕژا
نیوەی سینەی پڕو ڕووتی، کەوتە سەر سینەی باوکەوە
ئەویش دڵخۆش بوو بە جوانی و سیحرو خۆ بە دەستەوەدانەکانی
بۆیە کەوتە بزەی ئەڤینێکی مەزنەوە
وەك چۆن جوبیتێر کەوتە بزە بۆ جونو[1]
لەو کاتەی کە هەور پڕ دەبێ و گوڵی بەهاران شین دەبێ

## 63

چەند ماچێکی پاك و بێگەرد بە سەر لێوەکانیدا نەخشیان بەستا
بەڵام ئەهریمەن لە حەسوودییان ڕووی لەولا کردو
چاوەکانی بە غیرەیەکی چەپەڵەوە کەوتنە ئاخاوتن
کەوتە دواندن لەگەڵ خۆیدا : ئەو دیمەنە قێزەونە ئازارم دەدا
ئەوانە هەریەکەیان، چێژ لە فیردەوسی باوەشی ئەویتر وەردەگرێ
خۆشی عەدن زیاتر دەکەن
ئیدی هەرچییەك بیانەوێ خۆشی لێوەردەگرن، خۆشی لەدوای خۆشی
لەکاتێکا منیشیان هاوێشتۆتە دۆزەخەوە، کە نە شادی و نە ئەڤینی تیایە

## 64

ئەوە ئارەزووێکی تۆقێنەرە، کەمتر نییە لە ئازارەکانی ترمان
ئەو قەت تێنوێتی ناشکێ بە ئێش و ئازاری تێنوێتیمان
بەڵام نابێ ئەو زانینەم لە بیر بچێ، کە لە دەمی ئەوانم بیست
خۆ هەموو ئەو شتانەی لێرەن، موڵکی ئەوان نییە
درەختێکی کوشندە هەیە، ناوی درەختی مەعریفە
کە لەوانە حەرامکراوە تامی بکەن،، مەعریفەت حەرامە

1- جونو واتە هیرای ژنی جوبیتیر – زەیوس –

## 65

ئەومیان جێگەی گومانەو هیچ لۆژیکێکی تیا نییە
ئایا دەبێ زانست گوناه بێت و مەعریفە مەرگ ؟
بۆچی گەورەی ئەوان حەرامی دەکات؟ ·
ئایا ئەوان خۆیان قبوڵی دەکەن، کە نەزانینیان بەردەوام بێت؟
ئایا ئەوە حاڵ و گوزەران و نیشانە و باوەڕی ئەوانە
ئای ئەو بناغەیە چەند مەزنە، کە هیلاکی خۆیان لەسەر بونیات دەنێن

## 66

هەر بۆیەش بەئارەزووی مەعریفەی زیاترەوە، ئەقڵیان تێك دەدەم
تا ئەو کاتەی فەرمانی ئەو حەسوودکارە ڕەت دەکەنەوە
ئەو فەرمانەی بۆ ئەومیە، ئەوانە هەر لە پلەی خوارەوە بمێننەوە
هیچ کات مەعریفەت بەرزیان نەکاتەوە
چونکە ئەوان بەو زانستە، لە گەڵ ئاسمان یەکسان دەبن
خۆ ئەگەر ئەوانە ئارەزووی ئەومیان لا دروست ببێ، بگەنە ڕیزی ئاسمان
ئەوە بەری ئەو درەختە دەخۆن و دەمرن، ئەدی مەرگ باشترین عاقیبەت نییە؟
بەڵام پێویستە من یەکەمجاربەو بەهەشتە بکەوم و
بە وردی لێی بکۆڵمەوە، لێکۆڵینەومیەکی ورد
هیچ سووچێك نەهێڵم، بێ ئەوەی تەماشای نەکەم

## 67

ئەومیان ڕێکەوتێکە، بەڵام بۆ ئەو شوێنەم دەبات کە تیایا
چاوم بە ڕۆحێکی ئاسمانی دەکەوێت و لە نزیك کانییێدا، لە هات و چۆ دایە
یا لە دارستانێکی پڕسێبەر دەحەسێتەوە، ئەوسا زانیارییەکی زۆری

لێوەردەگرم
با بۆخۆیان بژین و چێژ وەرگرن، تا دەگەڕێمەوە
ئەوەی گووت و بە چەند هەنگاوێکی لەخۆبایی
بەڵام بەئاگا لە خۆبوونێکی مەکربازانەوە، وەرسووڕایەوە
دەستی کرد بە گەڕان و سووڕانی خۆی
بە ناو دارستان و دەشتایی و دۆڵ و گردۆلکەکاندا، تا ئەوپەڕی ئاسۆی خۆراوا
کە لەوێدا زەمین و ئاسمان پێکدەگەن و خۆرئاوادەبێ و لەسەرخۆ دادەبەزێ
لەو ئاقارەی بەرامبەردەروازەی ڕۆژهەڵاتی فیردەوس
تیشکی ئێوارانی خۆی هەڵدەڕێژێ

## 68

دەروازەکە تاوێرەبەردێکە لە مەڕمەڕ، هەتا هەورەکان بەرز دەبێتەوە
مەودایەکی فراوان و و پەیژەیەك کە لە زەوییەوە بەرز بۆتەوە
بەڵام لە لای سەرەوەدا تەنها یەك ڕاڕەوی هەیە
بە بەردی گەورە گەورە دەورە دراوە، مەحاڵە بتوانی پێیان هەڵگەڕێی
یەك بەسەر یەکەوەیە هەتا دەگاتە لوتکە
بەناو ئەو ستوونە بەردینانەوە، گابرێل لە چاوەڕوانی شەودا، دانیشتووە
کە زەعیمی هەموو فریشتە پاسەوانەکانە
لەدەوروبەریشیا، یاری پاڵەوانێتی گەنجانی ئاسمان ئەنجام دەدرێت
کە هەموویان چەك سزن، چەکی ئاسمان بریتیە لە زرێ و ڕم و خودە
ئەو چەکانەش لەبەرزاییەوە هەڵواسراون و ئاوماس کراون و دەبریقێنەوە

## 69

ئەلێرەوە یورئیل هات، کە ئێوارە خلیسکی بەسەر تیشکەکانی خۆرەتاودا دەبرد
وەك گەشەسێرەیەکی تیژ، شەوێ لە شەوانی پاییز، ئاسمانی شەق کرد
لەو کاتەی تەم دونیای دادەپۆشی و کەشتیەوانی ئاگاداردەکردەوە و
ڕێنمایی دەکرد، کە هێمابەندی هەوا بینەکەی ئەوە پیشاندەدا
کە ئاخۆ بای سەرشێت لە چ ئاقارێکەوە هەڵدەکا؟
ئەوسا بە خێرایی دەستی بە قسەکانی خۆی کرد و گووتی:
گابرێل[1] ئەوە بوو بە نسیبی تۆ، ئەوکاتەی هەردووکمان قەڵەمی خۆمان دانا
تا تۆ ئەو شوێنە کپ و خۆشە بپارێزی، شەو درەنگان پاسەوانی لێبکەیت
تا خراپەیەك یا خراپکارێ نەیەتە ژوورەوە
بەڵام ئەمڕۆ لە گەرمەی نیوەڕۆ، ڕۆحێکی سەرکێش هاتە ناو بارەگای منەوە
وەك دیار بووو تێنوویەتی هەڵیدەقرچاند
هاتبوو تا شتی زیاتربزانێ، دەربارەی ئەفرێنراوەکانی گەورەی ئاسمان
بەتایبەتی مرۆڤ، دوا ئەو شتەی کە وێنەی ئاسمانە
بەردەوامی بە ڕۆیشتنی هەناسە لێبڕاوی خۆی دا
سەرنجی دایە ڕاڕەوی هەوایی خۆی

## 46

-مرۆڤ وێنەی ئاسمانە یا خودایە، بەپێی میتۆلۆژیاکان، مرۆڤ دوا وێنەی خودایە لەسەر زەوی و یەکەم وێنەی ئاسمانیش تاقانەو فریشتەکانن.

1- وشەی جبریل بە زمانی عیبری بەمانای هێزی خودا دێت، یاحود جەبەرووتی خودا، کە یەکێ لە فریشتە گەورەکان، کە حوکمی هەرچوار ئەقلیمی دونیا دەکەن، بەڵام لە تەورات و لە ئینجیل بەمانای نێردەی خوا دێت، . کتێبی شەشەم خەتی

## 70

یەکەمجاربەسەر چیای باکووری عەدن هەڵنیشتەوە
ڕوخساری غەریب بوو لە ئاسمان، خودانی سۆزێکی تەپیو و ئاڵۆز بوو:
چاوەکانم بەدوای کەوتن، ترسام لەوەی، کە یەکێ بێ لە کۆمەڵە
سزادروەکان
لە مەنفای خۆی ڕایکردبێ بۆ ئەوەی گێچەڵان بوروژێنێ
خۆی لە ژێر درەختێ شاردەوە، ئیدی نەمبینییەوە
دەبێ هەر بیدۆزیتەوە

## 71

ئەو جەنگاوەرە باڵدارە ئاوڕی لێدایەوەو گووتی:
ئوریل[1] ئەوە سەیر نییە، کە تۆ چاوت تیژە ولە ناوەندی بازنەی
نووردادەنیشتووی
بەڵام ئەو دەروازە فراوانە - بەناو ئەو هەموو پاسەوانانە -
کەسیان پێدا ناڕوات، جگە لەوانەی کە لە ئاسمان دێن وئەوانەیش
کە باش دەیانناسین و بەڵام لە نیوەڕۆوە، هیچ کەسێ لەوانە نەهاتووە
بەڵام ئەگەر جۆروڕۆحێکی تر، بیرۆکەی خراپەی بکەوێتە سەر و
بە ئەنقەست ئەو سنوورانەی زەوی بەزاندبێ، ئەوە زۆر زەحمەتە
- وەك خۆت دەزانی –کە جەوهەرێکی ڕۆحی
بە بە بەربەستێکی مژادی قەدەغە بکەیت
جا ئەگەر لەناو ئەو بازنەیە بێت و نەچووبێتە دەرەوە
ئەوە بەر لە گزنگ ئەو کەسە دەناسمەوە کێیە
کە قسەت لەبارەی ئەوەوە بۆ کردووم
- جا بە هەر وێنەیەك خۆی حەشار دابێ –

1- یورئیل، واتە نووری ئاسمان. لەهەندێ شوێن بە ئوریل هاتووە.

## 72

ئابەمجۆرە ئەم وادمیەی دا
ئینجا ئوریل بەو تیشکە درموشاوانەوە ، گەڕایە ومبارمگای پاسەوانی
تیشکەکان بەرزبوونەومو هەڵیانگرت
شۆڕیان کردموە بۆ ئەو خۆرمتاوەی کە ئەوسا
دابەزیبووە ژێر دورگەی ئەتڵەسی
لەوانەیە ئەو ئەستێرە گەشە[1]، بە خێراییەکی زۆرموە سووڕابێتەوە
کە لە یەك ڕۆژدا لەگەڵیا گەیشتبێ، لەوانەشە جووڵەی زموی
هێدی تر بێت، زموی سووڕێکی کەمتر سووڕابێتەوە
بەرمو ڕۆژهەڵات و لەوێ جێی هێشتبێ
تا ئەو هەورانەی کە دموری عەرشی دمدمن
بە ئەرخەوان و زێڕی پێچەوانە بوو، بڕازێنێتەوە

## 73

ئیدی هەرچۆن بێت، شەو داهات
ئیدی زوڵمەتی تۆخی شەو هەموو شتێکی خستە ژێر باڵی خۆیەوە
هاوڕێ دمگەڵ ئەو کپییە هەموو باڵدارو ئاژەڵەکان
سەریان خزاندموە ناو هێلانەو ئاخوڕی خۆیانەوە
هەر هەموویان جگە لە بولبولی بێدار
کە بە درێژایی شەو گۆرانی و بەستەی بۆ کپی و بێدمنگی دمچڕی
پاشان گومەزی ئاسمان بە یاقووتی شین درموشایەوە، پڕ لە ژیان بوو
ئەستێرەی زوهرە[2]، ڕابەڕایەتی کۆمەڵەی ئەستێرانی دەکرد

---

1- ئەستێرە گەشە، واتە خۆرەتاو، لە کۆنەوە دەڵێن سەرچاوەی شوهب، ئەو هەڵمەیە کە لە زەوی هەڵدەستێ و ناتوانێ بەرز بێتەوە، بۆ یە دەسووتێ و دێتە خوارەوە.
2- میلتون بە ئەستێرەی زوهرە دەڵێت هسبیروس، کە بریتیە لە ئەستێرەی شەوو نێردەی خۆشەویستی.

ڕووناکی دەکردنەوە، تا مانگ بەدیار کەوت و بە ناو هەوردا بەرەو بەرزایی چوو

دواجار چارۆگەی خۆی فڕێداو ڕووناهی خۆی بەرمەلا کرد، بێ وێنە بوو کەوای زیوینی خۆی هەڵدایە سەر شەو

## 74

ئادەم ئاوڕی لە حەوا دایەوەو گووتی: ژنە جوانەکەم

ئەوە کاتی شەوە، هەموو شتێ چۆتە وەستان و حەسانەوە

ئەوانە بیرمان دەخەنەوە، کە ئێمەیش وەك ئەوان بکەین

ئاسمان وای ویستووە کە کارو حەسانەوە، وەکو شەو و ڕۆژ بەدوای یەکدا بێن

ها ئەوە ئێستاکێ ئاوونگی خەو[1] بە قوورسایی نەرمە خەواڵوو دادەبارێ و گلێنەمان گران دەکات

ئەفرێنراوەکانی تر هەموویان تەمبەڵ و بێکار، ڕۆژیان بەسەر بردووە

بەڵام مرۆڤ ڕۆژانە، بەشەکاری زەینی[2] و جەستەیی خۆی بۆ دانراوە

هەر ئەوەشە کەرامەتی ئەوی بەیان کردووە

ئاسمان بایەخ بە هەموو کارەکانی دەدات

لە کاتێکا ئاژەڵەکان هەموو رادەبوێرن و بێکارن

ئاسمان هیچ حسێبێکیان بۆ ناکات

## 75

بۆیە بەر لەوەی سپێدەی ڕازاوە، بدرەوشێتەوە

یەکەم هێڵ لە هێڵەکانی ڕووناکی، هەڵاوێتە ڕۆژهەڵاتەوە

---

1 - ئاونگی خەو، لە سبنسر وەرگیراوە لە کتێبی شاژنی جنۆکان 1\6 ، هەروەها لە شکسبیر لە شانۆگەرێ ریشاردی سێیەم 4\1 38 و یولیوس قەیسەر2\1\032

2- بەشەکاری زەینی... مەسەلەی کارکردن لە فیردەوس بیرکردنەوەیەکی برۆتستانییە و لە چاخی ناوەند نەبووە، چونکە لەوێ ئینسان خەریکی ڕامان و بیرکردنەوەیەو بەس.

دەبێ هەستین و دەست بەکارە خۆشەکەی خۆمان بکەین
هەموو ئەو گوڵ و گوڵزارە چڕو تێکئالاوانە چاکەینەوە
لق و پۆپیان زیادی کردووەو درێژ بوونەتەوە
هەر وەها ئەو ڕاڕەوە سەوزانەی پیایا دێین و دەچین
تیز بە لاوازی ئاگاداری و بایەخدانی ئێمە دەکەن
داوای دەستێکی زیاتر دەکەن، بۆ بژارکردنی زیادە لق و پۆپی ڕەهایان
هەروەها دەبێ ئەو کەتیرانەش بسڕینەوە
کە کەوتوونەتە سەر پەلکی ئەو خونچانەوە
پەرش و بلاوو ئەستوور بووینەو ئەزیەتی چاو دەدەن
دەبێ نەیانهێلین، تا ڕێگەمان بۆ تەخت بێت
بەلام ئێستاکە سروشت حەسانەوەی ئێمەی دەوێت

## 76

حەوا بە تەواوی جوانییەکانی خۆیەوە ئاوڕی دایەوەو گووتی :
ئەی خاوەن و سەرچاوەی بوونی من، هەرچییەکت داوایە
ئەوە من بێ ئەملاو ئیملا، گوێڕایەڵی دەبم، چونکە ئاسمان ئاوا قەزاوەتی کردووەو
ئاسمانیش یاسای تۆیە تۆش یاسای منی
زۆرنەزانیی، خۆشترین مەعریفەی ژن و زۆرترین ستایشە
من کە لەگەڵ تۆدا دەئاخڤم زەمەن لەبیر دەکەم
هەموو کات و گۆڕانەکان، دەبنە مایەی چێژوخۆشی
وای هەناسەی سپێدەو خۆرهەلاتنی سپێدان
بەسەر نەغمەی زووی باڵندەکانەوە، چەند خۆشن
وای خۆرەتاو چەند چێژبەخشە، کاتێ بەسەر ئەم زەوییە
دڵڕفێنە دا دەگەشێتەوەوتیشکە گەشاوەکانی بەسەرگیاو درەختەکان و
ئەو میوەو گولانەی کە ئاوونگیان بەسەرا دەبریقێتەوە

هەڵئەپڕژێ و پەرش و بڵاو دەبێتەوە و پاشان
دوای ڕێژنە بارانێکی نەرم بۆن و بەرامەی عەتر، زەوی دەپێتێنێ

## 77

وای چەند خۆشەهاتنی جوانی ئێوارە و پاشان شەوی بێدەنگ
بەخۆو بە باڵندە سەنگینەکانی  و مانگی جوان و دەستەی ئەستێران
- ئەو زێڕوزەبەرانەی گومەزی ئاسمان -
بەڵام بێ تۆ هیچ شتێ شیرین نییە
نەهەناسەی سپێدان و نەخۆری گەشاوەی هەڵاتوو بەسەر ئەو زەویە باشەدا
نە ئەو گیاو میوەو گوڵ وگوڵجارەی کە بە شەونم دەدرەوشێنەوە
نە بۆن و بەرامەی دوای ڕێژنەی باران
نە شەوی کپ و باڵندەی گران و سەنگین و
نە ڕۆیشتنی ژێر تریفەی مانگ، نە ڕووناهی ئەسێرە
هەر هەموویان بێ تۆ شیرین نین

## 78

بەڵام ئەو ئەستێرانە، بۆچی بە درێژایی شەو دەدرەوشێنەوە
ئەگەر خەو هەموو چاوەکان دابخات
ئەی ئەو داهێنانە جوانە بۆ کێ ئەفرێنراوە؟
باوانی یەکەممان وەڵامی دایەوە:
ئەی کچی ئاسمان[1] و ئینسان، ئەی حەوای تەواو[2]

---

1- ئەی کچی ئاسمان حەوا لەبەر ئەوەی هەم لە ئاسمانەو هەم لە ئادەم، ئەوا ئاسمان و ئادەم دوو باوکی ئەون.

2 -ئەی حەوای تەواو، شێوە ئاخاوتنێکی سەدەی نۆزدەهەمەو بەمانای ئەوە دێت، کە خوێندەوارە خودان ڕەوشتێکی بەرزە.

لەسەریەتی ئێوارەی بەیانی، سووڕی خۆی بە دەوری زەویدا تەواو بکات
ئەو بە ڕێکی لە شارێکەوە بۆ شارێ سەفەر دەکات و
بەناو هەندێ نەتەوەدا دەڕوات، کە هێشتا لە دایك نەبووینە
ڕووناکی خۆی دابەش دەکات و ئاوادەبێ.هەڵدێتەوە

## 79

جا بۆ ئەوەی تاریکی شەوانە بە یەکجاری نەگەڕێتەوەو
موڵکی خۆی بەدەست بهێنێتەوەو هەموو ڕووناکی ژیان، خامۆش نەکات
ئەوە ئەو ئاگرە نەرمە هەر بە تەنها ڕووناکی ناکاتەوە
بەڵکومەشخەڵێ لە گەرمایی باشی خۆی، بەسەرا گەش دەکاتەوە
گەرماتیەکە هەندێ جار توندەو هەندێ جاریش سووك
فێنکی دەکاتەوەو هەڵیدەگیرسێنێ، بەهێزی دەکاو خۆراکی پێدەبەخشێ
هەروەها ئەستێرەکانیش، فێنکی بەناو جۆرەها ڕووەکی سەرزەوی
بڵاودەکەنەوەو
وایان لێدەکەن بتوانن لەژێر تیشکی بەهێزی خۆر شین بن و گەشە بکەن
هەرچەند ئێمە ناتوانین لە تاریکی شەودا، بەدییان بکەین

## 80

بێهوودە ڕۆژ هەڵنایێ، وابیر نەکەیتەوە ئەگەرمرۆڤ نەما
ئەوە شتێکی تر نییە سەیری ئاسمان بکات
یاخود کەس نییە سپاسی ئاسمان بکات، کە دەخەوین یا کە لەخەو
ڕادەبین
ملیۆنەها ئەفرێنراوی ڕۆحی نەبینراو، بەسەر زەوییەوە دێن و دەچن
شەو و ڕۆژ بەبێ وەستان، ستایشی کارەکانی ئاسمان دەکەن
چەندەها جار دەنگی قووڵایی گردۆلکە دەنگدارەکان بەرزبۆتەوە

یا لە دارستان و دەوەنەکاندا دێتە بەر گوێمان
ئەوانە هەمووی دەنگی ئاسمانن، کە دڕ بە تاریکی شەو دەدەن
جا ئەو دەنگە بە تەنها بێت، یا یەك وەڵامی ئەویتر دەداتەوە

## 81

هەمووی درووود بۆ گەورەیی ئاسمان دەنێرن
زۆرجاران بە کۆمەڵ و بەسەر نەغمەی ئامێرەکانی ئاسمانەوە
لە کاتی شەوپاسەوانیدا، یا لەکاتی سووڕانەوە لە شەودا
ئەو سروودو درووودانە، بە گونجانێکی هارمۆنییەوە دەڵێنەوە
بیرکردنەوەکانمان بەرەو ئاسمان دەبەن، بەرەو دارستانی خۆشی و شادی
ئەوەیش ئەو شوێنەیە، کە پاشاکەیان بۆئەوانی هەڵبژاردووە
ئەو پاشایەی کە فیردەوسی داهێناوە
هەموو شتەکانی خستۆتە بەر دەستیان و ئاسانی کردوون

## 82

بانەکەشی بریتیە لە پەردەیەکی چڕی چنراو
لە گەڵای غارو درەختی بەرزی هەمیشە گەڵا سەوزی بۆندار
لە هەر لایەکیەوەی درەختی ئەکانتوس[1] و درەختیلە گیای عەترین هەیە
ئەوانە هەمووی بەناویەکدا ئاڵۆسکابوون، بۆ پاراستنی دیوارە سەوزەکان
گوڵە سووسنە ڕەنگاو ڕەنگەکان و یاسەمین
سەریان بە ناو گەڵای درەختەکانەوە بەرز کردۆتەوە
زۆر جوان بووبوونەوەو ڕێککەوتبوون و ڕازابووبوونەوە
وەك فوسەیفەسایەکی زەخرەفە ئامێزیان لێ هاتبووە
زەوینەکەشی شەلاڵ بە گوڵی وەنەوشەو جافەران و هایسنت کرابوو

1- جۆرە ڕووەکێکی تێکئاڵۆزاوە، بۆ پاراستن دەیچێنن.

گوڵجارێکی چڕ بە جۆرەها ڕەنگ، لە ڕەنگی بەنرخترین
ئەو تابلۆیانەی کە بەبەردی گرانبەها ڕازابوونەوە

## 83

ئەفرێنراوەکانی تر- ئاژەڵ و باڵندە و کرم – نەیاندەتوانی بێنە ناو ئێرەوە
هەموویان لە مرۆڤ دەترسان و لێی دەپەنگێنەوە
بەڵام ئەو دارستانە سێبەرینە، زۆر پیرۆزو گۆشەگیرە
- هەرچەند ئەوە چنراوی خەیاڵە -
نە بان و سیلفانوس[1] نە پەری و نە فاونۆس
لەو هۆبەیە ، کە بە گوڵ و غاروگیای عەتراوی داخراوە، نەبوون

## 84

حەوا بالینگانی شووشەیی ژن و مێردایەتی خۆی، بۆ یەکەمین جار
ڕازاندەوە
تیپیەکانی ئاسمانیش، گۆرانی شەوی بووکێنیان دەچڕی
ئەو ڕۆژەی فریشتەی زەماوەند، حەوای گواستەوە لای باوکمان
کە یەکجار جوان و ڕازاوە بوو، بە جوانییە ڕووت و قووتەکەیەوە
بەڵکو زۆر زۆر ڕازاوەو جوانتر بوو لە باندۆرا [2]
کە خوداوەندەکان هەموو دیارییەکیان بەسەردا باراندبوو
زۆر لە حەوا دەچوو، سەبارەت بەو ڕووداوە پڕئازارەی بەسەری هات

---

1- بان و سیلفانووس وفاونۆس، خوداوەندی پیتی و دارستانی جۆری سیتیرن، واتە نیوەی سەرەوەیان، مرۆڤ بوون تا کەمەریان، ئەویتریشیان بزن بوو، لە میتۆلۆژیای یۆنانیدا.
2 - باندۆر، زەیوس وەک تۆڵەکردنەوە لە برۆمیتۆس ی ئاگردز، باندۆرای ئەفراند، داوای لە خوداوەندەکان کرد، جوانترین دیاری خۆیان بنێرن، هەموو سندووقەکەیان پڕ کرد، کە بریتی بوو لە حەسوودی و نەخۆشی و هەڵکاری، کە برومیتۆس ئەوەی ڕەت کردەوەو سندووقەکەی دا بە ئیمیسیوس ی برای، ئەویش کە سەری سندووقەکەی کردەوە، تاعون و نەخۆشی و خراپە بڵاوبۆوە بە دونیادا.

کاتێ کوڕی یافت[1] ی هاروهاچ، له هرمسی سەندەوە
هەموو مرۆڤێ بەدیمەنە جوانەکەی شێت دەبوو
تا تۆڵە لەو کەسە وەرگرێتەوە، کە ئاگری ئەسڵی جوبیتیری دزی بوو

## 85

کاتێ گەیشتنە ماڵە سێبەرینەکەیان، وەستان و ئاوڕیان دایەوە
له ژێر گومەزی ئاسمانی ڕەهادا، دەستیان کرد به درووودی خودا
کە ئاسمان و زەوی و هەواو فیردەوسی ئەفراندووە
ئەو فیردەوسەو ئەو مانگە تەبەش گەشاوەو
ئەو جەمسەرە ئەستێرەدارەی کە ئەوان دەیانبینی و دەیانگووت:
ئەی ئەفرێنەری مەزن، تۆ شەو رۆژت ئەفراندووە
ئێمەش ئەو کارەی کە بۆمان دانراوە، ئەنجاممان داوە
به یارمەتیدانی یەکتری، بەخۆشی و خۆشەویستی نێوانمان وبەرمان هێناوە

## 86

ئەو خۆشەویستییەی کە تاجی کامەرانییەو تۆ بۆ ئێمەت ڕێکخستووە
ئەو شوێنە خۆش و گەورەو فراوانەت ئەفراندووە
کە زۆر گەورەترە لەوەی کە ئێمە پێویستیمانە
ئەو هەمووە پێویستی به هاوبەشی ترە
بەرووبوومەکان ناڕنرێن و دەکەونە سەر زەوییەوە
وادەت به ئێمە داوە کە نەوەی چاکەمەندمان
بەچاکەی بێسنووری خۆت پێببەخشی، تا زەوی پڕکەنەوە
ئیدی ئەوانیش لەگەڵ ئێمە
کاتێ رادەبین و کاتێ تکای خەوتنی خۆش دەکەین

2 - یافت کوڕی نوح، نازانم بۆچی تەنها ئەوی هەڵبژارد، له جیاتی ئیابیتوس ی باوکی برۆمیتۆس و ئیمیۆتیوس؟

دروودت بۆ دەنێرین و مەزنت دەكەین – كە ئێستاش تكای ئەوە دەكەین -

## 87

دوای ئەوەی كە ئەومیان بەیەكەوە گووت و
تەنها سرووتی ئەو دروودە پاكەیان ئەنجامداو بەس
كە لە هەموو سرووتەكانی تر، خۆشەویستترە لای خودا
دەست لە ناو دەست چوونە ناو قووڵترین سووچی باغستانەكەوە
بەئاسانی دەمامكی كاركردنیان كردەوەو
یەكسەر هەردووكیان لەتەك یەكەوە ڕاكشان
ئادەم وای باوەڕ بوو، كە قەت لە ژنەكە جوانەكەی دوورنەكەوتبۆوە
حەواش قەت ڕەتی ئەوەی نەكردبۆوە
كە سرووتی نهێنی خۆشەویستی[1] ژن و مێرایەتی لە گەڵیا ئەنجام بدات
دەبا هەر دووڕووەكان قسەی ناخۆش لەبارەی پاكی و شوێن و بەرائەت بكەن
دەبا هەر بە ناپاكی تاوانبارییان، بكەن لەو شتەی كەئاسمان داینابوو
كە كارێكی پاك و خاوێن بوو
ئەفرێنەری ئێمە فەرمانمان پێدەكات، كە زۆربین و وەچە بنێینەوە
جگە لە تێكدەران و دوژمنی ئاسمان
كەسێكی تر فەرمان بەپێچەوانەی ئەوە ناكات

## 88

سڵاو لە خۆشەویستی نێوان ژن و مێردان
ئەی یاسای نادیارو سەرچاوەی مافی وەچەی مرۆڤ و

---

1- سرووتی نهێنی خۆشەویستی، فەرمانی بە هەندێک کردبوو و ڕێساکەشی ئازاد بوو، بۆ هەموو کەسێ، باسی پەیوەندی ئادەم و حەوای کربوو، بە جۆرێکی تر، بەر لەوەی دابەزن، لێرەش واباسی دەکات کە دوای کەوتنیانە.

مافی موڵکداریّتی تاك، له فیردموس و هەموو شته گشتییەکاندا
چاکەکه بۆ تۆ دەگەڕێتەوە، له دوورخستنەوەی زینا
له مرۆڤەکان و ڕەها کردنی لەناو پۆلی ئاژەڵەکاندا
یەکەمین جارلەسەر بناغەی ئەقڵ و دڵسۆزی و دادو پاکیدا
ئەو سۆزو پەیوەندییە خۆشەویستیانەت دامەزراند
که باوك کوڕو براکان بەیەکەوە پەیوەست دەدا
تۆ زۆر گەورەتری لەوەی پێت بڵێم، هەڵەت کردوومو لۆمەت بکەم
یاخود تۆ شایەنی پیرۆزترین شوێن نیت
ئەی تۆ کانیاوی هەمیشەیی خۆشییەکانی ماڵەوە نیت؟ سەرینت پاك نییە؟
یاخو بڵێم سەرینت پاکژ نییە؟
یا خاوێن نییە، وەك چۆن قەددیس و بەتاریکەکان[1] وایان کرد؟
ئەو خۆشەویستییەیە که ڕمی زێڕینی خۆی دەهاوێژێ

## 89

هەر لێرەوەیە چرای هەمیشەیی ئەو خۆشەویستییە
شەپۆلی باڵە ئەرخەوانییەکانی شەوق دەداتەوە
لێرە فەرمان دەکات و ڕادەبوێرێ، نەك له بزەی فرۆشراوی سۆزانییەکان
که خاڵین له خۆشەویستی و شادی و
ڤینی خودان بەرووبوومی پووچ و بێ ویساڵ[2]
هەروەها نەك له خۆشەویستی خەڵکی دەربارو سەمای هاوبەش و
ئاهەنگی پۆخڵ و ماسکداروئاهەنگی شەوانی سەما

1- قەدیس و بەتاریکەکان... لێرەدا ملتون مامەڵە له گەڵ خۆشەویستی دەکات، وەک چۆن ئەدیبە دێرینەکان بۆ کیوبیدیان دەکرد، وای لێدەکات له پێناویا ڕم هەڵگرن و بیهاوێژن.
- بەتاریق مانای زۆرە، لەوانە سەرکردەکانی - ڕۆو یا زانایانی یەهور- یاخود باڵندەی هەرێمەکانی جەمسەر، که سەربالی ڕشەو سگی سپییە، یاخود کەسێکی بەنازو فیزو خۆبەزلزان.
2- بێ ویساڵ، مەبەستی سێکسە.

یاخود ئەو گۆرانییانەی عاشقی بێبەش[1] بوو
بۆ خۆشەویستە مەغرووڕەکەی دەیچڕێ
کە باشتر وایە بیبزوێنێ و جێی بهێڵێ

## 90

به نەغمه و لایلایەی بولبول، ئادەم و حەوا باوەشیان بەیەکدا کردو خەوتن
بنمیچی گوڵین، بارانی عەتری بەسەر قاچ و قوڵی ڕووتیان دادەباراند
کە بۆ بەیانی سەر لە نوێ شین دەبوونەوە
هەر لە خۆشیدا بن، ئەی ژن و مێردی پیرۆز
ئێوە زۆر شادن، ئەگەربۆ بارێکی شادتر هەوڵ نەدن
دەبا هەردووکتان بگەن بە لوتکەی شادومانی
بریا فێری ئەوە دەبن کە فێری زیاتر نەبن

## 91

شەو بە سێبەری قووچەکی خۆی، وێنەی هێڵێ دەکێشێ
تا نیوەی گومەزی ئاسمانی بەرین، لە ژێرفەلەکی مانگدا هەڵدەکشێ
فریشتەکان لە دەروازەی عاجیی خۆیانەوە هاتنە دەرەوە
لەکاتی خۆیدا بۆ چاودێری شەوانە، بەچەکەوە وەستان
لە ڕیزی جەنگدا سەفیان بەست
گابرێلیش قسەی بۆ ئەوکەسە کرد، کە لە دەسەڵاتدا لە دوایەوە دێت :
ئەی ئورئیل[2] نیوەی ئەوانە ببەو برۆ بۆ باشوور
بە وردی چاودێری بکەو منیش ئەوانی تر دەبەمە باکوور

١
-عاشقی بێبەش، لێرەدا میلتون تیز بە خۆشەویستی ناو دەربار و رۆمانسییەت دەکات، بە تایبەت گورانبێژەکانی - سیرنادات - ، لە ژێر پەنجەرەی عەشیقدا..
2-ئۆزیئیل، ئەو ناوە لە تەورات هاتووە، تایبەتە بە مرۆڤی سەر زەوی، بەلام لە تەلموود، تایبەتە بە فریشتە، ماناکەشی بە هێزی ئاسمان دێت.

هەردوو بازنەکەمان لە ڕۆژاوا یەکتر دەگرنەوە
وەك تریشقە ئاگر تاو بدەن
نیوە بۆ بەیداخی زرێپۆش و نیوە بۆ بەیداخی ڕم

## 92

پاشان گابرێل بانگی دوو لە ڕۆحە بەهێزو زیرەکەکانی تیپی خۆی کرد
کە لە تەکیەوە وەستا بوون، کاری خۆیانی بۆ ڕوون کردنەوەو گووتی :
ئەی ئیسۆریل و سۆفین[1]، زۆر خێرا هەڵفڕن و ئەو فیردەوسە بپشکنن
هیچ سووچێ پشت گوێ نەخەن، بە تایبەت ئەو سووچەی
کە ئەو دوو ئەفرێنراوە جوانەی لێیە، کە ئێستا لە خەوێکی خۆش و بێ ئازاردان

## 93

لەم ئێوارەیەدا لە شۆڕگەی خۆرەتاودا، کەسێ گەیشت
هەواڵی ئەوەی پێداین، کە ڕۆحێکی دۆزەخی بینراوەو بۆ لای ئێمە دێت -
کێ بیری لەوە دەکردەوە -؟
لە شیشەبەندی دۆزەخ ڕایکردووە، تا تاوانی خراپەو گومان ئەنجام بدات
لەهەر کوێیەك بینیتانەوە، بیگرن و بیهێننە لای من
ئاوای گووت و ئیدی ڕێبەرایەتی کۆمەڵەی درەوشاوەی خۆی کرد
مانگی سەرسام کردو یەکسەر بەرەو کەپرەکە ڕۆیشتن
تا بە دوای ئەو کەسەدا بگەڕێن و بیگرن، لەوێدا دۆزیانەوە

1-ئیسۆریل و سۆفین، ئەو دوو ناوە لە داهێنانی ملتۆنن، کە یەکەمیان بە مانای ئاشکراکردنی ئاسمان دێت و دووەمیش بە مانای لێکۆلەر دێت. بوونیان لە تەورات نییە،

## 94

وەك بۆق خۆی لە بن گوێی حەوا مات دابوو
هونەرە هەرماسییەکانی خۆی بەکار دەهێنا، تا بچێتە ناو خەیاڵییەوە
تا ئەگەر زاڵ بێ بەسەریا بتوانێ هەرچییەکی بیەوێ
لە خەون و خەیاڵ و ئەندێشەی خۆیا، ئاوا بۆی دابڕێژێ
یا ئەگەر ژەهری خۆی هەڵڕێژێتە ناوجەستەی
ئەوە دەتوانێ هەڵمی هەناسەی حەوا ڕەنگڕێژ بکات
کە لە خوێنی پاکییەوە هەڵدەستێ
وەکو ئەو هەناسە نەرمانەی ، لە ڕووبارە سافەکانەوە هەڵدەستێ
لانی کەم، بە بیرۆکەی حەسوودانەو بیرۆکەی ناڕازی بوون و
پەڵپ گرتن وغرووری دەبەنگانەوهیوای بۆش و شەهوەتی هیلاکسازەوە
کە وەهمە گەورەکان هەڵیدەدەفێنێ
خۆبەزلزانی لێدەکەوێتەوە، ڕەنگڕێژ بکات

## 95

ئەهریمەن ئەوەی لە ناو مێشکی دا بوو
کە ئیسۆریل ڕمی لێ هەڵکێشاو بەئاستەم پێکای
درۆو و قوولڵابکارییەکانی ئەو، لە بەرامبەر پێکانی ڕمی ئاسمان
یەکسەر گەڕایەوە بۆ وێنەی یەکەمی خۆی و هەستایەوە
ئەومیان بۆ ئەو ناکاوێ بوو و ئیشەکەی ئاشکرابوو
دەبینی کاتێ پرووشکە ئاگرێ، دەکەوێتە ناو مشتێ باروووت
کە ئامادەکراوە تا بەرمیلی ناو کۆگاکانی لێپڕکەن
تا ئامادە بێت بۆ جەنگێ کە ڕەنگە ڕووبدات
چۆن ئەو دەنکە ڕەشانە، ئاگردەگرن و دەتەقنەوە
هەوای دەوروبەری دەسووتێنن؟

هەر بەو جۆرەش ئەهریمەن لە ترسی وێنەی حەقیقی خۆی ڕاپەڕی
هەردوو فریشتە جوانەکان، بە نیمچە سەرسامییەکەوە پاشەکشەیان کرد
چونکە بۆ ئەوان بینینی ئەو پاشایە قێزەونە شتێکی ناکاو بوو

## 96

بەڵام ترسیان نەگەیشتێ و یەکسەر لێی چوونە پێشەوەو گووتیان
ئەی ڕۆحی ئاسێی مەحکوم کراو بە دۆزەخ
تۆ؟ بۆ لە زیندانەکەت ڕاتکردووەو وێنەی خۆت گۆڕیوە و
خۆت مات داوەو وەك دوژمنەکان لە مەلاسدای؟
- نامناسن؟ ئەهریمەن کە ئەوەی گووت ، ڕق و قین دایگرتبوو
- نازانن من کێم؟ ئێوە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەتانزانی، کە من دژی ئێوە نیم؟

## 97

کە چوار مێچکی دادەنیشتم و ئێوە زاتی ئەوەتان نەبوو، هەڵبفڕن
نەزانینی ئێوە سەبارەت بە منەوە، ئەوە دەگەیەنێ کە ئێوە دوو نادیارن
هەرئەوەش نا، ئێوە بچووکترین کەسانی تیپەکەتانن
بەڵام ئەگەر دەمناسن، ئەی بۆچی لێم دەپرسن؟
ئێوە بێهوودە دەستتان بەو سەفەرە کردووە
چۆن دەستتان پێکردووە، هەرواش بێهوودە کۆتایی دێت

## 98

زیفۆن بە ڕق و قین بەرامبەر بە ڕق و قینەوە، وەڵامی دایەوە:
ئەی هەڵگەڕاوەی یاخی، وامەزانە وەکو وێنەی حارانی خۆتی و نەگۆڕاوی
یاخود بریقەت کەم نەبۆتەوە، ئێمە زۆرباش دەتناسینەوە
وەك چۆن تۆمان دەناسی، کە پاك و ئاشتیمەند بووی لە ئاسمان

درەوشانەوەی جارانت باری کردووە نەماوە
دوای ئەوەی کە پشتت لە چاکە کرد، ئیدی هیچت نەماوە
ئێستاکێ تۆ وێنەیەکی لە گوناهەکانی خۆت
لە بارەگای قێزەوەن و تاریکی هەڵسان و دانیشتنت

## 99

دەی کەواتە هەڵسەوە، بێگومان ئەوەی ئێمەی ناردووە
بەرپرسی پاراستنی ئەم شوێنەیە لە دەخیلمەندەکان
هەلبەت لێکۆڵینەوەت لەگەڵدا دەکات وئەو دووەشمان لەئازار دەپارێزێ
فریشتەکانی شارۆبیم بێدەنگ بوون
سەرزەنشتەکەیان ئەوەندە بەهێزو توند بوو
خۆشییەکی پتەوی خستە سەر جوانی گەنجێتیان
ئەهریمەن لە شەرمەزارییان، وەستا
هەستی بە ترسی چاکەکاری کرد، چاکەی بینی
کە چەند جوانە لە وێنەی خۆیدا
ئەهریمەن ئەوەی بینی و بۆ گومڕایی خۆی گریاو ئازاری چەشت
بەتایبەت کە هەردوو فریشتە سەرنجیی ئەوەیاندا
بریقەی ترس و تۆقاندنی کوژاوەتەوە

## 100

لەگەڵ ئەوەشدا واخۆی نواند کە ناترسێ و گووتی:
مادامەکێ هەر دەبێ کوشتار هەبێ، ئەوە دەبێ خۆڕاگر بەرامبەر خۆڕاگر بێ
کەواتە من لەگەڵ نێرەر ڕووبەڕوو دەبمەوە، نەك لە گەڵ نێردراو
یا لە گەڵ هەردوویان

جا یا مەزنی زیاترم بەردەکەوێ، یا کەمی کەمان لەدەست دەدەم
زیفۆنی جەسوور وەڵامی دایەوەو گووتی:
ترس و تۆقانی تۆ ناهێڵێت ماندووبین
کەمترین کەسی تواناداری ئێمە، بەتەنها دەتوانی بتبەزێنێ
تۆ چەپەڵ بوویت، ئیدی تاقەتی هیچت نەماوە .

## 101

هەرماس وەڵامی نەدایەوە، بەڵام لە پێستی خۆی چووبووە دەرەوە
بەڵام لە گەڵیانا چوو، وەك ماینێکی خورت و لغاو کراو
کە قەپی لە بزمووکی ئاسنینی خۆی گیر دەکرد
بەڵام سەبارەت بە بەرگری و ڕاکردن، ئەهریمەن بێهوودەی بینین
چونکە ئەو ترسەی کە لە بەرزاییەوە، کەوتە سەر دڵییەوە
توانای لەبەر نەهێشت و ڕماندی

## 102

هەموویان نزیك كەوتنەوە لە شوێنگەی خۆراوا
پاسەوانەکانی نیوە بازنەیی، بەدەوی یەکدا سووڕانەوە و
لە یەك تیپدا ڕیزیان بەست، وەستان و چاوەڕوانی فەرمانی تازەیان دەکرد
گابریل ڕووی لێکردن و بەدەنگێکی بەرز گووتی:
من گوێم لە تریەی پێیەکە، بە خێرایی بۆ لای ئێمەوە دێت
ئێستا دەتوانم تارمایی ئیسۆریل و زیفۆن، لەناو تاریکی شەودا ببینم
کەسی سێیەمیان لە گەڵایە بەخۆو بە قەلافەتی مەلەکی خۆیەوە
ئەو کەسە، هیچ بریقەیەکی نەماوەو کوژاوەتەوە
بەڵام ڕۆیشتن و بزاوتی توندو تیژی وای نیشاندەدا، کە میری دۆزەخە
وابەدیار دەکەوێ، کە بەبێ کێشە نەڕوات
لە شوێنی خۆتا بچەسپێن ، لە دیمەنەکەیەوە سەرکێشی پێوە دیارە

## 103

هێشتا تەواو نەبووبوو، کە فریشتەکان گەیشتن
بەکورتی پێیان گووت، کە کێیان گرتووەو لە کوێ گرتوویانە
چی دەکرد و چۆن، بەچ وێنەیەك خۆی ماتدابوو
گابریل بە نیگایەکی تووندەوە سەیری کردو گووتی:
ئەی ئەهریمەن، بۆچی ئەو تخووبەت بەزاندووە
کە لە بەر سەرپێچییەکانت، بۆ تۆ وێنە کراوە ؟
کاری ئەوانەت خستۆتە نیگەرانییەوە، کە گوناە قەبووڵ ناکەن
هەروەها وەك تۆش ناکەن؟ ئەوانە دەسەلات و مافی ئەوەیان هەیە
لە جەسارەتی هاتنە ناوەوەی تۆبکۆڵنەوە

## 104

وابەدیار دەکەوێ، تۆ دەتەوێ خەوتووەکان بێزار بکەیت
ئەوانەیش کە ئاسمان لەو شوێنە خۆشەدا، نیشتەجێی کردوون؟
ئەهریمەن توێڵی گرژومۆنی قیت کردەوە، وەڵامی دایەوەو گووتی:
تۆ گابریل، حیکمەتی تۆ لە ئاسماندا ناوی دەرکردووە
هەرئەوندەنا، بەڵکو من لە تۆدا حیکمەت دەبینم
بەڵام ئەو پرسیارەی کە تازە تۆ کردت، گومانم دەوروژێنێ
ئایا لە نێو زیندواندا کەسێ هەیە ئازاری خۆشبوێ؟
کێیە کە لە دۆزەخ ڕانەکات، ئەگەر هەلی بۆ ڕێکبکەوێ؟
یا ئەگەر پێیەوە مەحکووم بێت
ئەتۆ خۆشت وادەکەیت و بەجەسارەتەوە بۆ هەرشوێنێك بێ دەچیت
ئەگەر ئەو شوێنە رزگارت بکات لە عەزاب
کە ئەوە هیوایەکە بۆ گۆڕینی سەختی و دژواری، بۆ ئاسانی و خۆشی
پڕکردنەوەی ناخۆشییە بە خۆشی، من ئەوەم داوایە لە هەموو شوێنێ

## 105

تۆ ئەوە بە هۆکار نازانی، تۆ جگە لە چاکە شتێکی تر نازانی
هیچ کات خراپەت ئەزموون نەکردووە
ئایا ویستی ئاسمان، کە ئێمەی زیندانی کردووە، پەڵپ لەوە دەگرێ؟
ئایا ئەو نەیدەتوانی دەرگا ئاسنینەکان توندو پوندکات
ئەگەر بیویستایە ئێمە لەوێ، لە ناو ئەو خەرمندە تاریك و توونە بمێنینەوە ؟
ئەوەشیان بەسە بۆ وەڵامی پرسیارەکەی تۆ
ئەوەی تریش ڕاستە، منیان وەك چۆن دەڵێن ئاوا دۆزییەوە

## 106

بەڵام ئەوە مانای توندوتیژی و ئازار نییە
ئەوەی بە تیزو بێزەوە گووت و فریشتە جەنگاوەرەکە تووڕە بوو
بە نیوە بزەیەکی[1] بێزواندنەوە، بەمجۆرە بەرپەچی دایەوە :
ئاسمان کەسێکی لە دەست چووە
کە فێری جیاوازی نێوان حیکمەت و گەمژەییمان دەکات!
هەر لەو کاتەی کە کەوتۆتە خوارەوە و وەرچەخاوەتە سەرگەمژەیی خۆیەوە
ئێستاکەش هەر گەمژەییە بۆمانی دەهێنێتەوە، کە لە زیندان ڕایکردووە
گومانی لە حیکمەتی ئەو کەسە وروژاوە، کە پرسیاری ئەوەی لێدەکات
چۆن جەسارەتی کردووە، بەبێ ئەوەی هەقی خۆی بێت ، بێتە ئێرەوە؟
ئەو زیندانەی جێهێشتووە، کە ڕەوانەی ئەوێیان کردووە لە دۆزەخ
لە هەمان کاتدا دەڵێت، ئەوە تەواو حیکمەتە
لە پێناو ئەوەی کە رزگاریت بێت، لە عەزاب و
هەرچۆن بتوانی و خۆت لە سزا رزگار بکەیت

---

1- نیوە بزە، ئەهریمەن چۆن قسەی کرد، فریشتەکەش ئاوا وەڵامی دایەوە دایەوە.

## 107

ئەی رەزا گران هەرچۆنت دەوێ ، حوكمی خۆت وابدە
هە تا تووڕەیی خوا دەتگرێ،   ڕاكردنت لە دۆوەخ ئەوەی كردۆتە سەرتەوە
هەق، سزای ڕاكردنت حەوت هەندە زیاد دەكات
حیكمەتەكەشت بە قامچی دەگەڕێنێتەوە بۆ دۆزەخ
دیارە تۆ هیچ چاكەیەك لەوە فێر نەبووی، كە ئێش و ئازار چەند زۆر بێت
قەتاوقەت ناگاتە تووڕەیی ئاسمانی سەرمەدی، ئەگەر تووڕە كرێت

## 108

تۆ بۆ بە تەنها هاتی؟ بۆتەواوی دۆزەخییەكان بەدوای تۆدا نەهاتن ؟
ئایا ئازاری ئەوان كەمترە لە ئازاری تۆ، كە وادەكات ڕانەكەن
یاخود تۆ لەوان خۆڕانەگرتر بووی و كەمتر بەری ئێش و ئازار دەگری؟
ئەی یەكەمین كەسی ڕاكردوو لەبەر ئازار
ئەگەر تۆ هۆی ڕاكردنت، بۆ هاوەڵەكانت ڕوون كردبایەوە
وەك چۆن باستكرد، ئەوە ئاوا بە تەنهایی و ڕاونراو نەدەهاتی بۆ ئێرە

## 109

روخساری ئەهریمەن قۆپاوە ناو یەك و بە توندی وەڵامی دایەوە:
من كەمتر خۆڕاگر نیم، قەت لە ئازار ناترسم
ئەی فریشتەی غەددار! زۆرچاك دەزانی
من بەرگەی توندترین لێدانی تۆم گرتووە
لەو كاتەدا تۆ هانات بۆ ڕەشەبای هەورەتریشقە برد
ئەویش خێرا هاتە هانای ڕمەكەتەوە، خۆ من لە ڕمەكەت نەدەترسام

## 110

بەڵام هێشتا قسەکانت تێکەڵ و پێکەڵە، هەروەکو پێشوو
ئەوەش بەو مانایە دێت، کە تۆ ڕابەرێکی دڵسۆز نیت
کە چۆتە شەڕێکی دژوارو دۆڕاندوویەتی٠
نابێ هەموویان بکاتە قوربانی خۆی
لە ڕێگەیەکی دژوارو پڕ لە هیلاکی، کەخۆی ئەزموونی نەکردبێ

## 111

من یەکەمین کەسم کە ئەومم خستە ئەستۆی خۆم
تا ڕزگاربم لەو خەرمندە گۆشەگیرموە وسیخوڕی بکەم
بەسەر ئەو جیهانە تازموە، کە لە دۆزەخ باسیان دەکرد
ئارەزووم کرد، لێرە ماڵێکی باشتر بدۆزمەوە
هەروەها هێزە نەکبەت بارەکەم، لێرە نیشتەجێ بێ
یاخود لە ناوەندی هەوادا نیشتە جێ بێ
جا لە پێناوی زاڵبوون، جارێکی تریش ئەو هەوڵە بدەوە
کە خۆت و لەشکرەکەت زاتی ئەومتان کردووە
کارەکەی ئاسانە، ئەویش پەرستنی ئاسمانیەتی لەبەرزایی
هەروەها چڕینی گۆرانی درووددو سپاس بۆ عەرشی ئەو
سەما کردن و سەمای چەمینەوە، لە جیاتی جەنگ

## 112

هەرزوو فریشتەی جەنگاوەر وەڵامی دایەوە و گووتی:
بەحیکمەتی خۆلادانت لە ئازارو هەوڵی وەدەستهێنانی زانیاری
خۆت وەك ڕابەرێك نمایش نەکرد، بەڵکو وەك درۆزنێك!

ئینجا – رزگارکەر- پیرۆزیشت خستە سەریانەوە، کە ئەویشت پیس کرد رزگار کردن و شەیتان؟ – بەڕاستی جەستەیەکت هەیە شایانی سەری خۆتە

## 113

ئایا بەرزەفتی و دڵسۆزی و گوێڕایەڵی جەنگیتان وادەکا
لە لایەنگیری کردنی هێزی لە هەمووان گەورەتر نەسڵەمێنەوە
ئەو هێزەی هیچ قسەیەکی تیا ناکرێ؟
تۆ ئەی مەراییکاری مەکرباز، دەتەوێ واخۆت دەرخەی، لایەنگری ئازادی؟
ئەی ئەتوو نەبووی، کاتی خۆی لە هەموویان زیاتر خۆت ڕەپێش دەکردو
لە هەموویان زیاترمەراییت دەکرد و تاوت دەدا
بۆ پەرستنی پاشای ئاسمانی بەهەیبەت؟
ئەی تۆ ئەو کارەت نەدەکرد بۆ ئەوەی ئەو لادەی و خۆت بێیتە شوێنی ئەوەوە؟

## 114

گوێ لەو ئامۆژگارییەم بگرە:لێرە بڕۆ بگەڕێوە ئەو شوێنەی لێی هاتووی
ئەگەر دوای ئەو سەعاتە، لەناو ئەو هەرێمە پیرۆزەدا بمێنیتەوە
ئەوە لە زنجیرێت  دەنێم و پەلکێشی دۆزەخت دەکەمە
وا پەتکت دەکەم قەتاوقەت نەبیتەوە
ئیدی لەمەودوا تیز بە ئاسانی دەروازەی دۆزەخ و شیشەبەندەکانی نەکەیت

## 115

فریشتەکە ئەوەی پێگووت، بەڵام ئەهریمەن نەك هەر بایەخی بەو هەڕەشەیە نەدا
بەڵکو زۆریش تووڕە بوو و وەڵامی دایەوە گووتی :

ئێستا باسی کۆت و پێوەندم لە گەڵدا مەکە، تەنها دوای دیلکردنم
ئەی فریشتەی لەخۆبایی سنوورەکان
بەلاّم تۆ پێش ئەوە، خۆت ئامادە بکە بۆبەرگە گرتنی
سەخت و دژوارییەکانی سەر دەستی زاڵی من
- هەرچەندە پاشای ئاسمان دەست بەباڵتەوە دەگرێ -
هەرچەندە تۆو نزیکەکانت لەسەرکۆت و کۆپەران ڕاهاتوون و
داشقەی سەرکەوتووی ئەو، بەسەر ڕێگاکانەوە ڕادەکێشن
کە ئەو ڕێگایانە بەئەستێرەی ئاسمان تەخت کراون

## 116

لە کاتی قسەکردنی ئەهریمەندا، لەشکری درەوشاوەی فریشتان
سوور هەڵگەڕابوون ورێزەکانی خۆیان بە وێنەی هیلال ڕێکدابۆوە
لە هەموو لایەکدا دەوری هەرماسییان دابوو
دەستەکانیان بەسەر ڕمەوە مشتوو بووبوو، ژمارەیان یەکجار زۆر بوو
وەکو کێڵگەی گەنمی پر شیری ئامادە بۆ دروێنە وابوون
کە سەری فەریکەکانی لە گەڵ ئەو بایەی دەیلەراندنەوە، لار دەبوونەوە
لە کاتێکا جوتیارێك، لەو لاوە بە نیگەرانی  وەستا بوو
ئاوا سەبارەت بە رەنج و بەرهەمەکەی لە ڕاماندابوو
کە جگە لە پووش و کا، هیچ گەنم و جۆیەکی بۆ ناهێنێ

## 117

لەبەرامبەریانا ئەهریمەن هەناوی دەکولاّ
هەموو جەبەرووت و هەڵدەفانی خۆی کۆکردبۆوە

وەك ئەو بەندەرەی[1] كە قەت جووڵە نەكات، مینا چیای تەنریف[2] یا چیای ئەتلەس

باڵای ئەهریمەن تا ئاسمان هەڵكشا، ترس بەخۆ و بە خوزەی خۆیەوە

بەسەر پۆپیتەیەوە هەڵكورمابوو

ئەوەی كە لە ناو دەستیا بوو، وابە دیار دەكەوت كە ڕم و زرێ بێ

## 118

هەر ئێستا ڕووداوی سەیر ڕوودەدات و لەو فتنەیەدا فیردەوس لەناو دەچێ

لەوانەشە گومەزی ئاسمانی خوارەوە، یا لانی كەم هەموو ڕەگەزەكان

لەبەر توندودژواری ئەو شەڕە، لەبەریەك بترازێن و تێكبچن

مەگەر سەرمەدییەكەی ئاسمان نەهێڵێ، ئەوتێكگیر بوونە ترسناكە ڕوو بدات

ترازووی زێڕینی[3] خۆی لە ئاسمان هەڵدەواسێ

1-وەک ئەو بەندەرەی قەت جووڵە ناكات، ئەو لێكچوونە دوو سەری هەیە، یەكەم ئەوەیە ئەهریمەن، گوناهی هەموو پەیڕەوانی خۆی لە ئەستۆدایە، وەک چۆن ئەتلەس گرانایی ئەستێرەكانی بەسەرەوەیە، دووەم وەكو ئەتلەس لە خوای گەورە هەڵگەڕاوەتەوە، چیای ئەتلەس دەكەوێتە ڕۆژاوای باكووری ئەفریقیا، لوتكەكەی هەمیشە لەبەر هەور دیار نییە، وا دەخاتە دڵ، كە ستوونێ لە ستوونەكانی هەرقەل

2- واتە ستوونی ئاسمان، بەڵام چیای - تەنریف - چیایەكی بڵندە لە دورگەی تەنریف، لە دورگەكانی كەناری، 52 كیلۆ مەتر بەرزە.

3- لە بارەی ترازووە زێڕینەوە، ملتون لێرەدا هێما بۆ وەسفی هۆمیرۆس دەكات، لە ئەلیزەدا، كە چۆن زیوس هەردوو تای تەرازووی لە سەر هەردوو شانی دانا، كە هەر یەكەیان نیشانەی لەشكرێكە، یەكیان لەشكری گریكەو یەكیان لەشكری تەروادەیە، گەمەیان پێدەكات بە پێی ویست و خواستی خۆی و سەرپەرشتیا دەكات،هاوكێشەی میلتۆن لە میانی ترازووی ئاسمانی و بورجی ترازو، كلاسیكی نییەو هیچ پێشینەیەكی نییە ، تەنها سبنسر لە كتێبی شاژنی جان دا 5\111 باسی كردووە، كە فاولەر دەڵێت بیرۆكەیەكی قەدیمە، پیویست دەكات سەیری ئەستێرەكانی ئاسمان بكەین، پەیوەست دانی ئەهریمەن و ئەستێرەی مار، وادەكات كە ئەستێرەی ترازوو، لە سەرووی ئەهریمەنەوە بێت، لە نیوەشەودا، بورجی میزان بورجی حەوتەمە، لەمیانی بورجەكاندا، دەكەوێتە پێش بورجی دوپشك و پاش بورجی پاكیزە.

که هێشتاکه وا له میانی بورجی پاکیزەو بورجی دووپشکدایه

## 119

یەکەمین جار هەموو ئەفرێنراوەکان دەخاته تای ترازووەوه
هەموو ئەوشتانه دەپێوێ که ئەفراندوویەتی
که به  به هەوایەکی موقەددەر به دوری زەویدا بەهاوسەنگی دەلەرێنەوه
زەوی خڕو لەرین ئامێز تای یەکەمی ترازووه، هەواش تای دووەمه
ئەوه ئەو ترازووەیه، که ئێستا هەموو ڕووداو وشەڕوشارەکان ترازوو دەکات
سەنگی له ناو هەردوو تای ترازوو داناوه
یەکیان ئەنجامی هەڵوەشانەوەیەو یەکیان ئەنجامی یەکگرتنەوەیه
هەرزوو تای ترازووی دوایی که هەوایه
بەرزبۆوه و بەر ستوونی ترازوو کەوت
کاتێ گابریل ئەوەی بینی قسەی لەگەڵ ئەهریمەن کردو گووتی:
ئەی ئەهریمەن دەزانم هێزی تۆ چەنده، تۆش دەزانی هێزی من چەنده
پێمان بەخشراوەو هی خۆمان نییه
چەند دەبەنگییه شانازی بەهێزی ئەو دەستانەوه بکەین
لەکاتێکا دەستەکانت هیچیان پێ ناکرێ
یاخود دەستەکانم هیچیان پێ ناکرێ
زیاتر لەوەی که ئاسمان ڕێیان پێ دەدات
ئێستاکه من هێزم دوو ئەوەندەی لێهاتووه
هەتا دەتوانم وەك چۆن پێ له قووڕ دەنێم[1] ئاوا پێ له تۆ بنێم
جا ئەگەر سەلماندنیشت دەوێ
وەره قەدەرو بەختی خۆت له و هێما ئاسمانییه بخوێنەوه

---

1-چۆن پێ له قووڕ دەنێم، له ئیشعیادا هاتووه 21\04 – تا وایان لێبکات وەک قووڕ بیانشێلن.

## 120

کێشت سووك بووه و ئەگەر بەرگری بکەیت
لاوازی و شکستت بەدیار دەکەوێ
ئەهریمەن سەیری کرد، کە تای ترازووی ئەو
سووك بوومو بەرزبۆتەوە و کۆتایی هاتووە
پاشان بە بۆڵەبۆڵەوە سەری خۆی هەڵگرت و
لەگەڵیشیا سێبەری شەو سەری هەڵگرت و نەما[1]

1- هەر لەو بەشەی چوارەمدا، باسی تیرە زێڕینەکانی کیوبید کراوە، گوایە زۆر تیژو بریقەدار بووە، بە شێوەیەک کە سۆزی وروژاندوە، بەڵام تیرە رەساسییەکان زۆر تیژ نەبووینەو هەمیشە خۆشەویستیان کوشتووە، ئەمە لە مەسخی کائیناتی ئوفید هاتووە، کە ملتون هێمای بۆکردووە، بەڵام سەبارەت بە چرای بەردەوام، کە لەو بەشەدا باس کراوە، هێمایە بۆ ئەو دژبەندییەی نێوان خۆشەویستی لە فیردەوس ، کە بەردەوامەو خۆشەویستی لەسەر زەوی کە پچرپچرە، بۆیە ڕووناکییەکەی بە چرا دەچوێنێ.
- کە ملتون باسی کانی ئەشق دەکات، مەبەستی سرووودەکانی خۆشەویستییە، کە ئاشقەکان لە ژێر پەنجەرەی مەعشووقەکانیان دەیانچڕی، لە شەوە ساف و ساردەکاندا.
- سەبارەت بەوەی کە فریشتەکان ئەهریمەنیان گرت و دیلیان کرد، ئەمە نموونەیەکی ڕوون و ئاشکرایە کەخوا نەیویستووە شەیتان لە چوونە ناو دۆزەخ قەدەغە بکات، ئەگەر بیویستایە وای دەکرد.
- ملتون کەباس لە چاکە دەکات هێمایە بۆ فەلسەفەی ئەفلاتوونی، بەو مانایەی کەچاکە کاردەکاتە سەر ڕووی دەرەوەی مرۆڤ، ئەو بیرۆکەیەش بووە سیفەتی سەرەکی خۆشەویستی لەسەردەمی ڕۆشنگەریدا، ئەوەشیان بە کاریگەرێتی دانتییەوە بوو.
- ملتوون دووبارە هێما بۆ هومیرۆس دەکات ، سەبارەت بەو لەشکرەی کە وەستا بوون و هەموویان تەیار بە چەک بوون، فاولر دەڵێت ئەو دەستەواژەیەی ملتون، ڕەگێکی ئایینی هەیە، مەبەستی لە مەسەلەی ئەو جوتیارەیە کە تەنها پووشی بۆ دەمێنێتەوە، کە ڕەمزە بۆ ئەهریمەن.کە دواجار هەرپووشی بۆ دەمێنێتەوەو هیچ بەدەست ناهێنێ.

## 1

ئێستێ سپێدە لە ئاسۆی خۆرهەڵاتیدا، هەنگاوی گوڵینی(١) خۆی داوێ
دانەی مرواری(٢) درەوشاوە بەسەر زەویدا پەرش و بڵاو کردەوە
ئادەم وەکو نەریتی هەموو ڕۆژێکی خۆی، لە خەو ڕابوو
لەبەر ئەوەی بە تەواوی، خۆراکی بێگەردی خۆی
هەرس دەکردوهەڵمێکی نەرمیشی سەردەدا
بۆیەش نەرم نەرم وەك چۆن هەوا دەخەوێ، ئاوا دەخەوت
تەنها ورشەی گەڵا و هەڵمی خێرای جۆبارەکان و پەروانەی ئۆرورا و
ئەو سترانە نەرمەی سپێدان، مەلەکان بەسەر چڵەکانەوە دەیانچڕی
بەس بوو بۆ ئەوەی خەوی بڕەوێنێتەوە
بەڵام کەبینی حەوا هێشتا لەخەو ڕانەبووە، سەرسام[٣] بوو

## 2

داوەکانی پرچی بەرهەڵا بووبوون وکوڵمەکانی سوورفڵ بووبوون
وەك ئەوەی گەنجێ بێ، کە خەو شێلووی نەکات
ئەویش بەسەر تەنیشتییەوە ڕاکشابوو
تۆزێ هەستایەوە و خۆی دایە سەر ئەنیشکی
نیگا شەیداکانیشی بە خۆشەویستەکەیەوە هەڵواسرابوو
لە ڕابوون و لە خەوتنیا، سەیری جوانییەکانی ئەوی دەکرد

١- هەنگاوی گوڵینی، هومەر لە ئۆدیسەدا دەستەواژەی پەنجەی سپێدە گوڵینییەکان بەکار دەهێنێ، بەڵام ملتۆن هەنگاوی گوڵینی بەکار دەهێنێ.

٢- دانەی مرواری، واتە ئاوونگ وەکو لوئلوء دادەباری، لێکچوواندنی تیشکی سپێدە، بە دانەی لوئلوئی پەرش و بڵاو بەسەر زەویەوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ مەزمووری١١ و دەڵێ - نوور بە سەر زەوی پیاوچاکاندا پەرش و بڵاو دەبێتەوە.،لاسایی کردنەوەیەکی هومیرۆسە لە ئیلیادە.

٣- ئورۆرا خودای سبەینانە، کە بریتیە لە گەڵای بەیانیان، نەك هەڵمی جۆگەلەکان.

که تیشکی تایبەتی کەمنەزیری خۆی دەهاوێشت، ئینجا
بەچرپەیەك وەکو چرپەی شنەبا، بۆ گوڵەکان، بەنەرمی لاواندییەوە
وەك چۆن زیفیرۆس فلورای(١) دەلاواندەوە، گووتی :
ئەی جوانترینی هەموو شتەکان(٢)، ئەی ژنەکەم ، ئەی ئەو ونەی بۆت دەگەڕێم
ئەی دوا ئەو خۆشییەی کە ئاسمان بە منی بەخشیوە و
دوا ئەو شادییەی، کە بە درێژایی زەمان تازە دەبێتەوە

## 3

هەستە لەخەو وا ڕۆژهەلات، کێڵگە جوان و ڕازاوەکان، بانگمان دەکەن
هەڵسە گزنگ پێشمان کەوتووە، با سەیری ڕووەك و بێستانی پرتەقاڵی بۆندار بکەین، کە بایەخمان پێداون، بزانین چۆن گوڵیان داوە؟
یاخود سەیری ئەو دەرختە تاڵبوومانە بکەین
بزانین چۆن کەتیرمیان لێ دەتکێتەوە
چۆن قامیشی ڕوتاب شین دەبێ و چۆن سروشت وێنەی ڕەنگەکان دەکات؟
هەنگەکان بەسەر چلەوە هەڵدەنیشنەوە تا شیلەی شیرنییان هەڵمژن

## 4

حەوا لەگەڵ ئەو چرپە چرپەیەدا بە ئاگا هات
بەڵام بەترسەوە سەیری ئادەمی کردو لە ئامێزێ نا و گووتی:
ئەی تەنها ئەو کەسەی کە بیرکردنەوەکانم، تەنها لە تۆدا ئاسوودە دەبن

١- زیفیرۆس خوای بایەکانی خۆراوایی بوو و فلۆراش ژنی بوو، کە خوای گووڵەکانە لای رۆمانەکان، هەناسەی عەتراوی زیفیرۆس دەبووە مایەی ئەوەی کە گوڵ شین ببێ

٢- ئەی جوانترینی هەموو شتەکان، لە غەزەلی غەزەلەکان دا هاتووە - هەستە خۆشەویستەکەم، ئەی جوانەکەم

جوانی من بەتۆوەیەو تەواوبوونیشم هەر بەتۆ
چەند دڵخۆشم بە بینینی ڕوخساری تۆ و گەڕانەوەی سپێدە

**5**

دوێنێ شەوێکم بە سەر بردووە، قەت پێشتر شتی وام نەبینیوە
لە خەودا بینیم - ئەگەر خەو بووبێ- کە قەت لە خەوندا بەوە ڕانەهاتووم
تۆم نەبینی، کە بە درێژایی ڕۆژێ کارت دەکرد، یا نەخشەت بۆ بەیانی دادەڕشت
بەڵام گوناه و تاریکی وام بینی، کە هەرگیز بەخەیاڵم دانەدەهات
پێشتر قەت شەوی شەوەندەمی وەهام نەبینیوە

**6**

وام بە خەیاڵداهات، کە بوونەوەرێ لە نزیك گوێچکەکانم وەستا بوو
بانگی دەکردم تا بە دوای دەنگی ئەودا بچم
دەنگێکی نەرم بوو، وامزانی دەنگی تۆیە و پێی گووتم:
ئەو سستیە لە خۆت داتەکێنە، کاتی چێژ وەرگرتنە
ئێستا کاتی خۆ فێنك کردنەوەو کپییە
کپی خۆی دەدا بە دەست، ئەو بولبولەی بەشەو دەچریکێنێ
ئێستاکە لە خەو ڕادەبێ، تاخۆشترین گۆرانی ئەڤینی خۆی بچڕێ
ئێستێکە مانگی یەك شەوەی ڕووناك، دەسەڵاتی خۆی ڕادەخات
تریفەی خۆی دەنێرێ و سێبەری خۆی هەڵدەداو
ڕووی شتەکان وەدەردەخات
جا ئەگەر کەسێ نەیبینێ ئەوە بە فیڕۆ دەڕوات

## 7

ئاسمان بە هەموو چاوەکانییەوە لەخەو ڕابووە
جا جگە لە تۆ کێ هەیە ببینێ، ئەی تاسووقی سروشت؟
ئەی ئەو کەسەی هەموو شتێ بە بینینی تۆ، دڵشاد دەبێ
ئەی ئەو کەسەی کە دڵ دەبەی و بە جوانی خۆت
مشتی دەکەیت وهەرگیز چاوی لەسەرتۆوە هەڵناگرێ
ئیدی بەخەبەر هاتم وەك چۆن بە بانگی تۆ بەخەبەر دێم
بەڵام تۆ لە تەکمەوە نەبووی، بۆیە ڕامکردوو بە دوای تۆدا گەڕام

## 8

وام خەیاڵکرد کە بە تەنها بە ڕێگادا دەڕۆیشتم
یەکسەر گەیشتمە درەختی مەعریفەی حەرامکراو
جوان هاتە بەرچاوم و واهاتە بەر خەیاڵم کە لە کاتی ڕۆژێدا جوانترە
لە کاتێکا بە سەرسامییەوە سەیرم دەکردێ
بینیم بوونەوەرێك لە تەك دارەختەکەوە وەستاوە
بوونەوەرێکی باڵدار بوو، لەو بوونەوەرانە دەچوو
کە زۆر جار لە ئاسمان بینیومانە، کەزییە تەڕەکانی عەتریان لێدەچکایەوە

## 9

وەکو من سەیری ئەو درەختەی دەکرد
قسەی لە گەڵ ئەو درەختە کرد،گووتی ئەی درەختی جوان و پڕبار
ئایا کەس نییە سۆز بکات و باری گرانت سووك بکات
تامی شیرینیت بکات؟ ئینسێ یا جانێ نییە ئەوە بکات؟
ئایا مەعریفەت، ئا بەو ڕادەیە مایەی ڕك لێبوونەوەیە
ئایا دەبێ چ حەسەدێ یا چ حەرامکردنێ، قەدەغەم بکات تامی بکەم؟

دەبا چۆنی دەوێ وا قەدەغەی بکات
لەمەو دواهیچکەسێ ناتوانێ، لەو چاکە کرایەوەدا، ڕێم پێبگرێ
ئەگەر نا ئەو درەختە لەپای چی لێرە شین بووە؟

## 10

بەرهەمەکەی ڕنی و تامی کرد، بە بیستنی ئەو قسە جەسوورانەوە
سەلماندنی بە کارە جەسوورانەکەیەوە، ترسێکی تاڵ و سارد دایگرتم
بەڵام ئەو وەها دڵخۆش بوو بوو گووتی:
ئەی میوەی پیرۆز، تۆ لەزاتی خۆت شیرینی وشیرینتریشی ئەگەر بتچنن
تۆ لێرە  حەرام کراوی- وەك چۆن بەدیار دەکەوێ –
چونکە تۆ، بە تەنها میوەی ئەربابەکانی ودەتوانی مرۆڤ بەرزبکەیتەوە
بۆ ئاستی ئەوان، ئەدی بۆچی مرۆڤ نابێتە ئەرباب؟
مادامەکێ چاکە زیاتر ببێ، بە زیادبوونی ئەوانەی وەریدەگرن
کە زیانی نابێ بۆ خاوەنەکەی، بەڵکو شەرەفی پێ زیاد دەبێت

## 11

فەرمووحەوا، ئەی ئەفرێنراوی بەختەوەر، ئەی فریشتەی جوان
بەشداریم بکە لەو تەڕەمیوەیە، تۆ هەرچەندە ئێستا شادو بەختەوەری
ئەوە شادو بەختەوەرتر دەبیت، کەس لە تۆ زیاتر شایانی ئەوەنییە
وەرە تامی ئەو میوەیە بکە تا تۆش ببیتە ئەرباب
ببە بە خوداوەندی خۆت و خۆت پابەند مەکە بە زەوی
جا وەکو ئێمە جاجارە سەر هەوا دەکەوی و
بە باشییەکانی خۆتەوە دەچیتە ئاسمان
ئەوسا ئەو جۆرە ژیانە دەبینی، کە لەوێدا ئەربابەکان تیایا دەژین
وەکو ئەوان دەژیت، ئەوەی گووت و نزیك کەوتەوە

هەندێ لەو میوانەی پێشکەش کردم
– بەڵکو ئەوەندەی نەمابوو لە دەمم بنێت –
بۆنە خۆش و بە تامەکەی پەرش و بڵاو بۆوە

## 12

نەوسی ورووژاندم، وام خەیاڵ کرد کە ناتوانم تامی نەکەم
یەکسەر لە گەڵیا هەڵفڕیمە ناو هەوران و لە ژێرەوە زەوی فراوانم بینی
دیمەنێکی فراوان و ڕەنگاو ڕەنگ بوو، سەرسام بووم بە فڕین و بەرزبونەوەم
ئەو بەرزبوونەوە هێجگار بڵندبوو، ڕێنیشاندەرەکەی تەنیشتم ونبوو
وام خەیاڵ کرد کەوا دادەبەزم، خەو چاوی داگرتم
بەڵام چەند دڵخۆش بووم کە بە خەبەر هاتم و زانیم ئەوە خەونەو بەس

## 13

ئابەمجۆرە حەوا لە گێڕانەوەی چیرۆکی خۆی بۆوە
ئادەم بە دەنگێکی خەمبارەوە وەڵامی دایەوەو گووتی:
ئەی مەزنترین وێنەی زاتی من، ئەی نیوە دڵی نزیك دڵم
ئەوەی کە دوێشەو لە خەوندا زەینی تۆی شێلوو کردووە
کاری لە منیش کرد و منیشی شپرزە کردووە
ناتوانم ئەو خەونە غەریبەم خۆشبوێ، دەترسم مایەی خراپەکاری بێت

## 14

بەڵام خراپە لە کوێوە دێت؟ ناتوانێ لە تۆدا شوێنی خۆی بکاتەوە
تۆ پاك و پاڵاوتە ئەفرێنراوی، بەڵام دەبێ ئەوە بزانی
زۆر هێزی بچووك هەیە لە نێو دەروون، کە خزمەتی ئەقڵ دەکەن
بەو پێیەی کە ڕابەرە، لەوانە خەیاڵ، کە لە دوای ئەوەوە دێت، لە پلەوپایەدا

خەیاڵ تایبەتە بەو  شتە دیارانەی، کە هەر پێنج هەستەکان
پێشکەشی ئێمەی دەکەن، ئەویش ئەندێشەو وێنەی ئەثیریان لێ دادەڕێژێ
کە ئەقڵ بەیەکەویان پەیوەست دەدا، یا لێکیان دەترازێنێ

**15**

کەواتە ئێمە یا  ڕازی دەبین بەوە، یا ڕەتی دەکەینەوە
ئەوەیان دەچەسپێنین یا نکۆڵی لێدەکەین
ئەوەیان پێی دەووترێ زانین و بیروباوەڕ
پاشان هەموو ئەو شتانە هەڵدەکشێنە زیندانی تایبەت
لەو کاتەی کە سروشت، دەچێتە باری حەسانەوە

**16**

زۆر جار لە ئامادە نەبوونی سروشتدا، خەیاڵێکی درۆزن بە ئاگادێ
قسەی لەگەڵ دەکات و لاسایی دەکاتەوە
بەڵام پەیوەندی نێوان وێنەکان پیس دەکات
زۆرجاران وێنەی وا دەردەدات، کە لە خەونەکانماندا، دەیانبینین
بریتیە لە کردارو رەفتاری دژبەیەکی دوێنێی نزیك و دوور
وا خەیاڵ دەکەم، وێکچوونێ هەیە لە میانی ئەو خەونەی تۆو
ئەوانەی دوێشەو لە قسەکانماندا باسمان لێوە کردووە
لە گەڵ چەند شتێکی غەریب کە تێیکەوتبوو

**17**

بەڵام خەمبارمەبە، زۆرجاران خراپە دەپەڕێتە سەر دڵی فریشتەو
یاخود ئینسانەکانیش و لەوانەیە بێو بڕوات، باش نییە، بەڵام
نە لەکەیەك بە جێدەهێڵێ، نە شوورەییەك لە دوای خۆیداو بەمجۆرە

من هیوادارم ئەو خەونەی کە مایەی ڕقلێبوونەوە بووبۆ دەروونت
لە کاتی خەوندا، هەرواش بێزراو بێت، بۆ دەروونت لە کاتی ڕابووندا
بەڵام خەمبارو وەڕەس مەبە و با ئەو هەورە بڕەوێتەوەو
ڕوخسارت داگیرسێت و لە نووریا بدرەوشێتەوە
کە درەوشاوەترە لە یەکەم بزەی سپێدەی جوانی ئەم کەونە

## 18

دەی با بۆ کارەکانی ئەم ڕۆژە تازەیەی ناو بێستان وکانیاوو گوڵەکان ڕابین
کەوا خەریکە بۆن و بەرامەی خۆیان ئاشکرا دەکەن
ئەو بۆن و بەرامەیەی لە شەودا، ئەمباریان کردووە
لە خەزنەی خۆیان پارستوویانە
ئابەمجۆرە سینەی بووکە جوانەکەی کرایەوە
بەڵام هەرچاوێکی، چەند دڵۆپە فرمێسکێکی نەرم(١) و کپییان هەڵڕژاند
بە قژی خۆی وشکی کردنەوە(٢)، دوو دڵۆپەی تری بە نرخیشی قەتیس مابوون
هەریەکەیان لە پەنجەرەی بلوورینی خۆیەوە وەستا بوو
بەڵام ئادەم، بەر لەوەی بتکێنە خوارەوە، بە ماچەکانی وشکی کردنەوە

## 19

حەوا لەوە ترسا(3) کە نەبادا گوناهی کردبێ

---

١-چەند دڵۆپە فرمێسکێکی نەرم، یا بە قژی خی وشکی کردنەوە، ئەوشیان دوو بەڵگەی نەرم و نیان بوو، بۆ سووکە پەشیمانییەک و ترسی دروود

٢- سڕینەوە بە پرچ ، مەریەمی مەجدەلییە وەبیر خوێنەر دەهێنێتەوە.
٣- لەچی ترساو لە چی پەشیمان بۆوە، ئەگەر لە تام کردنی درەختی مەعریفە ترسا بێت، ئەوە هیچ نەبووە، خۆ ئەگەر لە خەونی خۆی پەشیمان بووبێتەوە، ئەوە پێش ڕووداو

ئابەم جۆرە کەش و هەواکە ساف بۆوەبە پەلە چوونە ناو کێڵگەکان و
لە ژێر بنمیچی سێبەراوی چیمەنی(١) خۆیان هاتنە دەرەوە
بەڵام لەبەردەرگای چیمەنەکەدا وەستان، کە بینیان وا سپێدە دەدرەوشێتەوە
خۆرەتاویش هێشتا هەڵنەهاتبوو، بە ناو لێواری دەوروبەرەوە دەسووڕایەوە
تیشکە تەڕو تەریبەکانی بۆ سەر زەوی دەنارد
دیمەنێکی پان و درێژی خۆرهەڵاتی فیردەوس و
دۆڵە خۆشەکانی عەدنی ئاشکرا دەکرد

## 20

ئادەم و حەوا بە درووەوە چەمینەوە بۆ ئاسمان و دەستیان کرد بە نوێژ
کە هەموو بەیانیان ئەنجامیان دەدا، لەگەڵ هەموو سرووتەکانی
ئەوان ئەو سرووتانەیان دەپاراست، دڵی پڕکردبوون لە سۆزی پیرۆز
بە سروودی مەزن، سپاسی ئاسمانی خۆیان دەکرد و گۆرانیان بۆ دەچڕی
بەبێ خۆ ئامادە کردن دەیانگۆتەوە!
وەکو شیعری نەغمەدار(٢) و بەخشان، لە لێوەکانیانەوە هەڵدەچوو
شایانی عودو سێتار بوون، بۆزیاتر شیرینی
ئابەمجۆرە درووديان نارد بۆ ئاسمان

## 21

دەیانگووت ئەوە کارە جوانەکانی تۆیە ئەی باوکی چاکە
ئەی بەرزو بەڕێز، پەیکەری ئەو کەونەت بە جوانی و داهێنانەوە ئەفراندووە

---

١- واتە بنمیچی کەپرەکە.

٢- شیعری نەغمەدار، یاخود شیعری ژمارەیی ، میلتۆن پێی وابوو کە ریازیات، یارمەتی ڕێکخستنی شیعری نامەوزون دەدات، دەبێتە هارمۆنی و ڕیتمئامێز، بە پێی ئەو ژمارەیەی کە پشتی پێ دەبەسترێ لە شێوازی گووتندا.

وای چەند بە تواناو داهێنەری، ئەی ئەو کەسەی وەسف ناکرێت
یەکسانی سەر عەرشی ئاسمان دەبیت و هیچ چاوێ دەرکت پێناکات
ئێمەیش شتێك جگە لەو دەسکردانەی دونیا لە تۆدا نابینین
بەڵام هەموویان گوزارشت لە چاکەی تۆ دەکەن
بەرزی قودرەتی تۆ، لەسەرووی تێگەیشتنەوەیە

## 22

بۆمان باس بکەن ئەی باشترینی عارفان، ئەی کوڕانی نوور
ئەی فریشتەکان، ئێوە دەیبینن وبە یەکەوە گۆرانی و سروودی
گونجاوی بۆ دەڵێن، لە ڕۆژێکی بەردەوامدا، کە هەرگیز
شەوی بەسەرا نایەت، ئێوەن دەوری عەرشی دەدەن
لە ئاسماندا دڵخۆشن، لە زەویشدا هەموو ئەفرێنراوەکان
کۆدەبنەوە بۆ بە گەورە زانینیو هەرئەو خۆیەتی، یەکەم و کۆتایی و
ئەوەی لە نێوانیشانداهەیە، هەر ئەو هەتا هەتاییە
ئەی جوانترین ئەستێرەی ئاسمان(١) و دوا قیتاری شەو
بریا تۆ لە ریزی سپێدان نەبوای، کە تۆ موژدەی دەرکەوتنی ڕۆژی
بە بازنەی گەشاوەت،تاج دەخەیتە سەری سپێدەی ڕووگەشەوە
لە کاتە خۆشەکانی شیرینی سەرەتاوە، درووردی بۆ بنێرە

## 23

تۆش ئەی خۆرەتاو، ئەی چاوی ئەم دونیا مەزنەو ئەی ڕۆحی ئەو
درووود بۆ ئەو مەزنە بنێرە، کاتێ لە فەلەکی سەرمەدی خۆتەوە

---

١- ئەی جوانترین ئەستێرەی ئاسمان، ئەستێرەی سبیانان کە پێی دەڵێن لۆسیفەر، واتە - رۆژهەڵات – بە ڕۆژو هیسبیرۆس بە شەو، لە هەموویان گەشترە وەک لە ئیلیادەدا هاتووە لە ٢٢: ٥١٣

دەچیتە عەویقی ئاسمان، بە گۆرانییەوە پەسنی بکە
لە نیوەڕۆیان کاتێ کە دادەبەزێت(١)
ئەی مانگ .کە جارێ بە خۆری ڕۆژهەڵات دەگەیتەوە
جارێکیش لە گەڵ ئەستێرەی جێنەگۆڕەکانەوە دەفڕیت
چەسپاو لەو مەدارەی کە تیایا هەڵدەفڕێ، ئەی پێنج ئاگرەکانی(٢) تر
ئەی ئەوانەی سەمای سیحری خودان ئاواز ئەنجام دەدەن
دروودو سپاسی بۆ دووبارە بکەنەوە
ئەو بوو کە نووری لە تارێکیدا دەرهێنا

## 24

ئەی هەوا، ئەی هەرچوار ڕەگەزەکە، ئەی ئەو کەسەی کە
بۆ یەکەمجار تۆ لە دایك بووی ولە رەحمی سروشت هاتیتە دەرەوە
ئەی ئەو کەسەی چوارناڵە(٣) بە ناو ئەڵقەیەکی ئەزەلیدا دەسووڕێیتەوە
کەئەو ئەڵقەیە وێنەی جۆراو جۆری هەیە
تێکەڵ دەبیت و خۆراك دەبەخشییە هەموو شتەکان بانگی گۆڕانی
جۆراوجۆری خۆت بکە
ڕوو لە ئەفرێنەری گەورەمان بکات، دروودی بۆ بنێرێ و پەسنی کات
ئێوەش ئەی هەورەکانی تەمتوومان، ئەی ئەو هەناسانەی
لەو گردو دەریاچەیانەی، کە هەڵمی تۆخ و خۆڵەمێشی
دایگرتوون و بەرزدەبنەوە، تا خۆرەتاو دامەنی جلە نەرم وکراوەکەتان

---

١- لە نیوەڕۆیان کاتێ کە دادەبەزێت، لێرەوەیە کە میلتۆن پەیڕەوی لە پەتلیمۆسییەت دەکات.

٢-ئەی پێنج ئاگرەکانی تر، پێنجەستێرە کە بریتیە لە زوهرەو عەتاردو مەریخ و موشتەریو زوحەل

٣- چوار ناڵە، ئەوەیان تیوری ئەفلاتوونییە، لە دیالوگی تیماوسدا ، کەوای دەبینێ، هەر یەک لە چوار ڕەگەزەکە، لەوانەیە بگۆڕێن و ببنە ڕەگەزەکانی تر.

بەزێر بنەخشێنێ، ئێوەش بەرزببنەوە بۆ ڕێزلێنان لەخودانی
ئەو کەونە گەورەیە، تا ئاسمانی ساف و بێگەرد بڕازێنیتەوە

## 25

یاخود زەوییە تێنووەکان بە ڕێژنەی باران ئاو بدە
لە هەڵکشان و داکشانت، دروودی بۆ بنێرە و مەزنی کە
ئێوەش ئەی بایەکانی هەرچوار ئەقلیمی ئەم کەونە، سپاسی بکەن
بە نەرمی بێ یا بە توندی
تۆش ئەی دار سنۆبەر، بە هەموو ڕەنگەکانتەوە، سەردانەوێنە
قەدی خۆت بلەرێنەوە، لە ترسی ئاسمان
ئەی کانیاوەکان، ئەی جۆبارەکان
کە خووڕەیان بە چرپەوە، ئاواز دەبەشنەوە وهەڵدەڕژێن
با هەموو دەنگەکانت گەلاڵە بن، ئەی ڕۆحە زیندووەکان
ئێوەش ئەی مەلەکان، کە بە چریکەکانتانەوە، دەگەن بە دەرگای ئاسمان

## 26

تۆ ئەی ئەوکەسەی مەلە لە ئاو دەکەی، ئەومیش بە سەر زەویدا دەڕوات
تۆ ئەی ئەو کەسەی بە بەرزییەوە هەنگاو هەڵدێنی وئەومیش لەسەر زگ دەخشێی
ئێوە هەمووتان شاهێد بن کە گردۆلکەو دۆڵ و کانیاوەکان و
سێبەرە تەڕو فێنکەکان، گۆرانی من دەڵێنەوەو
هەموویانم فێرکردوون، دروودی بۆ بنێرن

## 27

خودایە، ئەی خودانی هەموو کەونەکان
دەبا خۆشییەکانت هەر هەبێت و بەردەوام بێت
با رسقی تۆ هەر چاکە بێ

ئەگەر شەو هەندێ خراپەی لەخۆیدا لوولدابێ و شاردبێتییەوە
هەڵیپرووکێنە، وەك چۆن ئێستاکە نوور تاریکی و نووتەك دەپرووکێنیتەوە
ئا بەمجۆرە لە درووددی خۆیان بوونەوەو
دڵیان وەکو جاران ساف بۆوەو تژی نیایی بوو

## 28

یەکسەر بەرەو کێڵگەکان بوونەوە، بۆ کاری سپێدان
بۆ ناو ئاوونگ و گوڵەکان، کە درەختەکان بەرێزە، بەروبومیان دابوو
درەختەکان هەڵکشابوون و درێژ ببوونەوە و
چڵەکانیان تێکگیر بوو بوون و چڕ هەڵگەڕابوون
تەواو سەریان لە بەرزی نابوو و تێراوبوو بوون
چاوەڕوانی ئەو دەستانەیان دەکرد
تا سنوورێ، بۆ تێکگیربوونی نەزۆکیان دانێن
توولەی مێوەکانیان بە لق و پۆپی درەختی دردارەوە شەتەك دەدا
مارمییەکەش هێشووەکان بوو، هێنابوویان
گەڵای نەزۆکی درداریان پێدەڕازاندەوە

## 29

لە کاتێکا خەریکی کاری خۆیان بوون
پاشای ئاسمان ئەوانی بینی بانگی ڕۆفائیلی کرد
کە پاشای هاودەمی وهاوپەیمانی و پێکەوەیی بوو
بەر لەوەی لە گەڵ تۆبیا دا بڕوات و زەماوەندی خۆی
لە گەڵ پاکیزەدا دەستەبەر بکات، کە حەوت جاران شووی کردبوو
گووتی رافایل، تۆ بیستووتە چی ڕوویداوە لەسەر زەوی؟
ئەهریمەن بە ڕێگەی خەرەندی تاریکیدا، لە دۆزەخ ڕایکردووە

له فیردموس نیشتۆتەو، دوێشەو  له ئادمم و حەوای تێکداومو
شەوی لێتارکردوون، دمیەوێت له ڕێگەی ئەوانەوە
به یەکجاری، هەموو مرۆڤایەتی وێران بکات

## 30

کەواته برۆ بۆ لایان و نیوەی ڕۆژێیان لەگەڵدا ببەسەر
لەگەڵ ئادممدا قسه بکه ، وەك قسەی هاوڕێ بۆ هاوڕێ
له ناو کەپرەکەیدا یا له سێبەری درەختەکاندا
که دمبینی له گەرمای نیومڕۆدا ڕادەکات، تا نانی نیومڕۆی خۆی بخوات
یا له کاتی حەسانەوەدا دەیدۆزییەوە، ئینجا تۆ سەری قسه ومرگره
له گەڵیا بکەوە ئاخاوتن، تا لەو ژیانه خۆشەی که هەیەتی،
ومئاگای بهێنییەوە
بەختەوەری و خۆشی دەسەلاتی ئەوە
ئەگەر ئازادی ببەخشێته  خواستی خۆی
ویستی ئەو له ئازادیی ئەودایه، بەلام دوودڵه

## 31

ئاگاداری بکەوە، ئاگای لەخۆ بێت، لەبەر ئەوەی  متمانەی زۆری بەخۆی هەیه
 لەڕێ لانەدا، هەروەها له سەرچاوەی مەترسییەکان و دوژمن ئاگاداری بکەرموە
که بەم دواییه له ئاسماندا بەهۆی خراپەکاری، دارماوە و خەریکی پیلانه
تا ئەوانی تریش له بەهەشتی شادی ومدەرنێت
به توندو تیژی؟ نەخێر، چونکه ڕووبەڕووبوونەوە، ئاسانه لای ئەو
بەڵکو به فێڵ و درۆ، با ئادمم ئەوە بزانێ، ئەگینا به هەنجەتی ئەوەی

کە کارەکە لەناکاو بوومووکەس ئاگاداری نەکردۆتەوە و خەبەریان نەداوەتێ
بە ویست و خواستی خۆی تووشی هەڵە دەبێت و هەڵە دەکات

## 32

ئابەمجۆرە باوکە سەرمەدییەکە ئاخاوت و دادپەروەری تەواوی هێنایە دی
فریشتە باڵدارەکە، لە میانی هەزاران فریشتەی درەوشاوەی تری ئاسمان
خۆی لە پەنا هەردووباڵەکانییەوە شاردبۆوەو وەستابوو
دوای ئەوەی کارە گرینگەکەی وەرگرت، بەبێ دواکەوتن
تاوی داو بە سووکی هەڵفڕییە ناوەندی ئاسمانەوە
کۆمەڵەی فریشتان لە هەردوولاوە، ڕێگایان بۆ خێرایی ئەو کردەوە
بەمجۆرە بە خێرایی ڕێگای کۆئەستێرەکانی بڕی، تا گەیشتە دەرگەی ئاسمان
دەرگاکە لە خۆیەوە کە بە سەر دوو جومگە سیوسیوەی زێڕینەوە بوو
کەوتە سەر پشت، وەك کارێکی پیرۆزوابوو
ئەندازیاری بالآی ئاسمان دروستی کردبوو

## 33

لەوێ نەهەور ، نە تەگەرەیەکی، لەبەرچاودا نەبوو
هیچ ئەستێرەیەك ڕێگەی پێنەدەگرت، زەوی بینی چەند بچووکە
بەلآم لەگەڵ تۆپەڵە درەوشاوەکانی تر گونجاو بوو
بەسەر بانەکانەوە فیردەوسی خوای بینی، تژی درەختی ئیرز بوو
وەك چۆن دووربینی گالیلۆ بە شەو
شارو هەرێمە خەیاڵییەکانی ناو مانگی دەبینی
یاخود کەشتیرانێك کە لە ناوەندی سیکلادیسدا
دورگەی دیلۆس یا سامۆسی، وەك پەڵە هەورێ دەبینێ

- دووربینی گالیلۆ، یەکەم دووربینی بینینی مانگ بووە.
- سیکلادیس کۆمەڵە دورگەیەکە لە دەریای ئیجە، دیلۆس لە ناوەندیانە و سامۆسیش لە باکووری ڕۆژهەلاتی ئەو دورگانەوەیە.

## 34

لە هەڵفڕینیدا بە پەلە دادەبەزییە ئەوێکەوە
بەناو ئاسمانی ئەثیری فراوان و بەناو ئەم جیهان و ئەو جیهاندا
بە باڵی چەسپیویدا ڕەت دەبوو
جارێ بەسەر بای جەمسەرەکاندا، شەققەی باڵی هێور دەکردەوە
هەندێ جاریش خێراتر، لە شەققەی باڵی دەدا
هەوای ساف و خۆشی لە بێژینگ دەدا، بەرز بەرز هەڵدەفڕی
تا ئەو شوێنەی کە هەڵۆکان دەیگەنێ
تا لە ناوجەرگەی فڕیندا، لە میانی ئەو هەڵۆیانەی دەسووڕانەوە
وەك فینیکسێ(١) بەدیار کەوێ
وەك باڵندەیەکی تەنها، سەیری هەمووانی دەکرد
تا لە پەرستگای خۆرەتاوی تیشکیندا، زەخبرەی خۆی کۆکاتەوە

## 35

یەکسەر بەسەر تاوێرەبەردی ڕۆژهەلاتی دەرگای فیردەوسدا نیشتەوە
گەڕایەوە سەروێنەی یەکەمی خۆی، وێنەی فریشتەی باڵداری سارۆفیم
هەرشەش باڵەکەی، جەستەی نوورانی ئەویان دەشاردەوە
ئەو دوو باڵەی هەردوو شانی دادەپۆشت

---

١- فینیکس یا قەقنەس باڵدارێکە هەر ٥٠٠ ساڵ جارێ دەگەڕێتەوە بۆ شاری خۆرەتاو- هلیوبولیس – لەوێ بە شێوازی ناسراوی خۆی نوێ دەبێتەوە، میلتون یەکیەتیەکی لە نێوان هلیوبولیس و تیبە دروست کردووە.

وەك زەخرەفەیەكی پاشایەتی بەسەر سینەیا، شۆڕ بووبوونەوە
هەردووباڵی ناوەند، كە كەمەریان دادەپۆشت

## 36

وەك كەمەربەندێكی ڕازێنراو بە ئەستێرە وابوون
بەسەر ڕان و تەنكێشی دا سووڕابوونەوە
بە كەفی زێر،كە ئاسمان بۆیەی كردبوون داپۆشرابوون
بەڵام دووباڵەكەی تر، هەردوو پاژنەی پێیان بە زرێبەندی تووك داپۆشتبوو
ئەو دووباڵە لە ڕەنگی قورمزی ئاسماندا بوو

## 37

وەكو ئەستێرەی كوڕی مایا(١) وەستاو تووكی خۆی دادەوەشاند
بۆنی ئاسمان هەموو ئەو هەرێمە فراوانەی دادەگرت
كە لە دەوروبەریەوە بوو، یەكسەر هەموو ئەو فریشتانەی
كە كاری پاسەوانیان دەكرد، ناسییانەوە
هەرهەموویان لەبەریا هەستانەوە، وەك سڵاوێك بۆ پایەو ڕێزێك
بۆ ئەو كارە بەرزەی كە پێی سپێردراوە

## 38

ئەوان زانیان كە پەیامێكی گرینگی ئاسمانی پێیە
بە تەك خێمە درەوشاوەكانیان داچوو، تا گەیشتە كێڵگەی پیرۆز

---

١- كوڕی مایا، ئەوە هورمسی یۆنانییە یاخو میركوری ڕۆمانی یا عەتاردی عەرەبی، مایای كچی ئەتلەس، سگی پڕ بوو لە زیوس، كلاوێك و عەسایەك دوو باڵی هەبوو، تەتەری خوداوەندەكان بوو، نەریتی شاعیرەكان بوو، كە فریشتەی ئاسمانیان بە خواوەندە یۆنانییەكان دەچوواند، چونكە ئەركەكە نەگۆڕابوو

بەناو دارستان و بێستانی تاڵ و گوڵی بۆنداری زەیتی خۆش و خۆشاودا
ئایەتێك بوولە جوانی، لە هەڕەتی گەنجێتی دابوو
چۆنی بویستایە ئاوەها بەسەری دەبردو یاری دەكرد
هەرچییەكی بە خەیاڵ دا هاتبا دەیشیناندو سەوزی دەكرد
داهێنە ڕەهاكانی وەها هەڵدەڕژان
كە مەزنتر بوون لە داهێنانەكانی هونەر، خۆشییەكی باڵادەست بوو

## 39

ئادەم كە لەبەر دەرگای چیمەنە تەڕو پاراوەكەیدا دانیشتبوو
فریشتەی بینی، كە بەناو دارستانە بۆندارەكەوەدا دێ
خۆرەتاوی لە ناو جەرگەی ئاسماندا، دەنارده ناو ڕەحمی زەوی
گەرماتییەكەی توونە تر بوو لەوەی، كە ئادەم گەرەكی بوو
لەو كاتەدا، حەوا لەناو چیمەنی قەدیفەدا بوو
خواردنی لە میوەی بە تام، ئامادە دەكرد
تامی خواردنەكەی حەزو نەوسی ڕاستەقینەی دەوروژاند
بەڵام تێنویتی بۆ قومێك شیلەی نكتاری(١)
لە ڕووباری ئاوی شیرین و ترێ و مێودا، نەدەشكاند

## 40

ئادەم گووتی: وەرە حەوا پەلە بكە، وەرە چاوت تێركە
سەیری ناو ئەو درەختانەی ڕۆژهەڵات بكە
خاوەنی ئەو وێنە درەوشاوەیە دەبینی، كە بۆ لای ئێمە هەنگاو دەنێ
وەك سپێدەیەكی تازە وایە، كە لە نیوەڕۆدا هەڵبێت!
لەوانەیە ڕاسپاردەیەكی گەورەی لە ئاسمانەوە بۆ ئێمە هێنابێ

---

١- نیكتار، شەرابی خواوەندەكانی ئولیمپ.

ڕەنگە ئەمڕۆکە بمێنێتەوەو ڕازی بێت بەوەی، ببێتە میوانی ئێمە
بۆیە بڕۆ بزانە چ هەیە لە ناندینەکەت، خۆشترینیان ئامادە بکە و بیڕازێنەوە
خواردنێکی باش بکە
شایانی ڕێزلێنانی میوانە ئاسمانییەکەمان(١) بێت، توانای ئەوەمان هەیە
هەرچییەك سەخاوەتمەندەکان
پێشکەشی ئێمەیان کردووە، ئێمەش پێشکەشیان بکەین
دەستمان والآ کەین بۆ ئەوانەی دەستیان والآ کرد
پیت و بەخششی سروشت یەکجار زۆرە
هەرچەند باری سووك بکەین، زیاتر شین دەبێ و زیاتر بەردەگرێ
کەواتە حیکمەتەکە ئەوەیە کە دەستی پێوە نەگرین و قرچۆکی
نەکەین

## 41

حەوا وەلآمی دایەوەو گووتی:
ئادەم ئەی کوڕی قووڕ و ئەی قاڵکی پیرۆزی زەوی
کە ئاسمان ڕاست و ڕەوانی کردووی و مشت سرووشی کردی
کەمێکمان پێویستە، چونکە خەزنە بە هەموو دەمێك بە سەر چڵەکانەوەیە
میوەکان پێدەگەن، لێکردنەوەشیان نزیك ئاسانە
تەنها ئەوانە نەبێت، کە دەبێ تۆزێکیان خەزن بکەین
تا تەڕاتیان نەمینێ، وشك دەبنەوە و بۆ خواردن خۆش دەبن
بەلآم پەلە دەکەم و دەچم باشترین میوە لە باشترین درەخت و
باشترین چڵ و ڕووەك و کاڵەك و شەمامەی شیلەدار، دەڕنم
بۆ میوانی فریشتەمانی دەهێنم

---

١- میوانی ئاسمانی، چیرۆکی رافائیل بەراورد بکە، بە چیرۆکی میوانی ئاسمانی ئیبراهیم و سارە، تەکوین ٨١ .

ئەوسا کە فریشتەکە ئەوە دەبینێ، بڕیاری ئەوە دەدات
کە خوا لە جەرگی ئاسمانەوە، چاکەی خۆی هەڵڕژاندۆتە سەر زەوی

## 42 .

ئەوەی گووت و لە ڕوخساریا دیار بوو کە بە پەلەیە
بەخێرایی سووڕایەوە، مەسەلەی ڕێز لێگرتنی میوانەکە،
مێشکی ئەوی بە خۆیەوە خەریك کردبوو
- ئەوەی کە هەڵیدەبژێرم، دەبێ لە هەمووان بەتامتر بێت
دەبێ بە ڕێك و پێکی بێ و تامەکان تێکەڵ بەیەك نەبن
چونکە ئەگەرپەیوەندییان لە گەڵ یەکدا
توندو تۆڵ نەبێت، ئەوە ڕەونەقییان نامینێت

## 43

پاشان دەبێت تام لەسەر تام بونیات بنرێت
بەشێوەیەکی وەها بە دوای یەکدا بێن، نزیك بێت لە ڕێبازی سروشت
ئەو بیرۆکانە، ئەوی بەخۆیانەوە خەریك کرد
میوەی هەرچییەك زەوی دایك، وەبەری هێنابوو
کە لە ڕەحمی خۆیدا، هەموو شتێکی هەڵگرتووە
لە چڵە ناسکەکانییەوەی ڕنینەوە

## 44

هەموو ئەو تەڕەو میوانەی ڕنییەوە کە هیند، لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژاواو نێوانیاندا
لە کەنارەکانی دەریای ڕەش و دەریای باکووری ئەفریقیا
یا لە دورگەی کینوس[1] وەبەری هێنابوون

١- کینۆس، ئەم دورگەیە ئۆدیسۆس زیارەتی کردووە، دورگەیەکە، وەک بەهەشتی سەرزەوی وایە ، هەمیشە بەهارە. ئۆدیسە -7:115

هەموو جۆرە میومیەك، كە پەلكیان جیاوازبوو، لە ڕووی نەرم و ڕەقیدا
هێندێكیان تووكن بوون و هێندێكیش سفت، هەمووی ڕنینەوە
- ڕێزلێنانێكی گەورە بوو-
بە دەستێكی پڕ لە سەخاوەتەوە، لەسەر مێزی خواردن داینان
ترێی كوشی و شەرابێكی پاكی لێ گرتەوە
پاشان شیلەیەكی شیرینی، لە ڕەنگی جۆرەها هەنجیر ئامادە كرد
ئینجا گوێزی شیرینی ورد كردوشیرێكی خۆشی لێ هەڵێنجا
باش باش تێكەڵی كردن

## 45

هەندێ كاسەی پاك و شایانی ئەوەشی هەبوو
گوڵ و عەتری گوڵی ئەو درەختانەی بێ بخوور بوون،
پەرش و بڵاو كردەوە بەسەر زەویدا
لەو كاتەدا گەورە پیاوی یەكەم خۆی ئامادە دەكرد
بۆ پێشوازی كردنی میوانە نوورانییەكەی
بۆ لای چوو، كەسی لە دوا نەبوو، پلەو پایی خۆی نەبێ
هەموو هەیبەتەكانی خۆی، لە خۆیدابوو
بە هەیبەت تر بوو لەوپاشایانەی
كۆمەڵێك ئەسپسواری دەرباری هیچ و پووچیان بەدوادا دەڕۆن
یا ئەو خەربەندانەی بە بۆیەی زێڕەوە
خەڵكی سەرسام دەكەن و دەمیان بەش دەبێتەوە

## 46

كە ئادەم لێی بە نزیك كەوتەوە
- لێی نەدەترسا بەڵكو وەكو ڕێزو گەورەیی -

سەری بۆ خودان کەیانی باڵا دانەواندو لار بۆوەو گووتی:
تۆ ئەی نیشتەجێی ئاسمان، خەیاڵم بۆ هیچ شوێنێکی تر ناچێ جگە لە ئاسمان
کە ئەم جۆرە وێنە درەوشاوەیەی لێ بژیت
لەبەر ئەوەی تۆ لە عەرشی سەرەوە هاتوویتە خوارەوە
بۆ ماوەیەك خۆشستانت جێهێشتووەو ئەو شوێنەت گەورە کردووە
بریا دەمایتەوەو زیارەتت دەکردین، ئێمە هەر ئەو دووەین لەو سێبەرستانە
خوا ئەو زەوییە فراوانەی بە ئێمە بەخشیوە
دەبا لەگەڵ ئێمەدا بحەسێیتەوە و تامی میوە خۆشەکانی بەهەشت بکەیت

## 47

لێرە بمینێوە تا گەرمای نیوەڕۆ دەڕواو نامینێ
لەوکاتەی کە خۆر، لە مەداری خۆی لار دەبێتەوەو گەرماییەکەی کز دەبێت
فریشتە مەزنەکە بە نەرمییەوە وەڵامی دایەوەوگووتی:
ئادەم من بۆ ئەوە هاتووم، تۆ بەم وێنەوە ئەفرێنراوی
هاتوویتە ئێرەوە کە هەم ماڵی تۆیەو هەم شوێنی نیشتەجێ بوونت
تا تیایا میوانەکانی خۆت داوەت کەیت، هەرچەند فریشتەش بن
کەواتە بمبەرە ناو کەپرە سێبەرینەکەتەوە

## 48

ئەو چەند سەعاتەی ناوەندێم لە پێشدایە، تا شەو دادێ
بۆم هەیە هەرچییەکم بوێ ئەنجامی بدەم
ئابەمجۆرە بەرەو مەنزڵگاکە ڕۆیشتن، کە لە ناوەندی دارستانەکە بوو

هەروەکو بومونا[1]، بە زینەتی گوڵەکان و بۆن و بەرامەی عەتر،گرژییەوە
بەڵام حەوا ڕووت بوو و بە هیچ شتێ نەڕازابۆوە
هەر بە زاتی خۆی گەشتر بوو، لە هەموو پەرییەکان
یاخود ئەوەی ئەفسانە باسی لێوە دەکات .
دەربارەی جوانترین ئەو سێ خوداوەندەی
کە بە ڕووت و قووتی ڕکابەری یەکتریان دەکرد، بەسەر چیای ئیدا[2] دا

## 49

حەوا خۆی ئامادەکرد، تا ڕێز لە لەو میوانە بگرێ، کە لە ئاسمانەوە هاتبوو
پێویستی بە پۆشاك نەبوو، چونکە پاکی و تەهارەت، پەردەبەندی ئەو بوون
ئەوەی بە دڵدا نەدەهات، کە کوڵمی بە شەرم بۆیە دەکات
دوای ئەوەی لەمێژبوو سلاوی لە مەریەم – حەوای دووەم – کردبوو
تا پیرۆزی بکات، سلاوی لە حەوا کردو گووتی :
سلاو ئەی دایکی بەشەرییەت، ئەی ئەو کەسەی کە بە ویلداشی بە پیت
جیهان پڕلە منالانی خۆت دەکەیت
کە ژمارەیان زۆرترە، لە ژمارەی میوەی درەختەکانی ئاسمان
ئەو میوەو تەڕانەی کە سفرەکەت پێ پڕکردۆتەوە

## 50

سەبەتەکە تژی سوندسی سەوزبوو، چەند تەختە گیایەکی بە دەورەوە بوو

---

١- بۆمۆنا، خواوەندی تەڕەو میوە لە لای یۆنانییەکاندا.

٢- چیای ئیدا، پاریس، ئەمیری تەروادی کە لە چیای ئیدا داوەری ئەو سێ خوداوەندە بوو – هیرا و ئەسیناو ئەفرودیت – ئەفرۆدیت ی هەڵبژارد ، کە فینۆسە لای ڕۆمانییەکان، و سێویکی زێڕی پێ بەخشی، بەو پێیەی لە هەمووان جوانتر بوو، پاشان شەڕی تەروادەی بەسەر داهات.

لەهەر چوارلا گەورەکەیەوە، لق و پۆپ و گەڵای پاییزی بوو
هەرچەندە لەوێ بەهارو پاییز، دەست لە ناو دەست(١) سەمایان دەکرد
بۆ ماوەیەکی کورت قسەیان لەگەڵ یەکتر کرد
ترسی ئەومیان نەبوو خواردنەکە سارد بێتەوە
پاشان باوەگەورەمان گووتی :
دە فەرموو ئەی ئەو غەریبەی لە ئاسمانەوە هاتووی
فەرموو ئەو خێراتە تامکە، ئەوەی نان و ئاومان دەدا
ئەو بە ئێمەی بەخشیوە، خێراتی ئەو لە ژمار نایەت

## 51

لە پێناوی خۆراك و خۆشیماندا، وای لە زەوی کردووە هەمیشە بەرهەمهێن بێت
لەوانەیە خۆراکێکی خۆش نەبێت بۆ کیانێکی گیانی
بەڵام من دەزانم خوای ئاسمان دەیبەخشێتە هەمووان
فریشتەکە وەڵامی دایەوە و گووتی:
مادامەکێ ئاسمان دەیبەخشێتە مرۆڤ- دەبا هەمیشە درووەی بۆ بنێرین —
ئەویش مەشخەڵە گیانێکە ، ئیدی سافترین گیانیش، بە خۆراکێکی خۆشی دەزانێ
سافترین کیانی زەینی پێویستی بە خۆراکە، وەك کیانی ئەقڵی تۆ
لە ناخی هەردووکیاندا، مەلەکاتی هەموو هەستەکان
پێیانەوە بۆن دەکەن و دەبینن، دەبیستن و ساو دەدەن، تام دەکەن
تێکەڵ دەکەن و هەرس دەکەن و تەمسیل(٢) دەکەن

١- دەست لە ناو دەست، مەبەستی ئەوەیە بڵێت کە بەرهەمەکان هەرگیز کۆتاییان نایەت.

٢- تەمثیل، لێرەدا مەبەستی پرۆسەی تەمسیلی خۆراکییە، میتابولیزم، کە سێ هەنگاوە، کۆکردنەوەی خواردن لە گەدەو گۆڕینی بۆ خوێن و پاشان دروست کردنی جەستە، دوایش گۆڕینی بۆ پێکهاتەی رۆحی و مژادی.

## 52

ئینجا جەستەیی دەگۆڕێ بۆ ناجەستەیی، یاخود مژادی بۆ ڕۆحی
دەبێ ئەوە بزانی، هیچ ئەفرێنراوێك نییە، پێویستی بە خۆراك نەبێت
بەمجۆرە وەك ڕەگەزگەلەکان، ئەوەی گرانە،،خۆراك بەسووکەکان دەدا
زەوی خۆراك بە دەریا دەدا، زەوی و دەریا خۆراك بە هەوا دەدەن
هەوا خۆراك بەئاگری ئەثیری دەدا،یەکەمین نزیکەکانیش مانگە
پاشان لە ڕوخساریا ئەو لەکەیە بەدیار دەکەوێ
ئەویش ئەگەر ساف نەبێتەوە لە هەڵمەکان
ئەوە دەگۆڕێت بۆ ئەو مژادەی کە لێی ئەفرێنراوە

## 53

مانگ بە هەناسەدانەوە خۆراك لە زەوییە شێدارەکەوە
بۆفەلەکە بەرزەکان سەردەخات، بەڵام خۆرەتاو، کە تیشکی خۆی
بۆ هەمووان دەنێرێ، لەباتی ئەمە لە وێنەی ئەو هەڵمەی بەرزدەبێتەوە
خۆراك لە هەمووان وەردەگرێ،کە شەو داددێ، لە ئۆکیانووس دەخواتەوە
هەرچەندە لە ئاسمان درەختی ژیان پڕ میوەیە
رەزی مێو شەراب بەرهەم دێنێ
هەموو بەیانیان ئاوونگی هەنگوین لە گەڵاکان هەڵدەڕژێ
زەوی دەبینی کە بە دڵۆپەی لوئلوء داپۆشراوە
ئیدی ئاسمان خێراتێکی جۆراوجۆری زۆرو خۆشییەکی تازەی داوەتە ئێرە
کە دەکرێ بەراوردی بکەی لە گەڵ ئاسماندا

## 54

بۆیە دەبێ وا زەن نەکەی کەمن زۆر هەستەنیم
ئابەمجۆرە دانیشتن و خواردنە بەتامەکەی خۆیان خوارد

فریشتەکە دیاری نەدەدا، چونکە تەمتوومانی بوو
کە ئەوە  سەرجەلەیەکی باوی لاهووتییەکانەو بەلام بە هۆکاری
 زۆری برسیەتی حەقیقی وگەرماتی هەرس و وەرچەرخانی جەوهەری بوو
تا بە ئاسانی لە ڕێگەی گیانەوە، بەشداری بکات

## 55

هیچ سەرسامییەك لە ئارادا نییە، چونکە ئاگری ڕەژووی بە دوکەڵ
ڕێ بە کیمیاگەر دەدات، یاخود ئەو دەڵێ ڕێم پێدەدات
کانزا بکات بە زێڕێکی پالاوتە، وەك ئەوەی کە لە هەناوی
کانەکاندا دێتە دەرەوە، لەو کاتەدا حەوا ڕووت و قووت
خواردنی بەسەر مێزەوە دادەنا، کوپەکانی لێوڕێژ دەکرد
لە شەرابی بە تام و شیرین، وای بۆ ئەم پاکییەی
کە هەر لە فیردەوس دەوەشێتەوە،  جا ئەگەرئەوە ڕاست بێ
ئەوە دیمەنی حەوا وای لە فریشتە دەکرد
کە عاشقی کچانی مرۆڤ بێت
بەلام ئەوەی لەسینەی فریشتەدا هەڵدەڕژا، خۆشەویستی حەزپەرستی نەبوو
غیرەش لەو جێیەدا مانای نەبوو، ئەوشتانە دۆزەخی عاشقی بێبەش بوون

## 56

بەمجۆرە دوای ئەوەی تێر خۆراك و شەراب بوون
بێئەوەی ببنە بارگرانی بە سەر سروشتەوە
لە ناکاو ئادەم بە بیری هاتەوە کە نابێ ئەو هەلەی گفت وگۆ گەورەکە
لە دەست بدات، بەبێ ئەوەی پرسیارێ بکات
لەبارەی پشتی ئەم جیهانەو کیانی نیشتەجێبووانی
کە دەیبینی بەشی ئەوان زۆر زیاترە لە بەشی ئەو

وێنە درەوشاوەکانیشیان نوورێکی پیرۆزە
توانای ئەوان لە سەرووی توانای مرۆڤدایە

## 57

ئینجا بە ئاگا لەخۆبوونەوە، دەستی بە قسەکانی خۆی کرد
بۆ فریشتەی ئاسمان و گووتی:
ئەی ئەو کەسەی لە گەڵ ئاسماندا دەژیت
من زۆرچاك دەزانم پایەی تۆ چییە، لەو ڕێزەی لە مرۆڤ دەگیرێت
بەوەی هاتوویتە ئەو ماڵە خاکەڕایە وئەو میوە زەوینیەت تام کردووە
کە خواردنی فریشتان نییەو لەگەڵ ئەوەش قبووڵت کرد کە بیخۆی
هەروەها بە ئارەزووێکی زۆرەوە و وابەدیار ناکەوێ
کە تۆ لە داوەتەکانی ئاسمانی سەرەوەدا تامت کردبێ؟ جیاوازی چییە؟

## 58

سەرکردەی باڵدار وەڵامی دایەوە :ئەی ئادەم، ئەو یەکە و
هەموو شتەکانیش، لەوەوە هەڵدەکاو بۆ ئەویش دەگەڕێتەوە
جا ئەگەر لە چاکە ڕووت نەبێتەوە، ئەوە هەمووان، لە جوانترین وێنەدان
مژادە سەرەتاییەکان بۆ هەمووان وەك یەکە
بە شێوەی جیاجیاو پلەی جۆراوجۆرن، لە مژادو ژیاندا
هەروەها لە شتە زیندووەکانیشدا بە دیاردەکەوێ
بەڵام هەرچەند نزیکتر بێت، لە شوێنی خۆی
یا مەیلی بۆ ئەو شوێنە زیاتر بێت
ئەوە زۆر ڕوونترو پالاوتەترو رۆحانی تر دەبێت

## 59

بۆ هەر یەکێك مەودای کارکردن دانراوەو تێپەڕی ناکات
تا ئەو کاتەی جەستە لە کاری خۆیا

لە سنوورێکی گونجاودیا خۆیدا، ئارەزووی ڕۆح دەکات
خۆی لەگەڵ هەموو جۆرێ دەگونجێنێ، بەمجۆرە
لە ڕەگەوە، قەدی سەوز شین دەبێ و لەویش گەڵای نزیکتر لەهەوا

## 60

دواجاریش گوڵی درەوشاوەی تەواو، کە هەناسە عەتراوییەکانی دەبەشێتەوە
میوەو گوڵەکان، خۆراکی مرۆڤ دەدەن، بەسەر پلەکانی پەیژەوە
بەرزدەبنەوە
تا دەبنە شیراوی ژیان و هەڵم و هەناسەی زەمین،
ئەوەیانە کە خەیاڵ و پێزانین و ژیان و هەستەکانمان پێ دەبەخشێ
لەوانەشەوەیە کە دەروون، هێزمەندەکانی ئەقڵ و ئاوەز وەردەگرێ
ئەقڵیش کیانی دەروونە، جا لوژیکی بێت یا هاتنە زەمین و زەمیناندن بێت
بەڵام ئەوەی لۆژیکیە زۆرجاران بۆ ئێوەیە، بەڵام زەمیناندن بۆ ئێمەیە

## 61

ئەوانەش بە پلە لەیەك جیاوازن و بەس، بەڵام لە هەمان جۆرن
کەواتە سەرسام مەبە، لەوەی، کە ئاسمان وای دەبینێ باشە بۆئێوە
ئەوە منیش رەتی ناکەمەوە
لای من و تۆ دەبێتەوە هەمان ئەو مژادەی، لێی ئەفرێنراوین
لەوانەیە مرۆڤ لە هەندێ کاتدا، بەشداری خۆراکی فریشتەیان کردبێ
وای نەبینیوە کە خۆش نەبێت، یا سووکتر بێت لەوەی کە دەبێ وابێ
لەوانەیە جەستەکانتان بەو خۆراکە مژادییانە بتوانێ
دواجار وەرچەرخێتە سەر رۆحە پاڵاوتەکانەوە

## 62

به ڕۆیشتنی زەمانە ئەوە ساف دەبێتەوە
ئێوە دەتوانن وەکو ئێمە، وەك ئەثیر باڵ بگرن و بەرزببنەوە
یاخود ئێرە، بۆ نیشتەجێبوون هەڵدەبژێرن[1]، یا فیردەوسی ئاسمانی
یا هەر فیردەوسێکی دیکە
تا ئەوکاتەی ئێوە گوێڕایەڵ بن و نەگۆڕو تەواوبن
لە خۆشەویستی خۆتانو بۆ ئەوکەسەی ئێوەی هێناوەتە بوون
بەڵام ئێستا، خۆشی لەبەختەوەری وەرگرن
کە جێی دەبێتەوە لەو خۆشستانە
ئێرە لەبەختەوەری زیاتر جێی هیچی لێ نابێتەوە

## 63

باوکی ڕەچەڵەکی مرۆڤایەتی وەڵامی دایەوەو گووتی:
ئەی ڕۆحی مەزن، ئەی میوانی ڕەگەزی مرۆڤایەتی
دواجار فێری ئەو ڕێگەیەت کردین،کە دەمانگەیەنێتە زانینی خۆمان
چەند جوان باسی پەیژەکانی سروشتت بۆ کردین
کە لە چەقی بازنەوە، درێژ دەبێتەوە تا ئۆکیانووس
هیوامان وایە بە ڕامانی خۆمان بۆ ئەفرێنراوەکان
پلە پلە بەرز بینەوە بۆ ئاسمان

## 64

بەڵام پێم بڵێ:
مەبەستت چی بوو لەو بێدارکردنەوەیەی کە گووتت:
ئەگەر گوێڕایەڵ بن؟

١- بۆ نیشتەجێ بوون هەڵدەبژێرێ، نازانرێ کە ئایا قسە لەگەڵ مرۆڤەکاندا دەکات، یا لە گەڵ ئادەم؟ یاخود قسە بۆ ئادەم و حەوا دەکات، بۆ دوو کەس، بە شێوەی کۆ نووسراوە، چونکە بۆ قسەکردن لە گەڵ هەمووان دەبێ و بۆ دوو کەسیش دەبێ.

ئایا دەبێ کە گوێڕایەڵ نەبین و خۆشەویستی ئاسمان جێهێڵین؟
کە ئەو ئێمەی لە خۆڵ دروست کردووە،
ئێمەی بۆ ئێرە هێناوەتە خوارەوە
کیانی ئێمەی پڕ ئەوپەڕی خۆشی کردووە
ئەو خۆشییەی کە خولیای مرۆڤە
فریشتەکە وەڵامی دایەوەو گووتی:
ئەی کوڕی زەوی و ئاسمان، گوێ قووڵاغ کە
تۆبۆ ئەو خۆشیانەت قەرداری خوای

## 65

بەڵام بەردەوام بوونی ئەو خۆشییە، بەتۆوە بەندە وبەردەوامبە لە سەریا
ئەوە ئاگادارکردنەوەی منە بۆ تۆ، بیکە بە سەر مەشقی خۆت
ئاسمان تۆی بە تەواوی دروست کردووە، بەم نەك وەك نەگۆڕێ
تۆی وەك پیاوچاکێ دروست کردووە، بۆ پاراستنی ئاشتی
بەڵام توانای بەردەوامبوونتی، بۆ خۆت بە جێهێشتووە
وای بڕاندۆتەوە کە ویستی تۆ، بە سروشتی خۆی ئازاد بێت
نە قەدەردەتوانێ بە سەریا زاڵ بێت، نە ناچاری دەتوانێ فەرمانی پێبکات
داوامان لێدەکات بەویستی خۆمان، دروودی بۆ بنێرین، ناچارکراو نین
دروودی ناچارکراوان قبووڵ ناکرێت و مەحاڵە قبووڵ بکرێت
دڵەکان تووشی بەڵا دەبن ئەگەر ئازاد نەبن؟

## 66

ئایا چۆن دەزاندرێ کە پەرستکار، پەرستنی دەوێ یا نا؟
ئەوەی کە ناچارە، قەدەرهەرچییەکی بەسەردا فەرزبکات، هەرئەوەی دەوێ
لەو زیاتر ناتوانێ سەرپشك بێت، بەڵام من و هەموو فریشتەکانی تر

لەبەرچاوی ئاسمانی سەر بە تاج دەوەستین
چێژ لە خۆشییەکانمان وەردەگرین
وەك چۆن ئێوەچێژ لە خۆشییەکانتان وەردەگرن
تا ئەو کاتەی گوێڕایەڵی ئاسمان بین، ئەوە تاکە دەستەبەری ئێمەیە

## 67

ئێمە ئازادین لە پەرستنی، واتە ئێمە خاوەن ویستی خۆمانین
بۆ ئەوەی خۆشمان بوێ، یا خۆشمان نەوێ
کەوتن و بەردەوام بوونمان، بەندە بەوە
هەندێك کەوتن و دارمان، بە هۆی هەڵگەڕانەوەیان کەوتن
ئینجا لە ئاسمانەوە کەوتنە خوارەوە بۆ ناو کارِ کارەی دۆزەخ
وای بۆ ئەو کەوتنە، لە لووتکەی بەختەوەرییەوە، بۆ ناوخەرەندی سزا

## 68

باوە گەورەمان پێی گووت: باش گوێم لە قسەکانت گرت
گوێم پڕ لە چێژ بوو، ئەی مامۆستای پیرۆز
چێژێکی وات پێبەخشیم، لە سەرووی گۆرانییەکانی شارۆبیم بوو
ئەو گۆرانیانەی شەوانە دەیچڕن وموزیکی کاریگەری خۆیان
بۆ ئەو گردۆلکانەی دەورووبەرەوە دێنن

## 69

دەمزانی لە ویست و کاری خۆمدا، ئازاد خوڵقێنراوم
تا ئەو کاتەی کە ئێمە، خۆشەویستی ئەو لە بیر ناکەین
ئێمە هەرگیز خۆشەویستی و پەرستنی ئەفرێنەر فەرامۆش ناکەین
ئێمەی بە تەنها، لە یەك شتدا، قەدەغە کردووە، ئەوەیە دادپەروەری
کە بیری چەسپاوم ساغی کردۆتەوەو ساغیشی دەکاتەوە

## 70

بەڵام ئەوەی کە باست کرد، کە لە ئاسمان ڕوویداوە
گومان لە دەروونمدا دەوروژێنێ و ئارەزووی گوێ گرتنم
لە تەواوی ئەم چیرۆکە زیاتر دەکات
دەبێ ئەوە چیرۆکێکی غەریب بێت و شایانی ئەوەیە بە کپی گوێی لێ بگرم
- ئەگەر ئێوە ڕازی بن –
هێشتا ڕۆژ زۆری وەبەرماوە وخۆرەتاو نیوەی سووڕی خۆی تەواو نەکردووە
نیوەکەی تریش لە گومەزی ئاسمانی فراواندا دەستی پێکردووە
ئابەمجۆرە ئادەم لە پرسیاری خۆی بۆوە

## 71

دوای کەمێك بێدەنگی ڕۆفائیل وەڵامی دایەوە و گووتی:
وای چەند بەرزە ئەوەی داوای دەکەی، ئەی سەرەتای مرۆڤ
چاوی مرۆڤەکان. هەستەکانی خۆیان نابینێت
کە چ جەنگێ هەیە لە ناو ڕۆحەکاندا؟
چۆن چیرۆکی کەوتنی ئەو هەموو خەڵکە بگێڕمەوە
ئەو خەڵکانەی، کە بە کەمال و تیشکەوە، دەدرەوشانەوە
هەتا ئەو کاتەی لەسەر پەیمانی خۆیان بوون، مابوون
بە بێ ئەوەی بەزەیم نەیەتەوە؟
دوا جار چۆن نهێنی جیهانەکەی تر بگێڕمەوە؟

## 72

لەوانەیە یاسا ڕێ نەدات بیگێڕمەوە
بەڵام ئەو سوودەی کە تۆ لێی وەردەگری، گێڕانەوەکە هەنجەت کوژ دەکات

ئەوەی کە هەستەکان دەرکی پێناکەن، من بۆتۆی وێنا دەکەم
لە ڕێگەی  لێکچوواندنی وێنە ڕۆحییەکان، بە وێنەی جەستەییەکانەوە
کە بە باشترین شێوە گوزارەی لێدەکات
ئایا زەوی تەنها سێبەری ئاسمانە، ئایا لێرەو لەوێو زۆرتر وەك یەکە؟
وەك چۆن خەڵکی سەرزەوی بۆی دەچن؟

## 73

ئەوەیان بەر لە بوونی جیهان بوو، کە کوێری[1] وێرانکەر باڵادەست بوو
لەو شوێنانەی کە ئاسمانی لێ دەسووڕایەوە و
زەوی بەسەر چەقی خۆیا، بە شێوەیەکی هاوسەنگ وەستابوو، لەوان ڕۆژەدا
( زەمەنیش لە سەرمەدیەتی خۆیا، پیادەی بزاوتن دەکات و هەموو شتەکان
لە سنووری ئێستاو ڕابردوو و ئایندەدا دەپێوێ) لەوان ڕۆژاندا
لەو کاتەی کە ساڵی گەورە[2] تەواو دەبێت)
پاشا ئەمری کرد و بانگی هەموو ئاپۆڕەی فریشتەکانی ئاسمانی کرد
هەموویان یەکسەر، کە لە ژمار نەدەهاتن، هاتنە بەردەمی عەرشی ئاسمان
لە هەموو لایەکی ئاسمانەوە هاتبوون
بەخۆیان و چین چینی نوورانیان، سەفیان بەست
سەرکردەکانیان ڕابەرایەتی دەکردنچەسپاوەکانی ئاسمان ئەنجامی دەدەن،
کە ئەفلاتون بە ٣٩ سەدەی تەقدیر کردووە، بەڵام ئێستاکە بە ٣٦ هەزار
ساڵ تەقدیر کراوە.

## 74

دە هەزار بەیداخی بریقەداریان بەرزکردبۆوە
لە پێشەوەو لە دواوەدا، لەناو هەوادا دەشەکایەوە

١- کوێریی، واتە کاوسس یاخود فەوزا، کاوس کەسێتییەکی میتۆلۆژی بوو.

٢- ساڵی گەورە بەو دەورەیە پێوانە دەکرێ، کە ئەستێرە

تا پلەو پایەو چینی هەریەکێکیان بناسرێتەوە
تەونی بریقەداری هەندێکیان، تژی نەخشی بریقەدار بوو
هەروەها پڕ لە یادەوەری پیرۆزی، کارە مەزنەکانی ئەڤین و حەماس بوو
ئەو نەخش و نیگارانە، بە شاشی تۆمارکرابوون و نەخشێنرابوون
ئابەمجۆرە لە فەلەکی چێوە پان و پۆڕی خۆیاندا وەستا بوون
فەلەك لە ناو فەلەکدا بوو، ئینجا دەنگی باوکی سەرمەدی ئاسمان هات
- تاقانەش لە باوەشی خۆشستاندا، لە ناوەندی ئاسماندا دانیشتبوو —

## 75

وەك ئەوەی لە لوتکەی چیایەکی داگیرساو[1] بێت و
لوتکە درەوشاوەکە هێندە گەش بوو، وایکرد کە نەبینرێت
گووتی : ئەی فریشتەکان، ئەی کوڕانی ڕووناهی، گوێ بگرن
ئەی خاوەن عەرشەکان، ئەی دەسەلاَتدارەکان
ئەی خاوەن باشی و ئیمارات و سەرکردایەتی
گوێ بگرن لە بڕیاری من، کە هەرگیزهەڵوەشانەوەی بۆ نییە
ئەمڕۆ کەسێك هاتۆتە جیهان ، کە تاقانەی منە
لەسەر ئەو گردە پیرۆزەدا[2] پیرۆزم کردووە

## 76

ئێستا لە لای چەپی منەوە دەیبینن و من دەیکەم بە سەرۆکی ئێوە
سوێندم بە خۆم خواردووە بۆ ئەو، کە هەمووان لە ئاسماندا

١- لوتکەی داگیرساو، چیای سینامان بەبیر دەهێنێتەوە، کاتێ موسا ڕاستەوخۆ شەریعەتی لە خوا وەرگرت.

٢- پیرۆزکردن، چەورکردن بە زەیت، کە نەرتێکی باوی سەردەمی کۆنە.

سەری بۆ دانەوێنن،  دان بەوە دابنێن، کە گەورەی ئەوانە
بۆیە بە یەکگرتوویی گوێڕایەڵی فەرمانی ئەو بن
وەك جێگری فەرمانڕەوای مەزن، وەك هەناسەی یەك کەس
هەرگیز بەش بەش نەبێ، لە پێناوی بەختەوەریدا
نەك هەر ئەمە، بەڵکو بۆ ئەبەد پیرۆزبایی لێدەکرێ
ئەوەی لێی هەڵگەڕێتەوە، ئەوە لە من هەڵدەگەڕێتەوە
هەر لە هەمان ڕۆژدا، لە ڕیزی ئاسماندا قێزمون دەکرێت و
لە دیدی پیرۆزی ئەوەوە دوور دەخرێتەوە
دەکەوێتە ناو زوڵمەت و قووڵایی قووتی دەدا
تاهەتایە، دەبێتە گۆڕەکەی

## 77

ئەوە ئەو قسانە بوو، کە لەدەمی ئاسمان هاتە دەر
هەمووان شادبوون، بەڵێ شاد بوون، بەڵام هەموویان نا
پاشان ئەو ڕۆژەیان، وەکوو هەموو ڕۆژەکانی تر بەسەر برد
وەکو هەموو جەژنەکانی تریان
گۆرانیان دەگووت و بەدەوری گردەکەوە سەمایان دەکرد
سەمای پەرستن ولار بوونەوەو درووود
وەك سەمای ژێر خولگەی ئەستێرەیی ئەستێرەکان

## 78

ئەڵقەکانیان هەنێکیان ئاڵۆزو ناچەق بوو و هەندێکیان پچڕ پچڕ بوو
بەڵام هەرچەند نارێك بوون، لە هەموو شتەکان ڕێك و پێك تر بوون
جووڵەو بزاوتیان، موزیکێکی گونجاوی پیرۆزییان هەبوو
ئاوازە سیحراوەکانیان وەها هەڵدەڕژا، کە هەتا ئاسمانیش

به شادییەوە گوێی ڕادێرا بوو
ئەوسا ئێوارە نزیك بۆوە - ئێوارەو سپێدەمان هەیە -
ئەوانە بە دوای یەکدادێن، بۆ چێژ نەك بۆ زروورەت

## 79

هەر هەموویان یەکسەر لەسەماوە، چوون بۆ خواردنی خۆش
بە تاسووقەوە کەوتنە سەر خواردنەکەوە
بە بازنەیی وەستان و لەناکاو ئەو ناوە، پڕ بوو لە خۆراکی فریشتەکان
یاقووتی شەراب هەڵڕژاو لوئلوئو ماس و زێڕی پاڵاوتە درەوشایەوە
هەروەها کوشراوی بەتامی ڕووەکی ئاسمان
کەوتنە سەر گوڵان و سەریان بە تاجە گوڵ دەگەشایەوە
خواردیان و خواردیانەوە و بە نەرم و هێمنی بەردەوام بوون
شەرابی جاویدانی خۆشییان هەڵقوڕاند

## 80

دوورکەوتنەوە لە زۆرخۆری، پێوانەی تەواو زوێدەڕۆیی قەدەغە دەکات
لەبەردەم پاشای گەورەی دەستکراوەدا،کە بە سەخاوەت بەسەریانی باراندبوو
شەوی عەتراوی کۆتایی هات لە چیای ئاسمانی بەرزدا
کە نوورو سێبەری لێهەڵدەسا
ڕوخساری ئاسمانی گەش گۆڕا و تاریکیەکی جوانی گرتە خۆ
چونکە لێرە شەو بە چارشێوێکی ڕەشترەوە دانابەزێ
ئاوونگی گوڵین، خەوی بۆ هەموو چاوێك پێبوو
تەنها چاوی ئاسمان نەبێ، کە خافڵ نابێت

## 81

فریشتەکان لەدەوروبەری دەشتاییە فراوانەکەدا بڵاو بوونەوە
کە فراوانتر بوو لەو زەوییە بازنەییەدا .
(ئابەمجۆرەیە دەرباری ئاسمان)
پاشان ئاپۆرەکەیان وەك چەند تیپێك و چەند پۆلێك پەرش و بڵاو بوونەوە و
لە کەناری ڕووبارە زیندووەکان و درەختەکانی ژیان خێمەیان هەڵدا
ئەو خێمانە لە ژمارە نەدەهاتن، لە ناکاو چەتری ئاسمانی(١) بەدیارکەوت
هەموویان لە ژێر شنەبای ساردا، چوونە خەوێکی قووڵەوە
ئەوانە نەبێ کە بە دەوری عەرش پاشادا، ئێشکگر بوون و
نۆبەتکاریی شەوانەیان دەکردو سروودیان دەچڕی ودروودیان بۆ دەنارد

## 82

بەڵام هەرماس(٢) تا درەنگان نەمایەوە
چونکە ئیدی ناوە کۆنەکەی(٣) لە ئاسمان نەدەبیسترا
گەورەترین فریشتەی ئاسمان بوو، ئەگەر فریشتەی یەکەم نەبووبێ
دەسەڵاتێکی یەکجار گەورەو بەشکەلێکی زۆر زۆری هەبوو
بەڵام حەسوودی بە تاقانەی ئاسمان لە خۆدابار کردبوو
چونکە ئاسمانی مەزن ڕێزی لێنابوو

---

١- چەتری ئاسمانی، ملتون ئەم وشەیەی بە مانا ی خێمەی یەهودییەکان بە کارهێناوە، ئێمە وشەی چەترمان بەکار هێناوە.

٢- هەرماس واتە ئەهریمەن، ئەم وشەیە لەهەندێ شوێنی کوردستان بە کار دێت.

٣- ناوە کونەکە، ملتون باسی ئەوە دەکات، کە فریشتەکانی پێشوو، ئەوانەی داڕمان، لە کتێبی یەکەمدا و ئەوانەی دواییش، هەرخۆیان خوداوەندی وەسەنی بوون، کە بەر لە هاتنی ئایینە ئاسمانییەکان دەپەرستران.

شەرمەفمەندی کردبوو بەوەی کە ڕایگەیاند ، میسایە(١)
واتە ئەو پاشایەی کە پیرۆز کراوە

## 83

ئەهریمەن نەیتوانی بەرگەی ئەو دیمەنە بگرێت، وایزانی غەدریان لێکردووە
بۆیە هەموو گیانی پڕ بوو لەچەپەڵی و ڕق و قین
کە نیوەشەو داهات و کەوتە زوڵمەت، ئەو کاتە خۆشترین کاتی خەو و کپییە
بڕیاری دا لە گەڵ تیپی خۆی بڕوات و
بە قێزەوەنەوە وازی لە پەرستن هێنا، لە عەرشی مەزندا، هەڵگەڕایەوە
ئەوەی کەسەی بە ئاگا هێنا، کە لە دوای ئەوەوە(٢) دەهات
دەستی کرد بە قسە لە گەڵیاو گووتی :
ئەوە دەخەوی هاوڕێی نزیکم؟ ئەوە چ خەوێکە گلێنەت دادەخات ؟
نەتزانیوە دوێشەو چ بڕیارێك دراوە، لەسەر زمانی گەورەی ئاسمان؟

## 84

من ڕاهاتووم بەوەی کە تۆ، هەمیشە بیروڕای خۆت، بۆمن ڕوون دەکەیتەوە
تۆش بەوە ڕاهاتووی کە من، بیروڕای خۆم بۆتۆ ڕوون کەمەوە
لە ئاگاهی دا یەکمان گرتووە، چۆن ئێستاکە خەوتنت لێکمان دەکاتەوە؟
تۆ ئەو یاسا تازانە دەبینی، کە فەرز کراوەتە سەرمان

## 85

١- میسیا واتە ئەوەی بەزەیت چەور کراوە ، مەمسوح

٢- کە لەدوایەوە دەهات، مەبەستی ئەو کەسەیە، کە لە ڕووی پایەوە لە دوای هەرماسەوە دەهات، ناوی بوعلز بووب بوو.

هەر یاسایەکی تازە، کە دادومر فەرزی دەکات
بیرورِایەکی تازە بۆ ئێمەی بنکردە دموروژێنێ
پێویستی بە بیرورِا گۆرِینەوەی تازە هەیە
بۆیە دمبێ سەیری ئەنجامە نادیارەکەی بکەین
بەڵام ناکرێ لەم شوێنەدا هەموو شتێ بدرکێنم
هەستە دەی، ئەو هەزارن هەزارکەسەی
رِابەرایەتییان دەکەی کۆیانکەرەوە

## 86

هەواڵیان پێ بدە کە فەرمانمان پێکراوە
- بەر لەوەی شەوی رِەشهەڵگەرِاو، سێبەرەکانی هەوری خۆی گلداتەوە -
من و هەموو ئەوانەی لە ژێر سەرکردایەتی مندا، بەیداخی خۆیان بەرز دەکەنەوە
لێرە برِۆین و بچینە بارەگای خۆمان
بەخێرایی بگەرِێینەوە بۆ چیمەنی[1] خۆمان لە باکوور

## 87

ئاهەنگێکی هەیبەتمەند ساز دەکەین وتیایا پێشوازی لە پاشامان دەکەین
کە مەسیحی بەرزو مەزنەو فەرمانە تازەکانی لێومردەگرین
چونکە تەمای وایە بە خێرایی، بەناو هەموو چینیەکانی فریشتەکاندا تێپەرِێ
تێپەرِینێکی سەرکەوتووانە، تا یاسای خۆی دارِێژێ
فریشتەی گەورە، لە قسە درۆئامێزەکانی خۆی بۆوە

---

١- چیمەنی باکوور، ملتون وای ئەنجامگەری کردووە، کە ئەهریمەن لە باکوور دادەنیشێ ، ئەشعیا: ٣١:٢١-٤١

## 88

ئەهریمەن کاریگەرییەکی خراپی کردە سەر
سینەی دوور لە نیگەرانی هاورێکەی
پاشان هەستا بە کۆکردنەوەی هەندێ لەو خەلیفانەی
کە جێگرایەتی ئەو دەکەن، لە سەرۆکایەتیدا
بە جیا یەك یەك قسەی لە گەڵ ئەوانیتر کرد و هەواڵەکەی پێدان
ئەویش ئەوە بوو کە سەرۆك، بەر لە بە سەرچوونی شەو
بەلایاندا ڕەت دەبێ

## 89

نە هەر ئێستا، بەر لەوەی شەوی تاری، قورسایی خۆی لە ئاسمان هەڵگرێ
دەبێ بەیداخی پاشایەتی  دەست بە جووڵە بکات
هۆی ئەمەشی پێگووتن، بەڵام لە کاتی قسەکردنیدا
وشەی نادیاری وای دەخستە ناوییەوە،  گومان وروژێن بوو
جا یا بۆ تاقی کردنەوەی لایەنگیرەکان بوو، یا بۆ ئەوەی کاریان لێبکات
بەڵام هەر هەموویان، گوێڕایەڵی دەنگی مەزن و
هێما ناسراوەکەی ڕابەری گەورەیان بوون

## 90

ناوەکەی زۆر گەورە بوو، پلەکەشی یەکجار گەورە بوو لە ئاسمان
وەك ئەستێرەی بەیان[1]،هەموویانی بەرەو رۆژهەلات کێشایەوە
کە گەلەی ئەستێران ڕابەرایەتی دەکردن
بەدرۆو دەڵەسەکانی، توانی سێبەشی ئاپۆرەی ئاسمان
بە دوای خۆیا پەڵکێش بکات

---

١- ئەستێرەی بەیان ناوی ئەهریمەنە، کە پێشتر خۆی ئەستێرەی بەیان بوو.

## 91

سەرمەدیی مەزنو کە چاوەکانی دەرك بە بیرۆکە ڕووتەکان و نییەتی ناو دڵ دەکات
بەسەر چیای پیرۆزەوە، هەروەها لە ڕێگای ئەو چرا زیێڕینانەوە
کە هەموو شەوێ لە بەرامبەری ئەون
بەبێ ئەو ڕووناکییەش بینی، هەڵگەڕانەوە زۆر بووە، هەڵگەڕاوەکانی بینی
چۆن لە میانی کوڕەکانی سپێدەدا و پەرش و بلاو بوونەتەوە

## 92

هەروەها ئەو جەماوەرە فراوانەی بینی، کە لە دژی یاسای بەرزی ئەو بوون
ئاوڕی لە تاقانەی خۆی دایەوەو بە بزمیەکەوە[1] پێی گووت:
کوڕی خۆم، ئەی ئەو کەسەی کە مەزنی خۆم لە تۆدا دەبینم
کە درەوشاو دەدرەوشێتەوە، ئەی میراتگری[2] هێزو توانام
وادەی سەلماندن نزیك بۆتەوەو من دەستم بەسەر هەموو شتێکا دەشکێ،
دەبێ هێزی چەکەکانمان بچەسپێنین
وامان بڕیارە، مولکی ئەزەلی خۆمان و خوداوەندێتی ئەزەلی خۆمان بپارێزین،
چونکە دوژمنێکمان لێ هەڵگەڕاوەتەوە
دەیەوێ کورسی خۆی، لە هەرێمەکانی باکووری فراواندا دابمەزرێنێ
تا وەك ئێمەی لێبێت، هەرئەوەندەش نا بیر لەوە دەکاتەوە
بە شەڕێك تاقیمان بکاتەوە، هێزی هەق و دەسەڵاتمان تاقی بکاتەوە

---

١- بەبزەیەکەوە... لێرەدا جۆرەسوخرییەتێک بە هێزی دوژمن دەکات، کە وادەزانێ سەردەکەوێ.

٢- ئەی میراتگری هێزو توانام، نامەیەک بۆ عیبرانییەکان ٢\١١ – تاقانەی کرد بە میراتگری هەموو شتێ.

## 93

با هەواڵ بدەین فریشتەکان ئاگادار بکەینەوە
با بێدار بین و بەخێرایی بەو هەندە هێزەی کە ماومانە
هەموویان تەیار بکەین بۆ بەرگری کردن، ئەگینا لە ناکاو ئەو شوێنە بەرزەمان
لە دەست دەچێ، کە پەناگەو بانی ئێمەیە
تاقانە بە ڕووالەتی قودسی و کپ و درەوشاوەو ڕوون و ڕەوانی
کە هەرگیز وەسف ناکرێت و لەسەرخۆ وەڵامی دایەوە
گووتی: ئەی باوکی مەزن تۆ بەهەق[1]، تیز بە دوژمنانت دەکەی
بە نەخشەو پیلان و هاشووهووشی بەتاڵیان، پێدەکەنی
من شادیم بەخۆ دێ و بەرزدەبمەوە، کە ئەوانە دەمبوغزێنن
کاتێ دەبینن کە سوڵتانی گەورە ئەوەی بەخشیوە بە من
کە لمووزی بڵندیان بشکێنم، هێندەی تربەخۆم دەنازم

## 94

کاتێ کە بە ئەنجامی شەڕەکە دەکەون، ئەوسا دەزانن
ئاخۆ من توانای ئەومم هەیە
دەبێ هەموو ئەوانەی لە تۆ هەڵگەڕاونەتەوە، بیانخەمە ژێر بار
یاخود من خراترینی ئاسمانم ! و تاقانە بێدەنگ بوو
لە کاتێکا ئەهریمەن وهێزەکەی، بە کۆمەڵ وخێرا دوورهەڵفڕی بوون
ئاپۆرەکەیان وەکو ئەستێرەی شەو، لە ژمارە نەدەهات
یاخود وەك ئەستێرەی بەیانییان، یا دڵۆپەکانی ئاوونگ
کە خۆرەتاو دەیکاتە لوئلوء، بەسەر پەڕەی هەموو گوڵەکانەوە

---

١- تو بەهەق، لە مەزمووری٤\١٢ دا هاتووە - ئەوەی لە ئاسمان دادەنیشی، بەوان پێدەکەنی، خوا تیز بەوان دەکات.

به زۆر شوێنی دوورو فراواندا تێپەڕین، ئەو فریشتە بەهێزو تواناکانەی
سارۆفیم وسەرکردە خودان عەرشەکان، هەموویان ڕۆیشتن

## 95

لە سێ چیندا بە ناو ئەو هەرێمانەدا دەڕۆیشتن ومەملەکەتی تۆ ئەی ئادەم
لەبەردەمیانا بچووك دەبۆوە، وەك ئەو بەهەشتە وابوو
ئەگەر بەراورد بە زەوی بکرێت
جا ئەگەر دەریا واز لە وێنەی خڕی خۆی بهێنێ
ئەوە دەبێتە ڕووبەرێکی پان و درێژ
دوای ئەوەی ئەوانەیان، لە پشتی خۆیانەوە بە جێهێشت
باری خۆیان لە هەرێمی باکوور لێخست

## 96

ئەهریمەن بەسەر عەرشی مەلەکی دانیشت
دەدرەوشایەوە وەك چیا لە سەر چیا بێ وابوو
ئەهرام و بورجەکان دەوریان دابوو
کە لە بەردی ئەڵماس و بەردی زێڕین، لێکرابۆونەوە
ئەوێهێ تەلاری لوسیفەری مەزنە
( ئێمە ناومان لەو تەلارە ناوە، لەزمانی بەشەر وەرمانگرتووە)
بەڵام ئیبلیس هەندەی پێ نەچوو، پاش کەمێك
تەماحی ئەوەی کرد، کە لە گەڵ خودادا وەك یەك بن
لاسایی ئەوەی سەر چیای پیرۆزی کردەوە
کە مەسیحی بەسەرەوە - لەبەرچاوی ئاسماندا- مەسح کرا
ناویان لەو چیایە نا – کۆمبوونگا[1] –

١- کۆمبۆنگا، شوێنی کۆبوونەوەو خڕ بوونەوەی جەماوەرە.

## 97

چونکە هەموو لایەنگرانی لەوێ کۆدەبوونەوە
واخۆی نواند، کەوا فەرمانی داوە، پرسیان پێبکات
سەبارەت بە پێشوازی کردن لە پاشای گەورمیان، کە دێتە لایان
ئەهریمەن بە هونەری دەڵەسەو درۆکاری گۆێی پڕ کردن و گووتی: ئەی
خاوەن عەرش و دەسەڵات و خودان ئیمارات سەرۆکایەتیەکان
ئەوە ئەگەر ئەو ناو نانە بمێننەوەو نەبێتە تەنها چەند لەقەبێك
بەڵێ فەرمانەکە دەرچووە، کە باڵادەست بێت بەسەرتانەوە
هەموو دەسەڵاتێك بگرێتە دەست، هەموو رووناکییەکییەکانمان
بەوەی کە ناوی مەسیحی پاشای وەرگرتووە، شاردرایەوە
ئێمەش لە نیوەشەودا بە خێرایی هەڵفرین وبەڕاکردن هاتووینەتە ئێرەوە تا
کۆببینەوە. بیروڕا بگۆڕینەوەو بە شێوەیەکی مەزن ڕێزی لێبنێین
هاتووە تا سەرانەی گوناهو ئەو سەردانەواندنە وەرگرێ کە نەدراوە
یەك بۆ ئێمە زۆر بوو، ئەی چۆن بەرگەی دووانی بگرین؟
بەرگەی باوك و وێنەی ئەو[1]؟ کە هەر ئێستا ڕاگەیەنرا

## 98

بەڵام لەوانەیە بە بیروڕاگۆڕینەوە و ئامۆژگاری، خۆمان بگرینەوە
بتوانین خۆمان ڕزگار بکەین لەم کۆتە؟
ئایا گەردنی خۆتان دەدەنە دەست ئەو؟
یاخود پێتان باشە، بە ئاسانی بچەمێنەوە؟
ئێوە کاری واناکەن، ئەگەر بەڕاستی ئێوەم ناسیبێ
یاخود ئەگەر بزانن ئێوە، خەڵکی ئاسمانن و کوڕی ئاسمانن
هیچ کەسێك پێشتر ئێوەی کۆیلە نەکردووە

١- وێنەی ئەو، مەبەستی مەسیحی تاقانەی ئاسمانە.

خۆ ئەگەر یەکسانیش نەبن لە پلەدا
بەڵام ئێوە ئازادن و وەك یەکن لە ئازادی
چین و پلەکان هاودژ نین، لە گەڵ ئازادی، بەڵکو پشتی ئازادی دەگرن
ئەوە کێیە کە مافی پاشایەتی، لەسەر ئەو کەسانە فەرز دەکات
کە یەکسانن لە گەڵ ئەودا؟

## 99

ئەگەر لە ڕووی دەسەڵات و باشی کەمترن لەو، ئەوە لە ئازادی وەك یەکن
کێ دەتوانی بڕیارو یاساکانمان بەسەردا بسەپێنێ؟
کە ئێمە بە بێ یاساش هەرگیز هەڵە ناکەین
بەوە ش دەبێتە گەورە بەسەرمانەوە و پەرستنمان بەسەردادەسەپێنێ
لە نرخی نازناوی مەلەکی ئێمە کەمدەکاتەوە
ئێمە وامان بۆ نووسراوە حوکم بکەین، نەك خزمەت تا هەڵە نەکەین[1]

## 100

ئابەمجۆرە ئەهریمەن گوتاری جەسووری خۆی داو، گوێشی بۆ ڕاگیرا
بەڵام لە ناو سارۆفیمەکاندا – ئەبدئیل – هەڵسایەوە
کەس لەو دڵسۆزتر نەبوو، لە پەرستنی ئاسمان و فەرمانی پیرۆزدا
ڤیت بۆومو بە تاووتینێکی تیژو هەڵچوونەوە وەستا
گوزارشتی لە سەرپێچی کردنی قسەکانی ئەهریمەندا دەکرد وگووتی:
ئەوە چ گفتوگۆیەکی دروزنانەو ملهووڕانەو کوفر ئامێزە !
قسەی وەها هەرگیز لە ئاسماندا نەبیستراوە، ئەی لە ئایین بەدەر
خۆت لە شوێنی مەزنەکانی وەك خۆت داناوە

1- هەرگیز هەڵە ناکەین، لێرەدا ملتون پێچەوانەی لۆژیکی مەسیحی کار دەکات، لە بازدان بەسەر تەوراتدا، کە دەڵێ مەسیحی پێویستی بە یاسای موسا نییە،، مەبەستیش تێپەڕ کردنی پەیمانی کۆنە، بۆ پەیمانی نوێ.

ئاخر چۆن بەو هەموو کوفرو نکۆڵی کردنەوە
قسەکانی گەورەی ئاسمان تاوانبار دەکەیت؟
کە بۆ تاقانەی ڕایگەیاندو سوێندی بۆ خواردو سۆڵجانی پاشایەتی
ڕادەست کردوهەموو نەفسێك سوژدەی بۆ دەبات
لەو ڕێزلێنانەدا دانی پیانا، کە پاشایەکی یاساییە، قسەیەکی بەتاڵت کرد
کە گوتت: پیادە کردنی یاسا بەسەر ئازادەکانەوە بەتاڵە
یاخود فەرمانڕەوایی تەنها کەسێ، بەسەر ئەوانەی یەکسانن لە گەڵیا بە تاڵە
ئایا تۆ یاسا بۆ ئاسمان دادەنێی؟

## 102

ئایا ململانێ[1] لە گەڵ ئاسمان دەکەی، لە سەر بنەماکانی ئازادی؟
یەك کەس بە دەسەڵاتێکی ڕەها، فەرمانڕەوایەتی هەمووان دەکات
کێ تۆی وا لێکردووە کە هەبی، وەك چۆن ئێستا کە هەی،
ئاسمانەکانی دروست کردووەو ئاسانی کردووە؟
کیانی بۆ ئێوە وێنا کردووە؟ لەو شارەزابوونەی کە فێری بووین
و چەند چاکە چەندە چاکەی ئێمە چەندموو کەرامەتی ئێمە چەندە
چیمان پێدەبەخشێ، ئەوە زۆر لەو بیرۆکەیەوە دوورە
کە لە خۆی بە کەمترمان بزانێ

## 103

ژیانی خۆشی ئێمە لە ژێر دەیتی یەك ڕابەر نزیکە لە یەکگرتن لەگەڵ ئێمەدا
بەڵام با وایدانێین نادادییە، یەکسانەکان فەرمانڕەوایەتی پاشایەکی

---

١- ململانێ لە گەڵ ئاسمان، ئەو بیرۆکەیە لە نامەی پۆلس دا هاتووە، بۆ خەڵکی رومیە ١٩ ٢٠، کەدەڵێت تۆ کێی ئەی مرۆڤ، کە وەڵامی خوا دەدەیتەوە؟ ئایا وەبەرهاتوو بە وەبەرهێن دەڵێ بۆ منت ئاوا دروست کردووە؟

یەکسان لە گەڵ خۆیاندا بکەن، بەڵام ئایا تۆ بە گەورەیی و مەزنی خۆتەوە
یا بە هەموو سروشتی فریشتەکان لە یەك کەسدا
وادادەنێی یەکسانن، لە گەڵ ئەو تاقانەیەی کە ئەو هێناویەتە بوون ؟

## 104

ئاسمان هەموو شتێکی لەودا ئەفراند
ئەوە قسەی ئەوە، تۆش و هەموو فریشتەکانی ئاسمانی لەو ئەفراند
- بە پلەی جیا جیا - هەر هەمووانیش بە مەزنی
پاشان چینەکانی زیاد کرد، لەوانە: عەرشی سوڵتانەکان[1] و
ئیمارات وچاکەکان و سەرۆکایەتییەکان
کە ئەوانە هێزی بنەڕەتین، بەڵام فەرمانڕەوایەتی کردن و
نەیشاردنەوە بەڵکو درەوشاوەتری کردن

## 105

کە سەرکردایەتی کردین، بووە یەکێك لە ئێمە و بۆمان هاتە خوارەوە
یاساکانی یاسای ئێمەن و ئەو ڕێزەش کە لێی دەنێین، بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە
کەواتە سەرپێچی کردنی بەسە، ئەوانەیش مەخەرە وەسوەسەوە
باشتروایە بۆ تۆ پەلە بکەیت، بۆ ڕازی کردنی باوکی تووڕەوتاقانەی ناڕازی
کات زۆرە بۆ داواکردنی لێبووردن، فریشتەی زیخ ئاوا ئاخاوت
بەڵام تین و تاوی ئەو، کەسی نەدۆزییەوە لایەنگیری بکات
وەك ئەوەی کە لە کاتی خۆیا نەبووبیاخود غەریب و سەرمڕۆ بووبێ

١- عەرشی سوڵتانەکان، پلەکانی فریشتەکان بریتی بوو لە خاوەن عەرشەکان، دەسەڵاتدارەکان، ئیمارات، خاوەن فەزیاەکان، سوڵتانەکان.

## 106

ئەهریمەنی هەڵگەڕاوە دڵخۆش بوو، زۆر بە تڕزلییەوە وەڵامی دایەوە
کەواتە تۆ دەڵێی ئێمە وێنا کراوین، دەستێکی تر ئێمەی وێناندووە؟
باوك ڕێی بە کوڕەکەی داوە، ئەوکارە بکات، بیرۆکەیەکی غەریب[1] و تازەیە
بریا دەمانزانی ئەو ڕێبازەت لە کوێ هێناوە؟
کێ بینیویەتی ئەو ئەفراندنە چۆن ڕوویدا؟
تۆ ئەفراندنی خۆت وەبیر دێتەوە؟
بەبیرت دێت کەی ئەفرێنەر، کیانی بە تۆ بەخشیوە؟
ئێمە بە هیچ زەمانێك نازانین، کەتیایا نەبووینە، وەك ئێمە لە ئێستادا

## 107

نازانین کێ لە پێش ئێمەدا بووە، بەهێزی ئەو ژیانەی لە ئێمەدایە
خۆمان خۆمان هێنایە بوون و زاتی خۆمان دامەزراند
لەوکاتەی فەلەك دەورەی خۆیداو سووڕایەوە و تەواو بوو
کاتی لە دایك بوونیشمان [2]لەو ئاسمانەدا پێگەیی
ئەو ئاسمانەی نیشتیمانی ئێمەی کوڕانی ئەثیرییە
هێزی ئێمە لە زاتی خۆماندایە
دەستی چەپمان ڕێمان پێ پێشان دەدا. بۆ کاری زۆر بەرز

---

١- بیرۆکەی غەریب، بۆ یەکەمین جار بوو کە ئەهریمەن، ئەوە ببیستێ، کە تاقانە دەوری هەبووە لە ئەفراندن، لە هەمان کاتدا، بیرۆکەی ئەفراندن ڕەت دەکاتەوە، هەروەها ئەفراندنی خۆشی.

٢- کاتی لە دایک بوون پێگەیی، بە پێی تیوری شەیتان لەدایک بوون، ئەوکاتە دەبێ کە سووڕی فەلەکی تەواو دەبێت، وابەدیار دەکەوێ، دووبارە نابێتەوە، نە لە لایەن ئاسمان و نە لە لایەن تاقانەی ئاسمانەوە.

کاتێ ئەو کەسە بە هێز تاقی دەکەینەوە، کە لەگەڵ ئێمەدا یەکسانە

## 108

ئەو کاتە دەبینی کە ئاخۆ ئێمە بە پاڕانەوە، قسەی لەگەڵدا دەکەین
یاخود دەورەی عەرشی گەورەی ئاسمان دەدەین
تا لێی بپاڕێینەوە یا دەوری بدەین، ئەو هەواڵە بۆ خۆت هەڵگرە
بڕۆ بفرمو ئەو هەواڵە بۆ مەسیح ببەوە
پەلە بکە، بەر لەوەی نەوەکا خراپە ڕێت لێبگرێت
ئەهریمەن ئەوەی گووت و چەپڵەی ئاپۆڕەی فریشتان دەنگی دایەوە
وەك ئەوەی هاژەی ئۆکیانووس بێت

## 109

بەڵام ئەوە ڕێی لەو فریشتەی ئازایە نەگرت وهەرچەندە تەنها بوو
بە دوژمنەکانی دەورەدرابوو، وەڵامی دایەوە:
ئەی ئەو کەسەی لە ئاسمان بە دوورکەوتوویتەوە
ئەی ڕۆحی نەفرەت لێکراو،ئەی ئەو کەسەی پشتت لە چاکە کرد
ڕمانی تۆ دەبینم و مسۆگەرە
تیپە بێ ئومێدییەکەشت لەو فرۆفێڵە غەدرکارەدا
لەگەڵ تۆدا تێکەوتوون، نەخۆشی سزا و تاوانەکەی تۆ
لەناو ئەواندا بلاوبۆتەوە، بۆیە خۆت بەوە بێزار مەکە
کە چۆن لە کۆتی مەسیحی ئاسمان ڕزگارت دەبێ
ئەو یاسایە لێبووردەیە، جارێ تۆ ناگرێتەوە
یاسای تر هەن دژی تۆ، کە هیچکەسێ ناتوانێ بەری بگرێت

## 110

ئەو سۆڵجانە[1] زێڕینەی ڕەتت کردەوە، ئێستاکە بۆتە ئاسن
هەڵگەڕانەوەی تۆ دەشکێنێ و وردوخاشت دەکات
بەڵێ ئامۆژگارییەکەی تۆ گەیشت
بەڵام بە هۆی ئامۆژگاری یا هەڕەشەی تۆوە نییە
کە لەناو خێمەی ئەو گوناهبارانەدا ڕادەکەم
بەڵکو لەبەر ئەو غەزەبەیە، کە لە ناکاو وەك ئاگر هەڵدەچێ
جیاوازی لە میانی باش و چەپەڵ ناکات، ئەوە پێشبینی بکە
کە هەورە تریشقەیێ، وەك ئاگرێکی تووش سەرت بگرێتەوە
ئەو ئاگرەی ڤێزەوەنت دەکات وئەوسا دەگری ولە سینەی خۆت دەدەی
کە بۆ ئەفرێنراوی، ئەو کاتە دەزانی کێ دەتوانێ بتکاتە عەدەم

## 111

ئەبدئیل بێدەنگ بوو، باوەڕی خۆی چەسپاند
تەنها باوەڕداری ناو کوفرکارەکان بوو
تاکە ئەمینێك بوو، لە ناو خیانەتکارە بێژمێرەکان
نەترسا و نەلەقی، تووشی وەسوەسە نەبوو وفریوی نەخوارد
دڵسۆزی و خۆشەویستی و حەماسی خۆی پاراست
ژمارەی زۆری ئەوان نەیتوانی ئەو ڕامالْن
ئەو هەرلایەنگیریی خۆی پاراست و لە ژمارەیان نەترسا
ئەوەشی نەکردە سەرمەشقی خۆی، کە بۆیان ڕازاندبۆوە

---

١- سۆڵجان، رەمزی کاری چاکەیە، کە بوو بە ئاسن سیفەتی خویەتی ون دەکات.

## 112

ئەبئیل ، نە لە ڕێگەی ڕاست لایداو نەهەڵوێستی خۆی گۆڕی
هەرچەند ئەو لە ناوئەواندا بە تەنها بوو، ڕێگایەکی دوورودرێژی
بە ناو ڕقی دوژمنکارانەی ئەواندا، شەق کرد
بەڵام بەرگەی هەموو ئەو شتانەی گرت
پشتی بە سەرکەوتنی خۆی بەستاو لە هیچ توندوتیژییەك نەترسا
بە ڕق لێبوونەوەیەکی وەك ڕق لێبوونەوەی ئەوان
پشتی لە قەڵای خۆبەزلزانینی ئەوان کرد
کە لەناوچوونێکی خێرایان بۆ نووسرابوو.

---

- لە شوێنێکی ئەم بەشەدا باس لە درەختی دەردارو ئەو دار مێوە کراوە، کە پێیەوەی هەڵدەواسێ، ئەومیان دێرینە، کە هۆراس لە بەشی سروودەکان، باسی کردووە ٢-٥- ٤ بەڵام بڵاو بوونەوەی ئەم وێنەیە، لە چاخی نەهزەدا، نیشانەی تەواوی و یەکگرتن بووە، کە زیاتر بۆ ئۆڤید دەگەڕێتەوە، لە میتامۆرفۆسدا، مەسخی کائنات، ١٤-١٧ درەختی دەردار سیمبۆلی هێزو نێرایەتێ بووە، هەروەها دار مێو رەمزی بەپیتی و نەرم و نیانی مێینەیی بووە، هەروەها رەمزی چوونە ژێربارو ناسکی بووە، فاولەر دەڵێت بایەخی ئەم وێنەیە دەگەڕێتەوە بۆ دەلالەتی گەڕانەوەی ئادەم و حەواو دووبارە گونجانەومیان دوای ئەوەی خیلاف کەوتە نێوانیانەوە، بەهۆی ئەو خەونەی کە حەوا بینی بووی.
- سەبارەت بە زێناندن واتە - حدس - کە پشت بە چالاکی گشتی زەین دەبەستێ و لۆژیك پشت بەچالاکی شیکردنەوەی ئەقڵ دەبەستێ، ئەومیان بیرۆکەیەکی ئەفلاتوونییە، لە کتێبی کۆماردا هاتووە ل ٥٥٣ .
- ناوی شەیتان لە سەرەتادا لوسیفەر بووە، ئەومیان بەر لە هەڵگەڕانەوەی لەخوا، بە مانای تیشك دێت، یەکێکە لە ناوەکانی ئەستێرەی زوهرەیە، کە بە شەیتانەوە پەیوەست بوو ، ملتوون دەڵێت هەر لەدوای ئەو کارەساتە ناوەکانیان لە تۆماری ئاسماندا سڕایەوە.

## 1

فریشته ئازاو جەسوورەکە[1] بەدرێژایی شەو بەڕێوە بوو
کەس بە دوایەوە نەبوو، تا سپێدە گزنگی دا وسووڕی سەعات[2]- سووڕی سەعات، مەبەستی ملتۆن، دابەشییەکانی گومەزی ئاسمانە، کە لە ڕواڵەتدا دەسووڕێ، بە خوداوەندەکانی چوواندوە کە بەدەوری زەویدا دەسووڕێنەوە.
وەئاگای هێنا
دەستی درێژکردو دەرگای سپێدەی کردەوە
لە چیای پاشای گەورەدا، ئەشکەوتێ هەبوو لە نزیک عەرشەوە
لە سووڕێکی بەردەوامدا، هەندێجار ڕووناهی دایدەپۆشت وهەندێجار تاریکی
نۆبەتکارییان بەسەرەوە دەکردو لە ئاسمانیش بەدوای یەکدادەهاتن
ڕووناکی لە دەرگەیەك دەهاتە ژوورەوە
تاریکی لە دەرگەیەکی تر دەچووە دەرەوە

## 2

لە دوای ئەمەوە تا کاتی ئەوە دەهات، کە شەو ئاسمانی داپۆشێ
- هەرچەند شەو لێرە، وەکو شەفەق بوو لەوێدا-
بەڵام ئێستا سپێدە لە ئاسمانە بەرزەکاندا بەرەو پێش دەچێ
کە بە زێڕ ڕازاوبۆوە و شەوی لە پێش خۆیدا بنبزر دەکرد
تیشك پەردەی شەوی دڕاندو دەوروبەری دەشتاییەکان بەدیارکەوت
هەموو فەیلەقە درەوشاوەکان، بەدیارکەوتن، سەفیان بەستابوو بۆ شەڕ
داشقەی جەنگی و چەکی بریقەدارو ئەسپی ئاگرین

---

١-پیاوە جەسوورەکە مەبەستی ئەبدئیلە.

٢- سووڕی سەعات، مەبەستی ملتۆن، دابەشییەکانی گومەزی ئاسمانە، کە لە ڕواڵەتدا دەسووڕێ، بە خوداوەندەکانی چوواندوە کە بەدەوری زەویدا دەسووڕێنەوە.

کەوەك مەشخەڵ بەسەر مەشخەڵەوە دەدرەوشانەوە
یەکەمین شت بوون کە بینران، ئینجا ئەبدئیل، دەرکی بەوە کرد
کە ئەوە بۆ جەنگە، بەڵکو هەمان ئەو جەنگەیە کە خۆیان بۆ ئامادە دەکەن

## 3

کە بینی ئەوان زانیویانە، کەسێ هەواڵێکی تازەیان بۆ دەهێنێ
بەوە دڵشاد بوو و یەکسەر چووە ڕیزی لایەنگرانی ئاسمانەوە
ئەو سەربازانەی کە بە شادی و دروودی بەرزەوە پێشوازییان لێکرد
بەوە شاد بوون، کە یەکێك لە ناو ئەو هەزاران کەسەی
کە داڕمان و وەرگەڕان، رزگاری بووەو، یەکێك بە بێ خەسارەت گەڕاوەتەوە
ئینجا بردیانە سەر گردی پیرۆزو بە دەنگی بەرزەوە هوتافیان بۆ لێدەدا
پاشان ئەویان پێشکەشی کورسی باڵای خۆیان کرد
دوواییش دەنگێك لە ناوەندی هەورێکی زێڕینەوە، بەرزبۆووە
بە نەرمی دەیگووت: ئەی ئەبدئیل[1]، کارێکی باشت کردووە[2] :

## 4

جەنگێکی باشت ئەنجامداوەو باشترین شەڕت کردووە
تۆ بە ڕووی ئاپۆرەی سەر لێشێواوان وەستایتەوە

---

1- ئەی ئەبدئیل، سەرەتا بەگەڵ شەیتان کەتبوو، چونکە ئاگای لە پیلانی شەیتان نەبوو، پاشان لێی هەلگەڕاوەو بەجێی هێشت.

2- لە ئینجیلی مەتی دا هاتووە- هەرخۆش بیت ئەی بەندەی باش.

بۆ پرسی ڕاستی، سەرکەوتنت بەدەست هێناوە، قسەکانت
بەهێزتر بوون لە شمشێری ئەوان، هەروەها بەرگەی ئەوەشت گرت
کاتێ، هەموویان بە خراپی لۆمەی ڕاستییان دەکرد
ئەوەشیان قورسترو بەئێشتر بوو، لە ئازادانی جەبتە
تۆ خەمی هیچت نەبوو، جگە لە ڕازی بوونی ئاسمان
هەرچەندە ئەوان تۆیان، بە گومڕا بەردباران کرد
بەلاَم، وای سەرکەوتنی تۆ، ئێستاکە چەند ئاسانە
کاتێ دەگەڕێیتەوە و ئەو هەموو ئاپۆڕە دڵسۆزە پشتت دەگرن
تۆ ئەمجارە بە مەزنییەکی گەورەتر لە هاتنەوەت، دەگەڕێیتەوە لای
ئەو دوژمنانەیة کە تۆیان بوغزاند، بەهێز دەیانخەیتە بەردەستی خۆت
چونکە ئەوان ئەقڵ و یاسا قبووڵ ناکەن، نەك هەر ئەمە
بەڵکو قبووڵی ئەوەش ناکەن کە مەسیح، پاشایان بێت
ئەوپاشایەی، فەرمانڕەوایەتی دەکات و شایانی ئەو فەرمانڕەوایەتیەیە

## 5

دەی هەستە ئەی میخائیل، ئەی ئەمیری هەموو قۆشەنەکان
تۆش ئەی سەربازکار، کە لە کارامەیی و شارەزایید، لە دوای ئەوی
ئەی گابرائیل، هەستن ڕابەرایەتی کوڕەکانم بکەن، بۆ ناوجەرگەی شەڕ
کە هەرگیز بەزینیان بۆ نییە،ڕابەرایەتی فریشتە چەکدارەکانم بکەن
کە بە هەزاران هەزارو ملیۆنەهای هەڵبژێردراون، بۆجەنگ
ژمارەیان بەقەد ژمارەی ئەو کۆمەڵە گاورە وهەڵگەڕاوانەیە
ئاگرو چەکی کوشندەیان بەسەردا بکەنەوە
ئازا بن و تا تخووبی ئاسمان ڕاویان بنێن
لە باوەشی خوایان و خۆشستانی ئاسماندا دەریانپەڕێنن
بیانهاوێنە ناو بارەگای سزای خۆیان، لە دەریاچەی تارتاروس(١)

1- تارتاروس، مەملەکەتی دۆزەخە لەمیتۆلۆژیای یۆنانی، - ئاگری کوێری یا کاوس، لە

کەوا ئامادەیەو دەمی بە ئاگری کاوس کردۆتەوە، تا هەڵیانلووشێ

## 6

پاشا ئاوا قسەی کرد و هەورەکان دەوروبەری گردەکەیان تاریك کرد
دوکەڵێکی تاری و زمانەی ئاگرێکی بۆن ناخۆش بەرزبۆوە
کە بەڵگەی تووڕە بوون بوو، ترسی دەنگی ئەو کەڕەناییە هەواییەش
کەمتر نەبوو لەو دووکەڵ و ئاگرە
کە لەبەرزاییەوە فووی تێکرا و کەوتە ژەنینەوە
کاتێ ئەو فەرمانە دەرچوو، هێزە شەرکەرەکان و
داکۆکی کارانی ئاسمان هەستانەوەو، هەرچوار تیپ لە یەکیەتییەکدا
یەکیان گرتەوەو تیپە دەرەوشاوەکانیان بە نەغمەی گونجاو[1]
کە بەو ئامێرانە دەژەنران، حەماس و پاڵەوانێتیان
لە دەروونیاندا، زیندوو دەکردەوە

## 7

هانیدەدان کاری پڕ لە مەترسی ئەنجام بدەن
بە بێدەنگی بەرەو پێشەوە چوون
سەرکردە نوورانییەکان رابەرایەتیان دەکردن
لەپێناوی مەسیح و ئاسماندا، وەها دەچوونە پێشەوە
کە هەرگیز لەیەك نەدەترازان
هیچ گردو دۆڵێ نەیاندەتوانی رێیان پێ بگرن و ببن بە تەگەرە

---

ئەسڵدا کوێرییە کە ئاگری داگیرساندووە، وا بەدیار دەکەوێ کە دۆزەخ دوای ڕمانی ئیبلیس دامەزراوە.

1- هەنگاوەکانیان بەسەر زەویدا، بەڕای ملتون ، لەشکرە دێرینەکان، لە کاتی جەنگدا بەم شێوەیە ڕێکدەخران.

هەروەها هیچ دارستان و ڕووبارێك، نەیانتوانی
ڕیزی توندوتۆڵی ئەوان، پەرش و بڵاویان بكەنەوە
لە كاتی ڕۆیشتندا هەنگاوەكانیان بەسەر زەویدا بەرزدەبۆوە
هەوای وەستاو لەگەڵ هەنگاوی نەرمی ئەواندا دەجولایەوە
وەك ئەوەی جۆرێ لە باڵندە بن، پۆل پۆل سەفیان بەستابوو
بەسەر عەدن[١] دا هەڵفڕین تا ناوەكانیان وەرگرن
بە چەندین لای ئاسماندا تێپەڕین و زۆر لە هەرێمە گەورەكانیان بڕی
كە دەهێندە درێژتر بوون لەو زەوییە
لە ئاسۆی دوورەوە تا باكوور، هەرێمێكی ئاگرین بەدیار كەوت
لەو پەڕەوە تا ئەو پەڕ درێژ دەبۆوە، ئامادە بوون بۆ شەڕ
كە زۆرتر نزیك بوونەوە، واهاتە بەرچاو، وەزعەكە ئاڵۆزە
چونكە ژمارەیەكی یەكجار زۆر[٢] - لەژمار نەدەهاتن - لە ڕمی بەرزكراوەو خودەو
زرێی جوراوجۆر كۆببوونەوە، كە بەوێنەی شانازی هاندان نەخشێنرا بوون

## 8

هێزی شەیتانی بە هێرشێكی تووڕەوە لە پەلەكردن دابوو
وای خەیاڵ دەكرد هەر لەهەمان ڕۆژدا ولە ناكاو، دەست بەسەرعەرش و
چیا دادەگرێت و دەوڵەتێك دادەمەزرێنێ، حەسوودیان بە پایەی تاقانە دەبرد
بەڵام پاشان، گومڕاییان بەدیار كەوت و لە نیوەڕێدا خەیاڵیان بە تاڵ بۆوە
ئەم دیمەنە، یەكەمجار زۆر غەریب هاتە بەرچاوی ئێمەمانان

١- بەسەر عەدن دا هەڵفڕین، فریشتە لای ملتون وەک ئەربابە دێرینەکان، بەڕێدا دەڕۆیشتن، بێئەوەی پێیان بە زەوی بکەوێت.

٢- بەپێی بۆچوونی ملتون، خوا ژمارەیەکی یەکجار زۆری لە کێوی و باڵندەی ئامادەی بەردەم ئادەم کردبوو، فریشتەکان لای میلتون، هەمان ئەو چەکانە بەکاردەهێنن، کە شەڕکەرەکانی هومیرۆس بەکاریان دەهێنا.

کە فریشتەکان لەگەڵ یەك بجەنگن ولە شەڕێکی دژواردا یەکتر
بگرنەوە
دوای ئەوەی کە لە زۆر جەژنی شادی و خۆشەویستیدا
بە یەکدەست، وەك ڕۆڵەی یەك باوکی مەزن ، بەیەك دەگەیشتنەوە
درووودو سپاسیان بۆباوکی ئەزەلی خۆیان دەنارد
جەنگ دەستی پێکرد و دەنگی هێرشی پێشڕەوان
کۆتایی بە هەموو بیرکردنەوەیەکی ساغ هێنا

## 9

لە بەرزاییداو لە ناوەندەوە، ئەهریمەن ی وەرگەڕاو، وەك ئەربابێکی بەرز
لە ناو داشقەی خۆیدا، وەك خۆرەتاو دانیشتبوو
وەك بتی خوداوەندیّ[1]، کە گەورە فریشتەکانی شارۆبیمی بریقەدار و زرێی
زێڕین
دەوریان دابوو، پاشان لە عەرشی زلی خۆیدا دابەزی
ئێستاکە جگە لە مەودایەکی کەم وترسناك، هێچ شتیّ لە نێوانیاندا نەبوو
بەرە لەگەڵ بەرەدا تیکگیر بووبوون، لە نەزمێکی وەهادا وەستا بوو
مایەی ترس بوو، ریزی دوورودرێژیان بیّ سنوور بوو
لە لای پێشەوەدا، لە هێڵی ڕووبەڕوو بوونەوەی بەر لە یەکانگیربوون
ئەهریمەن بە هەنگاوی فەلامەرزی خۆیەوە، بە فیزەوە بەرەو پێشەوە دەچوو
شانی لە هەموویان بەرزتر بوو، بە ئەڵماس و زێڕ دیواربەند کرابوو

١- وەک بتی خوداوەندیێ، پیشانی دەدا کە وێنەی ئەهریمەن وێنەی بتە، یا وێنەکی قولابی گەورەی تاقانەیە، چونکە لە ناو داشقەیەکی گەورەی گەشاوەدا دادەنیشیێ لاسایی پەیتوونی کەونی دەکاتەوە کە مەسیح لەناویا دانیشتووە، فریشتەکانی شاروبیم ی بریقەبەخش دەورەیان داوە و لاسایی شارۆبیمی ناو پەیتوونی کەونی دەکەنەوە.

## 10

ئەبدئیل بەرگەی ئەو دیمەنەی نەگرت، کەسێك ببینێ، لە میانی
زەبەلاحەکاندا بوەستێ
کە بڕیاریان داوە گەورەترین کاری خراپە، ئەنجام بدەن
شتێك بە دڵی[1] ئازای داهات و ناوەڕۆکەکەی ئاشکرا کرد:
ئەی ئاسمان، ئەو چ شەبیهێکە تا ئەو ڕادە باڵایە،کە باوەڕو شەرەفی نەماوە
دەبوایە هیچ هێزو قودرەتێکی نەبێت، کەهیچ فەزیلەتێکی نەماوە؟
ڕەنگە بێهێزی ئەو، زیاتر بێت، بە زیادبوونی جورئەتەکەی
سەرەڕای ئەوەی کە لە ڕۆالەتییەوە وادیارە نابەزێت
ئەوا منیش، بە پشت بەستن بە ئاسمانەوە، هێزی ئەو هەرماسە، تاقی
دەکەمەوە
دوای ئەوەی بۆم ڕوونبۆوە، کە بیروڕاکانی پووچ و گەندەڵن، درۆو دەڵەسەن

## 11

دادپەروەری ئەوەیە، ئەگەر کەسێ غەنیمی خۆی لە مەیدانی هەقدا
ببەزێنێ، دەبێ لە مەیدانی شەڕیشدا بیبەزێنێ
لە هەردوو ئەو ململانێیەشدا، بە سەرکەوتوویی بێتە دەرەوە
هەرچەندە ئەویان خراپ و سووکە
کاتێ کە ئەقڵ ناچار دەبێت بگاتە هێز، ئەوە بەرزترین پلەی ئەقڵ
شکستدانی لوژیکی هێزە، لە ڕامانی خۆی بۆوەو چەکدارەکانی خۆی بە
جێهێشت
هەنگاوی بۆ پێشەوە نا و لە ناوەندی ڕێدا
ڕووبەڕووی دوژمنی جەسوور بۆوە

---

١- شتێ بە دڵی ئازای داهات، ئەوە دەستەواژەی هیکتورە لە ئەلیادە ، کە لەگەڵ ئەخیل یەکانگیر دەبێ 98-22 .

ڕێگەی پێگرت، هێندەی ترتووڕە بوو، بۆیە بە هەموو متمانەیەکەوە گووتی:
ئایا قەت، کەسێك ڕووبەڕووی تۆ بوویتەوە ئەی خۆبەزلزان؟

## 12

تۆ هیوات وابوو، بەبێ شەڕ بگەیتە لوتکەی ئارەزووەکانت و
لە سەرعەرشی ئاسمان دانیشی؟
کە پاساوانەکانی ئەو عەرشە، لە ترسی زمان تیژی و
چەپەڵی و زۆری تۆوە ڕایانکرد
وای تۆ چەند گومڕای؟ ئەگەر بێهوودە هەوڵ بدەیت
بە چەك زمانت بەسەر ئاسماندا درێژ بکەیت!
ئەوە ئاسمان دەتوانی هیچترین شت بکا بە لەشکرێکی یەکجار زۆر،
کۆتایی نەبێت
تا گەمژەڵییەکەت وردوخاش کات، هەر ئەوش نا
بەڵکو دەتوانێ دەستی درێژکاتەوە تا ئەوپەڕی ئەوپەڕەوە
یەك چەپەرۆکت لێبدات و بێکەس بتکوژێت و هەموو تیپەکانیشت
لە تاریکیدا وردوخاش کات، بەڵام سەیرکە، هەموویان بەدوات ناکەون
تیایاندا هەیەیە، خۆی بە باوەڕو پەرستنی ئاسمادا گرتووە
تۆ نایانبینی، واخەیاڵ دەکەی من بە تەنهام
پێچەوانەی هەمووانت کردووە، گومڕای ناو دونیای خۆت بوویت

## 13

سەیرکە، تۆ هێشتا جانگی لایەنگرانی من ناناسی؟
دوای ئەوەی کە کار لە کار دەترازێ، ئەوسا دەزانی
زۆرجاران - کەم - دەزانێ و — زۆر- گومڕا دەبێت
دوژمنی گەورە بە تووڕەیی سەیری کرد وبە بێزلێکردنەوە

چاوی تێبڕی و گووتی:
قورت بەسەر، لەو کاتەی کە تۆڵەی خۆمت لێدەکەمەوە
یەکەمجار داوای تۆ دەکەم، چونکە دوای ئەوەی کە ڕاتکردوە،
گەڕاویتەوە
ئەی فریشتەی لادەر، گەڕایتەوە تا سزای وروژاندنی، فیتەبازیت
لە یەکەم تاقی کردنەوەدا، بە دەستی چەپەم وەرگریت
کە زەمانت تووڕەی کردووە، چونکە زەمانی تۆ بوو یەکەمجار
ئیلهامی دژایەتی کردنی بۆ هات، جورئەتی کرد سەرپێچی سێیەکی
ئەربابەکان بکات، کە لە ئەنجوومەنی خۆیاندا، کۆبوونەوە
بۆ سەلماکردنی خوایەتی خۆیان
ئەوانەی وا هەست دەکەن کە حاشا لە هێزی پیرۆزی ناوەوەیان کراوە

## 14

تۆ پێش هاوڕێکانت کەوتی و ئارەزووی ئەوەتە، کە زاڵ بیت بەسەر منەوە
سەرکەوتنت ببێتە تاجی سەرت، باوابێ، لەوانەیە کۆتایی تۆ
مایەی هیلاکی بێت، بۆ هەموو تیپەکەت
بەڵام من جارێ هیچ ناکەم بۆ وەڵامدانەوەی قسەکانت
– لە ترسی ئەوەی نەبادا فیزلێبدەی، ئەگەر وانەکەم –
تا ئەوەشت پێ بڵێم و بیزانی: من یەکەمجار وامزەن دەکرد
کە ئازادی ئاسمان، بێ جیاوازی بۆ ڕۆحەکانی ئاسمان ڕاخراون
بەڵام ئێستا دەرکم بەوە کردووە، کە زۆربەیان تەمەڵن و
پەرستن بە باشتر دەزانن، ئەوانە چەند ڕۆحێکی خزمەتکارن
لەسەر ئەوە مەشق پێکراون، کە گۆرانی بڵێن و لایەنبازی بکەن

## 15

جا ئەگەر تۆ چەکت دایە دەست هی وەك ئەوانەی کە سرودبێژی ئاسمانن
ئەوە وات لە کۆیلەکان کرد کە مل لەبەر ملی   ئازادیخوازەکانبنێن
هەر ئەمڕۆکە بەراوردی نێوان، نمایشی ئەو دوو تیپەت بۆ دەسەلمێنرێت
ئەبدئیل  بە کورتی و بە توندی وەڵامی دایەوەو گوتی:
هەی وەرگەڕاو تۆ گومڕا بوویت، گومڕایی تۆ سنووری بۆ نییە
دوورکەوتوویتەوە لە ڕێگەی ڕاست، زوڵمت کرد
کە بەو کەسانە بڵێی کۆیلە، چونکە ئاسمان دەپەرستن، یا سروشت

## 16

ئاسمان و سروشت، هەردووکیان یەك فەرمانیان هەیە
کاتێ کە دادوەر باشترین دادوەر بێت ولە سەرووی حوکمکراوەکان بێت
بەڵام کۆیلایەتی بریتییە لە، پەرستنی گەمژەیەك،
یاخود کەسێ کە لەدژی شایستەیی ئەودا، هەڵگەڕێتەوە
وەك تۆپەرستنی لایەنگرانت  لە ئێستاکەدا،کە تۆ خۆت ئازاد نیت
بەڵکو تۆ کۆیلەی زاتی خۆتی، لەگەڵ ئەوەشدا زاتی ئەوە دەکەی
کە بە چەپەڵییەوە هێرشمان بکەیتە سەر، چییە؟ ئێمە ئاسمان دەپەرستین
با تۆ  گەورە بیت  لە دۆزەخ – مەملەکەتی تۆ - و
من ببمە کۆیلە لە ئاسمان،  خوا پیرۆزم دەکات و هەتا هەتا
گوێڕایەڵی فەرمانە قودسییەکانی دەکەم
سەیری مەملەکەتەکان مەکە لە دۆزەخ، بەڵکو سەیری زنجیرو کۆتەکان
بکە

## 17

بەڵام ئێستا ئەو زەربەیە لە من وەردەگری — منی پەشیمان و گەڕاوە
وەك چۆن وا دەڵێی- بۆ سەر پۆپیتەی[1] بیژی خۆت
ئەوەی گوت و ئینجا دەستی خۆی بەرزکردەوەو لێدانێکی سەختی وەشاند
هەر ئەوەندە بەرز بۆوە، تا وەك بروسك و هەرەتریشقە
دابەزییە سەر تەپڵی سەری ئەهریمەنی کەلە ڕەقەوە
هێندە گورچکبڕ بوو، نەچاو دەیبینی نە بزاوتی بیری تیژ
هەتا زرێکەشی فریای نەکەوت و نەیتوانی ڕێ لە وێرانبوونی بگرێت
دە هەنگاو چووە دواوە و کەوتە سەر پاشووی خۆیەوە
لە هەنگاوی دەهەمینی، کەوتە سەر ئەژنۆی خۆیەوە

## 18

خۆی دابووە سەر ڕمە زەبەلاحەکەیەوە
وەك ئەوەی کە با لە ناخی زەوییەوە، هەڵیکردبێ
یا هورژمی لافاوێکی زۆر، کە چیایەك لە بن وبۆتکەوە هەڵتەکێنێ
لەگەڵ درەختەکانی سنۆبەردا، بە زەویدا چووە خوارەوەو ڕووچوو
فریشتە هەڵگەڕاوەکان تووشی سەرسامی بوون
بەڵام کە بینیان گەورە زەبەلاحی خۆیان بە زەوی داکەوت
هێندەی تر تووڕە بوون
لەولاوەش خۆشی و شادی، کەوتە ناو دڵێرو ئازاکانی ئێمەوە
هاواری سەرکەوتنیان سەردا، کە گوزارشتی
لە ئارەزووێکی بەکجار زۆری جەنگبازی دەکرد
ئەو کاتە میخائیل فەرمانی دەرکرد، کە کەڕەنای فریشتەی گەورە بژەنن

---

١- پۆپیتە: پلەکانی سەربازی لە کۆندا، بریتی بوون لە خودە و پۆپیتەیەکی تووکدار لەلای سەرەوە، پلەکانیش بە پێی تووک و ڕنگی تووک، دابەشکرابوون.

ئیدی دەنگی کەڕەنا، لە هەموو ئاسمانە فراوانەکاندا دەنگی دایەوە
لەشکری باوەڕداران درووودیان بۆ گەورەی ئاسمان نارد

## 19

دوای وەستان و زەقبوونەوەی چاوە سەرسام ئامێزەکانی دوژمنان
تیپەکانی دوژمن دەستیان بە جووڵە کرد، هەرایەکی ناشیرینیان
هێناکایەوە
لە گەڵ غەنیمی تەیارو ئامادە یەکانگیر بوون
تووڕەبوونێکی ڕامالئاێز و هەراوهۆیا بەرزبۆوە
کە هەرگیز وەکو ئەمە، لە ئاسماندا نەبیسترا بوو
شمشێرو زرێکان بەیەك دەکەوتن و زرمەیان دەهات
ترس و هات و هاوارێکی نەشاز بوو
داشقە مسینەکان شێت بووبوون، هات و هاواری کوشتار، زۆر تۆقێنەر بوو

## 20

بەسەرسەریانەوەش، ویزویزی ترسێنەرو وەحشی ڕمە ئاگرینە هەڵفڕیوەکان
بوو
بوون بە ڕەشماڵێ لە ئاگرو سێبەریان هەڵخستە سەر هەردوو لەشکرەکە
ئا بەمجۆرەو لە ژێر ئەو گومەزە ئاگرینەوە
فەیلەقە گەورەکانی هەردوولا شەڕکەرەکە، تاویان دا
تووڕەبوونێك بوو، کە گڕوگڵپەی نەدەکوژایەوە
ئاسمانیش، دەنگدانەوەی دەنگی ئەو کوشتارەی، پێچەوانە دەکردەوە
خۆ ئەگەر زەوی ئەو کاتە بخوڵقابا، ئەوە تا چەقی زەوی دەلەرزی
کاتێ ملیۆنەها فریشتە زۆربە توندی و دڕییەوە، لە هەردوو لا یەکانگیر
بوون

هیچ سەیر نابێ کە بچووکترینیان، بتوانی دەست بەسەرهەرچوار ڕەگەزدا بگرێ و
خۆی بە هێزی ناوەوە تەیار بکات، لەسەر هەموو زەویدا

## 21

ئایا شتێکی ترهەیە، کە هێزی ئەو دوو لەشکرەی، کە لە ژمار نەدەهاتن، زێتر بکات؟
شڵەژانێکی تۆقێنەریان وروژاند لە ململانێی خۆیاندا
هەتا وای لێهات شوێنی یەکەمی خۆشستانی خۆیان، بلەرزێنن
بێ ئەوەی وێرانی بکەن، ئەگەر پاشای ئەزەلی لە عەرشی مەزنی بەرزی خۆیەوە
لە ئاسمانەوە کە دەستی بەسەر هەموو شتێکەوە دە شکا
وای قەزاوەت نەکردایە، کە هێزی ئەوانە سنووربەند بکات و
لە توندو تیژی ئەو دوو هێزە کەم کاتەوە
هەر تیپێك لە تیپەکان، ئاپۆڕەیەکی گەورە بوو

## 22

هەموو دەستێك چەکی هەڵگرتبوو، وەك تیپێك وابوو، لە ڕووی هێزەوە
هەموویان ڕابەریان هەبوو، بەڵام هەر یەك لە شەرکەرەکان
وەك ڕابەر بەدیار دەکەوت، وەك ئەوەی کە ئەو ڕابەرە بەرزەکە بێت
چونکە ئەوانە خەبیر بوون، دەیانزانی کەی تاو بدەن و
کەی بوەستن و کەی شەڕەکە هەڵدەسووڕێنن
بەڵکو دەیانزانی کەی ڕێزی شەڕکەرەکان دەکرێتەوەو کەی دادەخرێ
ڕێزی ئەو جەنگە عەبووسە
هەرگیز بە خەیاڵیان دانەدەهات کە ڕاکەن یا پاشەکشە بکەن
یاخو کارێکی وابکەن کە لایەق بەوان نەبێ و گوزارشت لە ترس بکات

## 23

هەریەك لەوان پشتی بە خۆی دەبەستا، لە ناو بازووەکانیاندا یەکیەتیەك هەبوو
کە هێزی سەرکەوتنی تیا بوو
وای کارگەلێکی زۆرهەن، کە ڕوویانداوموکۆتاییان نییە، بە نەمر باس دەکرێن
چوارچێوەی ئەو جەنگە فراوان بوو، وێنەکانی جۆراوجۆر بوون
هەندێ جار لەسەرزەوییەکی ڕەق بوو و بەسەر قاچەوە شەڕیان دەکرد
هەندێ جاریش لە هەوادا وەك باڵندە هەڵدەفڕین، عەزابێکی تاڵیان دەدایە هەوا
بەڵکو تۆ واخەیاڵت دەکرد، کە هەوا هەمووی بۆتە کڵپەی ئاگر
هەردووتای تەرازووی شەڕەکە، بۆ زەمانێکی دوورودرێژ،هاوسەنگ بوون

## 24

تا ئەو کاتەی ئەهریمەن هەڵسایەوە، ئەو ڕۆژە
هێزی سەرسامئامێزی خۆی بەدیارخست
هیچ غەنیمێکی لەبەرامبەردا نەبوو، ڕووبەڕووی بێتەوە
خۆی دا بە ڕێزەی فریشتەکانی سارۆفیم و ڕێزمیانی شکاند و سەری لێشێواندن
دواجار شمشێری بڕندەی میخائیلی بینی، دابەزی و دەستەیەکی کرد بە بەرد
شمشێرەکەی دوو قەفتەی هەبوو، هێزێکی مەزنی هەبوو
بەرزی دەکردەوەو پاشان بەلایە ترسناك و بڕندەکەیەوە دادەبەزی
دوورو نزیکەکەکانی پەلدەداو دەخستە خوارەوە

## 25

بۆ وەستاندنی ئەو وێرانییە، ئەهریمەن پەلەی کرد، زرێی بەردینی خۆی دایەبەر
ئەو زرێیەی کە  دە چینی سفتی هەبوو، زۆر درێژوپان بوو
کە نزیك کەوتەوە، فریشتەی گەورە دەستی لە کوشتار هەڵگرت
هیوای بەوە خۆشبوو، کۆتایی بەو جەنگەی نێوان خەڵکی ئاسمان بهێنێ
هەروەها لمووزی دوژمنی گەورە بشکێنێ

## 26

ئەهریمەن بە دیل بگرێ و زنجیری بکات
گرژی لە ڕوخساریدا دیار بوو، لە تووڕەییان دەکولا
کەوتە دوان لەگەڵ ئەهریمەن و گووتی:
ئەی ئەو کەسەی جەنگت داهێنا، کە جەنگ هەر نەبوو
تا ئەو کاتەی تۆ ئاسمان هەڵەگەڕایتەوە، هەرناویشی نەبوو لە ئاسمان
پاشان وەك دەبینی چۆن ئەو کوشتارە قێزەوەنە، پەنگاوەی داوەتەوە
جا ئەگەر هەمووان تووڕە بکات، ئەوە  لەڕووی دادەوە
زۆر گرانترە، بەسەر تۆ و بەسەر لایەنگرانتەوە

## 27

ئەوە چۆن تۆئەو ئاشتییە پیرۆزەی ئاسمانت بەزاندو
 دەردەسەریت لە سرووشتدا هێنایە کایەوە
هەتا تۆ ئەو تاوانەت ئەنجام نەدا، دروست نەبووبوو
بزانە چۆن رق وقینی خۆت دەرخواردی هەزاراندا
هەر هەمو باوەڕی خۆیان لە دەستدا، بەرەوغەدرو غەدرکاری چوون
دوای ئەوەی کە هەموویان چاك و ڕاستکاربوون
بەڵام خەیاڵی ئەوە نەکەی، کە تۆ ئەو کپییە پیرۆزە شێلوو دەکەی

چونکە ئاسمان لە هەموو تخووبەکانی خۆیدا دەرت دەکات
سەبر لەسەر جەنگ و کوشت و بڕین ناگرێت

## 28

کەواتە خۆت و هەموو خراپییەکانت بڕۆنە دەرەوە
چونکە ئەو خراپەکارییە لە تۆدا، لەدایك بوو
دەی خۆت و لایەنگرانە چەپەڵەکانت بڕۆن
بۆ ناو گۆڕی خراپەکاری، بۆ ناو دۆزەخ
لەوێ مل لە بەرملی یەکتر بنێن
بەر لەو ەی شمشێری تۆڵەی من هەڵت پاچێ
یاخود ئاسمان تۆڵەی باڵداری خۆی لە ناکاودا بنێرێ و
هەلتهاوێتە نێوان زەوی و ئاسمان، ئێش و ئازاری عەزابت زیاتر کات

## 29

ئەمیری فریشتەکان لە قسەکانی خۆی بۆوەو
ئەهریمەن وەڵامی دایەوەو گووتی: واخەیاڵ نەکەی کە تۆ دەتوانی،
بەوهەڕەشە بۆشانەی خۆت بمترسێنی
دوای ئەوەی بە کردارو رەفتار، نەتتوانی ئەوە بکەیت
تۆ نەتتوانوانی ئەوانەی ژێرەوەش، ناچاری ڕاکردن بکەیت
ئەگەر بشکەون ئەوە هەڵدەسنەوەو ڕاناکەن
دەبینی ئاسانترە کە گفت وگۆم لەگەڵدا بکەیت
لەوەی کە بە هیوای ئەوە بیت، هەڕەشەو گوڕەشەکانت سەرکەون
سەرچیغ مەڕۆ، پێت وابێت ئەوە کۆتایی ململانێکەیە، کەتۆ ناوت ناوە خراپە
بەڵکو ئێمە هەنگاو دەنێین بەرەو شانازییەکان

## 30

بڕیارمان داوە سەرکەوین، یا ئەو ئاسمانە بکەینە
ئەو دۆزەخەی خەیاڵی بوونی دەکەی
هەر لێرەدا بە ئازادی دادەنیشین، هەرچەندە حوکمڕانێتی ناکەین
بەڵام ئێستاکە هەموو هێزی خۆت کۆکەرەوە و
داوای یارمەتی ئەو کەسە بکە کە پێی دەڵێی گەورە
من نابەزم بەڵکو لە دوورو نزیك، بەدوای تۆدا دەگەڕێم
لە قسەکانی خۆیان بوونە وەو ئامادەی جەنگ بوون
جەنگێ کە هەرگیز وەسف ناکرێ
بەهیچ کەسێ، هەتا  زمانی فریشتەشی هەبێت
ناتوانێ هەواڵی ئەو ڕووداوانە بگێڕێتەوە
کە چۆن نموونەی ئەو جەنگە لەسەر زەوی دەدۆزێتەوە یا پێی دەزانێ؟
ئەوە خەیاڵی مرۆڤ، بۆ لووتکەی ئاسمان بەرز دەکاتەوە

## 31

وەستاو بن یاخود لە ڕۆیشتنا بن، لە قامەت و لە بزاوت و لە چەك
شایانی ئەوە بوون کە لە مەئالی ئاسمانی مەزندا لەیەك بترازێن
ئیدی شمشێرە ئاگرینەکانیان لە هەوادا هەڵسووڕانەوەو سەمایان دەکرد
سووڕانەوەیەکی ترسناك بوو، بەڵام زرێکانیان، خۆرێکی پان و پۆڕ بوو
دەدرەوشانەوەو ڕووبەڕووی یەکتر دەبوونەوە
لە کاتێکا پێشبینی کردن، لە ترسانا دەوەستا
ئاپۆڕەی فریشتان لە هەردوو لادا بەپەلە پاشەکشەیان دەکرد
کە لە توندوتیژترین جەنگدا پاکانگیر بووبوون
مەیدانێکی فراوانیان لەدوای خۆیان بە جێهێشت

## 32

چونکه دڵنیا نەبوون لە وەستانی خۆیان لەبەر بادا، لە نێو ئە ململانێیە
ئەگە بچووکمان وەك نموونە بۆ گەورە هێنایەوە
- وەك ئەوەی هێمنی سرووشت وردوخاش بووبێ و
جەنگ لە میانی ئەستێرەی فەلەکەکان ڕوو بدات
بەڵکو وەك ئەوە بوو کە دوو ئەستێرە، لە شوێنێ خراپە و خراپەکاری تاو بدەن
بۆ کوشت و کوشتارێکی وەحشیانە، لە ناوەندی ئاسمان
جەنگین و هەردوو مەداری نەگونجاویان[1] تێکەڵ بەیەك بوون
هەردوو لایان بازووی خۆیان بەرز کردەوە
وەك ئەوەی کە هیچ بازوێکی تر ناگەنە ئەوانوە،لە هێزو بڕستیان
دەیانویست بە یەك وەشان کۆتایی بە کارەکە بهێنن
وەشانێك کە پێویستی بە دووبارە کرنەوە نەبێت

## 33

بەڵکو لە ئێستادا ناتوانرێ دووبارە ببێتەوە
لە ڕووداهیچ شتێ نەبوو، جیاوازی بکات لە میانیان
نە بەهێز نە بە دیارکەوتنی ئەوەی کامیان باشە و
نەبە خواست و ئارەزوو، نەبە خۆپاراستن[2]
بەڵام شمشێری میخائیل لە چەکەکانی ئاسمان بوو
پۆڵاڕێژ بەوی دابوو، هیچ ڕەقییەك توانای ئەوەی نییە

1- مەداری نەگونجاو، رافائیل گەرەکی بوو کە ئەو جەنگە، لە ڕێگەی ئەستێرەو سوورگەکان، بۆ ئادەم دەست نیشان بکات، چونکە لەوە زیاتر شارەزایی نەبوو.

2- خۆپاراستن، مەست ئەوەیە، هیچ بەڵگەیەک نییە بۆ ئەوەی بزانین کە زەربەی خواست یا زەربەی خۆپاراستن، بەهێزترە.

لەبەرامبەر تیژی ئەو شمشێرەدا بوەستێ
شمشێری میخائیل، زۆر بەهێز بە شمشێری ئەهریمەن کەوت
دابەزیە خوارەوە نەوەستا بەڵکو خێرا سووڕایەوە
تەواوی شمشێرەکەی بردە خوارەوە لای ڕاستی کەرت کرد
بۆ یەکەمینجار بوو ئەهریمەن هەستی بە ئازار بکات
دەستی بە لەنگینەوە کرد بۆ پێش و بۆ پاش دەچوو
ئازاری شمشێری پەلدەری میخائیل زۆر توووند بوو
برینێکی کونبەدەری لە جەستەی کرد و بەناویا سووڕایەوە
بەڵام مژادی ئەهریمەن هەوایی بوو
ئەوەندەی نەخایاند ساڕێژ بوو و یەکی گرتەوە، جۆبارە خوێنێکی[1]
نوکتاری هەڵپژا

## 34

- فریشتەکانیش ئاوا خوێنیان لێدێ –
زرێکەی شەلالی خوێن بوو،پاش ئەوەی کەتروسکەی دەداو دەگەشایەوە
ئاپۆڕەی فریشتە بەهێزەکان، ئەوانەی کە داکۆکیان لێدەکرد
لە هەموو لایەکەوە تاویاندا تا ڕزگاری بکەن
هەندێکیان بڵندیان کرد و هاووێشتیانە سەر زرێی خۆیان و
گەڕاندیانەوە ناو پەیتوونەکەی خۆیەوە
کە دوور لە سەفی جەنگاوەرەکان وەستا بوو
لەبەر ئازارو ڕق و شەرمەزارییەوە، ددانی بەسەر یەکا دادەقرەسان
بۆی بەدیارکەوت کە تاقمەند نییە، کە بینی گەورەییەکەی بەو سزایە،
ڕیسوا کراوە

1- جۆباری خوێن، هومیرۆس لە ئە لیادەدا ئاوا وەسفی برینی دەستی ئەفرۆدیتی کردوو
ە، ملتون لەوی وەرگرتووە.

ئەو  متمانەی لەقی، کە پێی وابوو، هێزی ئەو وەك هێزی ئاسمان وایە
هەرززو برینەکەی سارێژ بوو

## 35

چونکە ڕۆحەکان، بە هەموو بەشەکانییەوە بە زیندوویی دەژین
وەکو مرۆڤ لاوازنین، بە گەدە و هەناو و دڵ و سەرو جگەر و گورچیلە بژین
ئەوان نامرن، تەنها ئەگەر فەنا ببن
برینی کوشندە کیانی شلەی ئەوان ناپێکێ، وەك چۆن هەوا ناپێکری وایە
کیانی زیندووی ئەوان هەمووی دڵە
هەموو کیانی ئەوان، سەروچاوو گوێ و زمین و هەستە
لەهەموو لایەکانیدا، چۆنی بوێ وادەگۆڕێ
چی حەز لێبێ بۆخۆی، لە ڕەنگ شێوەو قەبارە، وەریدەگرێ
هەموو ئەوانەش، لە کیانێکی چڕو تێکچڕژاودا
لەوکاتەدا کارێ هاتە پێش کە شایانی باسکردنە
گابرێل بە هێزی گەورەی خۆیەوە، کەوتە شەڕو کوشتارەوە
خۆی کوتایە ناو ڕیزەکانی مولوکی پاشای دڕەندەوە
مولوك بانگێشتی ئەوی کرد بۆ شەڕ، هەڕەشەی ئەوەی لێکرد
کە لە پێچەکەکانی داشقەی خۆی دێخێ
نەك هەر ئەوە، تاکە گەورەی پیرۆزی ئاسمانیشی لەکەدار کرد
زمانی لە زەندەقە نەکەوت، بەڵام هەرزوو تا ناوەندی جەستەی، بوو بە دوو پارچە
چەك و تفاقەکانی وردو خاش بوون، ئازارێکی سەیری تووش هات
دەینەڕاندو لە پێکەوت، لە هەردوو لاوەش ئوریل و روفائیل دوژمنیان بەزاندبوو
هەرچەند زەبەلاح بوون و خۆیان لەناو زرێی بەردی ئەڵماس، پەنادابوو

## 36

ئەدمرمالك[1] و ئەسمادیان شکاندبوو، کە خاوەنی عەرشی بەهێز بوون
رەتی ئەوەیان دەکردەوە کە پایەیان لە پایەی ئاسمان، کەمتر بێت
بەڵام هەڵاتن و ڕاکردن فێری خاکەڕایی کردن
دوای ئەوەی کەبرینی قوول و ترسناك، ئەوانی شپرزە کردبوو
ئەو برینانەی کە لە زرێ و ئەڵقەکاندا چووبووە خوارەوە
ئەبدئیل ئەوەشی فەرامۆش نەکرد، کە هێزش بکاتە سەر ئاپۆڕەی
هەڵگەڕاوەکان
وەشانی خۆی بۆ سەر ئارئیل[2] و ئاریوکدا[3] دوو هەندە لێکرد
رائیل[4] ی دڕندەی زەلیل و ڕیسوا کرد و سووتاندی، زۆر خراپ وردوخاش بوو

## 37

بریا دەمتوانی هەموو هەواڵی هەزارانی ترت، بۆ بگێڕمەوە و ناویان لەزەوی
نەمر بکەم
بەڵام ئەو هەڵبژاردانە بەوە ڕازین، کە تەنها لە ئاسماندا ناویان بڵاوبێتەوە
داوای ستایشی مرۆڤ ناکەن، بەڵام پۆلەکەی تر، لەگەڵ ئەوەش
کە هێزوتواناکان و هەمەڕنگی کوشت و کوشتاریان سەیر بوو
هەرچەندە لە ڕووی حەماس و ناوداریان، لەوان کەمتر نەبوون
هەر هەموویان لە ئاسمان ولە تۆماری یادەوەری پیرۆزمەندیدا دەرکران
دەبا بەبێ ناو ئاوابن و بچنە ناو شەوەزەنگی لەبیرچوونەوە

1- ئەدەمالک پاشای بابلی بوو، هەموو جارێ کورەکانی خۆیان بۆ دەسووتاند.

2- ئەرئیل، واتە فریشتەی خراپە و خوای وەسەنییەکان.

3- ئەریوک بە مانای وەک شێر دێت.

4- رائیل، بە مانای برووسکەی خوا دێت، لە ئاسمان دابەزی تا لەزەویدا زەماوەند لە گەڵ کچانی مرۆڤ بکات.

ئەگەر هێز لە ڕێگەی ڕاست و دادپەروەریدا لایدا، شایانی ستایش نییە
شایانی هیچ شتێ نییە، جگە لە سەرشۆڕی و شەرمەزاری
چونکە ئەوانە تەماحی گەورمییان هەیە، بە شانازییە بەتاڵەکانیانەوە
داوای ئەوە دەکەن کە بە کاری چەپەڵی خۆیانەوە، بەباشی باسیان بکەن
با بێدەنگی ئەزەل چارەنووسیان بێت
دوای ئەوەی کە بەهێزترینییان کوژایەوە، ئاراستەی شەڕەکە گۆڕا

## 38

لە بەر زۆری هێرش کردنەکەوە، خوێنێکی زۆر ڕژا، شکستی شپرزەو
هەراوزەنای توندە تیژ بەدیار کەوت و زەوی بە زرێی وردوخاشکراو داپۆشرا
داشقە و داشقە چییەکان و ئەسپە ئاگرینەکان بوونە کەف
کەڵەکەی سەر یەك بووبوون، ئەوانەی مابوون بە ئاستەم هێزی بەرگریان مابوو
هەر هەموویان پاشەکشەیان کرد، بۆ ناو دڵی ئاپۆڕەی ئەهریمەن
بەڵام کە لەناکاو، تووشی ترسی زەردهەڵگەڕاو دەبن
- بۆ یەکەمین جار لەناکاو ترسیان بۆ دێت و هەست بە ئازار دەکەن -
بەشەرمەزاری ڕادەکەن، ئەومیش ئەو چارەنووسە خراپەیە
کە گوناهی هەڵگەڕانەوە لە ئاسمان، هێناویەتی

## 39

هەتا ئەو ساتەش نەیاندەزانی ترس و ئێش و ڕاکردن چییە
جیاوازییەکی زۆرهەبوو لە میانی ئەوان و فریشتە پاکەکان
ئەوانەی لەیەکدەستەی شەشپالوویدا[1]، هەنگاویان بۆ بۆ پێشەوە دەنا

1- شەشپالو ، رەمزی چاکەو باشی و هێمنییە، لە میتۆلۆژیا دێرینەکان..

پارێزراو بوون، هیچ چەکێ نەیدەتوانی ڕیزی ئەوان ببەزێنێ
ئەوەش ئەو سیفەت و بەشی گەورەی پاکی ئەوان بوو، کە لە دوژمنان جیای دەکردنەوە
چونکە ئەوان نە گوناهیان کردبوو، نە هەڵگەڕابوونەوەش
ئابەمجۆرە سەلماندیان، کە نە بێزار دەبن و نە هەست بە ئازاری برینەکان دەکەن
هەتا ئەگەر لە شوێنی خۆیانەوەش، بە خورتی پاشەکشەیان پێبکەن

## 40

ئێستاش وا شەو دەستی پێکردو بە زوڵمەتی خۆی ئاسمانی داگرت
شەڕ وەستانێکی خواستراو و پەسەندی، فەرزی سەر جەنگاوەرەکان کرد
هێمنیشی بەسەر مەیدانی گەنیوی جەنگدا هێنا
لە ژێر پەردەی هەوروهێزی ئەو جەنگەوە، هەردوولا پاشەکشەیان کرد، هەم سەرکەوتوو وهەم شکستخواردوو، لەسەر ئاستی شەڕەکە
میخائیل و فریشتەکان سەرکەوتن و ئۆردی خۆیان دامەزراند
پاسەوانییان دانا، کە بریتی بوو لە ئاگری شەپۆلبەندی فریشتەکانی شارۆبیم
بەڵام لەولاتر ئەهریمەن، لەگەڵ لایەنگرە هەڵگەڕاوەکانی ونبوون

## 41

گواستیانەوە بۆ دوورترین پەڕی تاریکی، ئەوەندەی نەخایاند، تا بحەسێتەوە کە ئەهریمەن بانگێشتی گەورەکانی کرد، بۆ دانیشتنی[1] ئەنجوومەنێکی شەوانەو
لە ناوەندیانا هەڵسایەوەو گووتی:

---

1- دانیشتنی ئەنجوومەنی شەوانە، ئەوەیان لاسایی کردنەوەی هۆمیرۆسە لە ئەلیادە، کاتێ ئەگامەمنون داوای کۆبوونەوەی شەوانەی کرد، دوای بەزینی هیکتور.

ئەی هاوڕێ نزیکەکان، بەڕاستی لە ساتی مەترسیدا، شەڕێکی باشتان کرد
زانیتان کە هیچ شتێ نییە بەسەر چەکەکانتان ، زاڵ بێت
بینیتان کە ئێوە نەك هەر شایانی ئازادین و بەس، کە ئەوە ئاسانترین داوایە
بەڵکوشایانی ئەومن، کە ئارەزووی خۆتان بەدەست بهێنین، کە بریتیە لە شەرەف و دەسەڵات و شانازی و ناوبانگ
رۆژێکی تەواو خۆمان بەرامبەر جەنگێکی رکابەرئامێزدا، ڕاگرت
- ئەگەر ئێمە ڕۆژێك خۆمان ڕاگرتبێ، ئەی بۆ تاهەتایە خۆمان ڕانەگرین ؟

## 42

ئەوەی کە خوداوەندی ئاسمان ناردبووی، تاشەڕی ئێمە بکەن
بەهێزی بەهێزەکانی دەوروبەری عەرش بوون
بەڕای من، ئیدی ئەوان دەست لەوکارە هەڵدەگرن، کە بمانخەنە ژێر ڕکێفی خۆیانەوە
بۆیان سەلما کە هەڵە و گەلۆرن، بەدیاریش دەکەوێ، کە لە ئایندەشدا بێ هەڵە نابن
بۆمان هەیە ئاوا زەن بکەین، هەتا ئێستاش ئێمە وامان دەزانی ئاگادری هەموو شتێکن
لەڕاستیدا چەکەکانی ئێمە لاوازتر بوون و زەرەرمەند بووین
بەڵام بەرگەی ئازارەکانمان گرت، کە پێشتر ئەوەمان نەدەزانی
بەڵام کە زانیمان، ئەوکات بێزمان لێکردەوە،
ئێستاکە ئێمە دەزانین کە کیانی ئاسمانی ئێمە
برینی قووڵیش پێی ناوێرێ و لەناوناچێت، هەرچەندە بپێکرێ بە پێکرانێکی کونبەدەر

## 43

هەرزوو برینەکان سارێژ دەبن وهێزی ئەسڵی خۆمان چارەسەریان دەکات
کەواتە بزانن و بیر لەوە مەکەنەوە چونکە چارەسەری ئاسانە
ئەگەر خۆمان بۆ ئەوان ، بە چەك و تفاق باشتر.تەیار بکەین
لەوانەیە لە بە یەك گەیشتنی داهاتووماندا، پایەی خۆمان بەرزبکەینەوەو
دوژمن ببەزێنین، ئەوکاتە یەکسان دەبین، لەگەڵ سەرکەوتنی پێشووی ئەوانەوە
ئێمە هەمووومان  بە سروشت وەکو یەکین، تەنها ئەگەر هۆیەکی شاراوە هەبێ
بۆ سەرکەوتنی ئەوان، بەڵام ئەگەر بتوانین پارێزگاری لە دروستی زمین و
ئەقڵی خۆمان بکەین، ئەوە بە لێکۆڵینەوەو گفتوگۆی پێویست
ئەو نهێنیە ئاشکرا دەکەین

## 44

ئەمەی گووت و دانیشت، پاشان نەسروخ[1]
کە لەدوای ئەوە لە ئەنجوومەن هەستایەوە
ئەو لە پێش هەموو خاوەن ئیمارەتەکانەوەیەو بە شێوەیەك وەستا
کە شێوەی  وەستانی ئەو کەسانە بوو، لە جەنگدا ڕایانکردبێ، بەزیو و بە ئازاربن
چەکەکەشی وردوخاش بووبووێ، دەستی پێکردو وەڵامی دایەوە و گووتی:
ئەی ئەو کەسەی رزگارمان دەکەی لەدەست تازە گەورەی ئاسمان
ئەی ڕابەری هەوڵ و تەقلای ئێمە، بۆیە دەست هێنانی مافی خۆمان وەك ئەرباب
ئەوە ئەو کوشتارە زۆر سەختە، هەتا بۆ ئەربابەکانیش، ئەوانە بۆ ئەمە لێوەشاوە نین

---

1- نەسروخ، بتی ئاشوری بوو، کە سەنحاریب سوژدەی بۆ دەبرد، بە عیبری بەمانای هەڵاتن و ڕاکردن دێت دێ.

# 45

ئێمە شەڕی چەکگەلێك دەکەین، کە توانای ئەو چەکەمان نییە
هەست بەئازاردەکەین و شەر لەگەڵ کەسانێ دەکەین هەست بە ئازار
ناکەن
هەست بە چەژتن ناکەن، ئەنجامەکەشی هەز هیلاکبوون و لەناوچوونە
سوودی ئازایەتی و هێز چییە، ئەگەر ئێش و ئازار خامۆشی کاتەوە و ڕاوی
بنێت
ئەو ئێش و ئازارەی هەمووومانی خستۆیە ژێر ڕکێفی خۆیەوە
دەستی بەهێزترینی بەهێزان شلدەکات - ئێمە هاوتای ئازایەتی نین-؟
هەموو شتێ دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوەو دەستی بەهێزترینی بەهێزان شل
دەکات
ئێستاکە ئێمە دەتوانین خۆشی لە ژیان وەرگرین و سەرپێچی نەکەین
ژیانی بە ڕازی بوون دەژین، کە ئەوەش هێمنترین جۆری ژیانە
بەڵام ئێش و ئازار لووتکەی دەردەسەرییەو خراترین جۆری خراپەیە
ئەگەر سنووری ببەزێنی، گوریسی ئارامی دەپچڕێ
تەنها ئەگەر کەسێ هەبێ شتێ دابهێنێ
لە هێزی هێرش کردن بۆ سەر دوژمن و بەهێزتر بێت
ئەو دوژمنانەی کە تووشی هیچ برینێك نەهاتوون، تاوەکو ئێستا
یاخود بەو شتە داهێنراوەوە خۆمان چەکدارکەین، بۆ داکۆکی کردن لە
خۆمان
بەڕای من هەموومان قەرداری هەمان ئەو کەسە دەبین، کە ڕزگاریمان
بۆدێنێ

## 46

ئەهریمەن ئارامییەوە وەڵامی دایەوەوگووتی:
من داهێنانێکتان بۆ دەهێنم، لەو باوەڕەدام کە لەسەر هەقەو
بایەخێکی زۆری هەیە بۆ سەرکەوتنمان
ئێمە ڕووپەڕی بریقەداری ئەو قالکە ئەثیرییە دەبینین، کە لە سەری
وەستاوین
ئەو کیشوەرە لە ئاسمانی فراواندا کەبە ڕووەك میوەو گوڵەکانی فیردەوس
وبەردی گرانبەهاوفریز ڕازێنراوەتەوە، چاو تەنها ڕواڵەتی ئەو شتانە دەبینێ و
بەس
نازانێ ئەو ڕووەکانە لە کوێی ناخی زەویو لە مژادی سەرەتایی نادیار و
کەفی هەڵم و ئاگردا دەڕوێن و شین دەبن؟

## 47

ئەوە ئەگەر تیشکی ئاسمانیان بگاتێ و میزاجیان توندو پوند بێ
لقەکانیان گەش و جوان شین دەبن، دەڕوێن و بۆ ڕووناکایی
دەوروبەریان دەکرێنەوەو کەواتە لەم وێنە ڕەشانەی سەرەتایی قووڵایی زەویدا
کە ئاگری دۆزەخی تیا حەشاردراوە، هەمان ئەو شتانە دەردەهێنین
دەیانخەینە ناو بۆڕی بەتاڵی درێژ درێژو خڕ، کوتکی ئەستووری خۆی هەیە
ئەگەر لە کونێکی تریەوە ئاگر بگرێ، ئەوە بە توندو تووڕەییەوە
دادەگیرسێ
هەڵدەدەفێ و لە دوورەوە هاژەهاژی خۆی بە ئامێری وێرانکەر
بۆسەر دوژمن دەنێرێ ووەك ئەوەی هەورەتریشقە بێت، پارچە پارچەیان دەکات
هەموو ئەوشتانە دادەڕمێنێ کە ڕێگەی لێێدەگرێت

## 48

ئەوسا ئەوان واخەیاڵ دەکەن کە ئێمە، هەورەتریشقەمان لە تریشقەهاوێژ وەرگرتووە
کە ئەوە تاکە چەکی تۆقێنەرە، کارەکەمان ئەوەندە ناخایەنێ هەتا دروستی دەکەین
بەرلەوەی سپێدە دابێت، ئەوەی دەمانەوێ لە ناو دەستماندایە
بەڵام ئێستا بە ئاگاوەرن، ترسی خۆتان بتەکێنن
چونکە هەوڵ و بیروڕا ئەگەر بەیەکە بوون، هیچ سەختییەك نامینێ
هەروەها هیچ شوێنێ بۆ نائومێدی نامێنێتەوە!
لەقسەکانی خۆی بۆووەو دەروونی ژاکاوی هەموویانی شاد و ڕووناك کردەوە
ئەو داهێنانە هەمووی سەرسام کردن، هەموویان سەیریان پێهات
چونکە ئەو داهێنراوە زۆر ئاسان دیار بوو
دوای ئەوەی کە پەیدا بوو، هەرچەندە بەر لە داهێنانی، پێیانوابوو کە مەحاڵە

## 49

لەوانەیە ئەی ئادەم لە بەنی جنسی تۆشدا لە داهاتوودا
کەسانێ هەبن بیانەوێت زیان بگەیەنن، یاخود ئیلهام لە شەیتان وەرگرن
ئامێرێ وەك ئەو ئامێرە دابهێنن، بۆ جەنگ و کوشت و کوشتار
بەگوناهەکانیان مرۆڤ تووشی بەلا بکەن
دژایەتی و رق و قین بڵاو بکاتەوە لەو کاتەی کە جەنگ کوشت و کوشتار دەبێتە هیوایان

## 50

یەکسەر لە ئەنجوومەنەوە بەرەو کارکردن تاویان دا
کەس خۆی لە گفت و گۆو گەنگەشە نەدا
ئەو دەستانەی کە لە ژمار نەدەهاتن ئامادەو تەیار بوون، لەیەك ساتدا خاك و
خۆڵی ئاسمانییان هەڵدایەوەوناخی زەویان ئاشکرا کرد
لە ژێریەوە هەموو ڕەگەزەکانی سروشتیان، لە وێنەی سەرەتایی خۆیان بینی،
کەفی کبریت و زەیتی نیترۆنیان دۆزییەوەو تێکەڵ بەیەکیان کرد
بە هونەری پیشەسازی وردو گەرمی و وشك کردنەوە پۆدرەیەکی وەك
ڕەژوویان لێدەرهێنا، گواستیانەوە بۆ ئەنبارەکان
پاشان زەویان هەڵکۆڵی، دەمارەکانی کانزاو بەردی شاراوەیان دەرهێنا(
هەموو هەناوی ئەم زەوییە وەك یەکە)
ئامێرو گوللەی وێرانکەریان لێدروست کردن تیپێکیش
مزادێکەتەرناکیان دروستکرد، داگیرسانی خێراتر دەکرد بە ساودانی

## 51

ئا بەمجۆرە بەر لە گزنگی سپێدە، لە ژێر پەردەی شەوی بێداردابە نهێنی،
لە کاری خۆیان بوونەوەو ئامادە و ڕێککەوتن
بێدەنگی و پارێزی خۆیان پاراست، کەس پێی نەزانین
کە ڕووناکی جوانی ئاسمان بەدیارکەوت
فریشتە سەرکەوتووەکان لە خەو هەڵسان، کەڕەنای بەیانیبانگێشتی
چەکی کردن، هەموویان چەکیان هەڵگرت و تەیار بوون
وەك ئەوەی کە زرێی زێرینیان پۆشیبێت بە خێرایی ئاپۆڕەی ڕووناکی
فریشتان، دووبارە کۆبوونەوە
لەکاتێکا ئەوانی تر لە سەر گردەکان کۆبوونەوە
تەواوی دەوروبەر گەڕان وهەموو کەنارێك وهەموو سەرچاوەی چەکێکیان

بەسەر کردەوە
هەروەها هەموو ئەو شوێنانەی کە دوژمنی لێبوو

## 52

بۆ ئەوەی ببینن کە ئاخۆ، لەوێ ماون یا هەڵاتوون؟
تا بزانن کە ئاخۆ، لە جووڵە دان یاخو دوەستاون؟
هەرزوو بینیان دەستەیەك بەیداخی خۆی هەڵکردوەو
بەهەنگاوی هێدی و توندو پوند دەخشێت
زوفێل[1] لە دواوەڕا بە خێرایی کەوتە جووڵە، کە خێراترین باڵی شیروبیم بوو
بە هەڵفڕینەوە گەڕایەوە و بە ناو هەوادا، بەرز هاواری کردو گووتی :
ئەی جەنگاوەرەکان چەکەکانتان هەڵگرن بۆ شەڕی دوژمنان، نزیك کەوتۆونەتەوە
ئێمە وامانزانی ڕایانکردووە و تۆزێ لە بەدواکەوتنیان دەحەسێینەوە

## 53

وا خەیاڵ مەکەن کە ڕادەکات، من وەك هەورێکی چڕ دەیبینم
ویست خواستی بەڕاستی و متمانەی تەواوی بە ڕوخسارەوە دیارە
هەمووتان زرێی پتەوی خۆتان
بەدەوری جەستەتانەوە توند بکەن و خوودەی خۆتان لەسەر کەن
ئەوەی کە ئەمڕۆکە دەبارێ — ئەگەر بۆچوونم ڕاست بێ —
پڕووشە بارانێکی ئاسان نیە، بەڵکو ڕەشەبایەکی پڕ لە تیری ئاگردارە
ئابەمجۆرە ئاگاداری کردنەوە، ئەوان هەموو شارەزابوون و
هەرخێرا بەبێ هیچ تەگەرەیەك، خۆیان ڕێکخست
بەپەلەو بێ شڵەژان، خۆیان ئامادەکرد بۆ جەنگ

1- زوفێل واتە جاسووسی خودا ، بەلام لە تەورات باس نەکراوە.

## 54

دەستیان پێکردو چوونە پێشەوە
شێوەی ڕێکخستنەکانی شەڕوکوشتاریان وەرگرت
لەوێدا دوژمن بەدیارکەوت ، زۆر دوورنەبوو
بە هەنگاوی گران گرانەوە دەخشا
بە زەبەلاحی و تاوانی گەورەوە نزیك دەکەوتەوە
تۆپە شەیتانییەکانی خۆی بە وێنەی شەشپاڵووی بۆش ڕادەکێشا
لە هەموو لایەکەوە فەیلەقە چڕوپڕەکان، سێبەریان بەسەراکردبوون
هەتا فێڵەکە بشاردرێتەوە، هەردوو غەنیمەکان بۆ ماوەیەك
سەیری یەکتریان کرد
پاشان ئەهریمەن وەك سەرکردەی لەشکر بەدیارکەوت
بە دەنگی زرینگە ئاساو فەرماندەرانەی بەرزەوە گووتی:
ئەی سەربازە پێشڕەوەکان، بۆلای باکوورو بۆ لای چەپ، پەرش و بلاو ببنەوە
تا مەیدانی شەڕ بکرێتەوە، تا ئەوانەی تووڕەمان دەکەن،
ببینن کە ئێمە گۆرانی دەچڕین

## 55

ئێمە ئاشتی و هێمنیمان دەوێت، ئێمە بە دڵێکی کراوە
ئامادەین پێشوازییان بکەین
ئەگەر دەستپێشخەری ئێمەیان پێخۆش بێت و دوژمنایەتییان نەکردین
بەلام من گومانم هەیە لەوە، ئەی ئاسمان شایەد بە
ئەی ئاسمان شایەدیمان بۆ بدە، کە ئێمە دوای کەمێکی تر
ڕۆڵی خۆمان بەبێ هیچ تەگەرەیەك دەگێڕین
ئێوەش ئەی ئەو کەسانەی وەستاوون و تەواو تەیارن
ئەرکی خۆتان جێبەجێ بکەن

پەلەکەن لەوەی کە بڕیارە ئەنجامی بدەین، با دەنگ بەرز بێت
تا هەموو گوێیان لێبێت
هێندەی نەمابوو لە قسە ئاڵۆزەکانی ببێتەوە، بەرەی شەڕ بوو بە دوو بەش
بۆلای باکوورو بۆ لای چەپ، دیمەنێکی نوێ و غەریب کەوتە بەرچاومان

## 56

چەند ستوونێکی ڕیزکراو، لە سێ تەبەقەدا بەسەر پێچکەوە بوون
( لەشتێ دەچوو وەك قەدی درەختی بەڕوو و ساج، کە لق و پۆپییان بڕابۆوە
دوای ئەوەی لە دارستان و شاخەکان دەرکێشرابوون)
لە مسی زەرد و ئاسن و ئاگر دروستکرابوون، لوولەی دەمیان لە ئێمە
کردبوو
زۆر فراوان و ترسناك بوون، موژدەی ئاشتییێکی بۆشی دەدا
لەپشت هەر یەکێکیانەوە، فریشتەیەکی سارۆفیم وەستا بوو
دارێکی بەدەستەوە بوو سەرێکی ئاگربوو ، رایدەتەکاند
ئێمەش هەموو بە هێمنی وەستابووین
بەسەرسامییەوە چاودێریمان دەکردن

## 57

بەڵام ئەوەندەی نەخایاند کەهەموو دارەکان بۆ پێشەوە درێژ بوونەوەو
لە دەمی تەنگی ستوونەکان بە نزیك کەوتنەوە
بەنەرمی ساویانداو یەکسەر ئاسمان هەمووی بووە ئاگر
هەرزوو دوکەڵ دایپۆشی، کە ئەو ئامێرانە لە گەرووی قووڵیانەوە
هەڵێاندەڕشاند
هەروەها ئەو نەڕڕانەی کە ورگی هەوایان، بە زەنای خۆیان
هەڵدەدڕی و هەناویان هەڵزڕاند

لە دەمیانەوە پیسترین توخمەی شەیتانیان، لە دەمیانەوە دەهاتە دەرەوە
هەورەتریشقەو تەرزە، هەرئەوەندە، بەڵگو تۆپەڵی ئاسنین
بەسەر ئاپۆرەی سەرکەوتووەکاندا دەباری و بە توندی دەیکوتاندنەوە
بەهەریەکەکیان دەکەوت ، نەیدەتوانی خۆی لەسەر پێیەکانی ڕاگرێت
دەنا وەك بەرد خۆیان ڕاگرتبوو، ئابەمجۆرە هەزاران هەزار دارەمان
فریشتە بە فریشتەی گەورە دەکەوت لەسەر زەویدا
لەبەر گرانی چەکەکانیان دارەمانیان خێراتر دەبوو

## 58

خۆ ئەگەر گۆشەگیر بووانە، دەیانتوانی خۆیان لە تەقەمەنییەکان بپارێزن
چونکە ئەوانە ڕۆحگەلێك بوون، توانای ئەوەیان هەبوو
بە خێرایی بچنەوە بار یەك
یاخود دوورکەونەوە، بەڵام ئێستاکە زۆرخراپ پەرشوبڵاو بوونەتەوەو شکاون
نەیاندەتوانی ڕیزەکانی خۆیان کۆکەنەوە
چییان لەسەرە بیکەن؟ دووبارە هێرشیان بکەنەوە بەرپەچ دەدرێنەوەوە
جارێکی تریش زۆربە کرێتییەوە دەشکێن و دەڕمێنەوە
ئیدی زیاتر پەرش و بڵاو دەبنەوەوزیاتر دەبنە مایەی پێکەنینی دوژمنەکەیان
ڕیزەیەکی تری فریشتەیان بەرچاو کەوت، کە وەستا بوون
لە دۆخی ئامادەباشی دابوون بۆ ئەوەی دووبارە بە هەورەتریشقە
بکەونە تەقەوە
پاشەکشەیان کردو ئەگەر بگەڕابانەوەش خراتریان دەچەشت
ئەهریمەن بینی کە تووشی چ بەڵایەك بوونەتەوە

## 59

ئەهریمەن قسەی بۆ هاوەڵەکانی کردووگووتی:
ئەوە بۆچی ئەو سەرکەوتووە خۆبەزلزانانە، بەسەرمان دانادەن؟
کەمێك پێش ئێستا، زۆر بەدڕەندەیی بەسەریان دادەداین
لەوکاتەی ئێمە بە پاکی و بە ڕوخسارێکی گەش و دڵێکی کراوە
بەخێرهاتنمان دەکردن( لەوە زیاتر چیمان پێدەکرا؟ ) مەرجەکانی
ئاشتیمان
بۆ ڕاخستن، یەکسەر بیرو رایان گۆڕا
فرین و پاشان گەڕانەوە، بە غەریبترین شێوە هەڵیانکوتایە سەرمانەوە
وەك ئەوەی سەما بکەن، بەلاَم زێدەڕۆییان لە بزاوتی سەمای خۆیان کرد
بۆیە وابە دیارکەوت کە زۆر ڕەهاو شێتانە بوون
لەوانەیە لەبەر شادییان بووبێ ، سەبارەت بەو پەیمانی ئاشتییەی
بۆمان پێشنیاز کردبوون، بەلاَم من وازمن دەکەم
ئەگەردووبارە پێشنیازییان بۆ بکەینەوە ئەو گوێ دەگرن
ئەوکاتە  ناچارییان دەکەین کە پەلە بکەن بۆ ئەو پەیمانە

## 60

بلیئال بە ئاوازێکی فشەئامێزی وەك ئەهریمەنەوە گووتی:
ئەی ڕابەر ئەو مەرجانەی ئێمە ناردبوومان، گران و جەوهەردارو پتەوە بوون
وەها بە هێز بارگاوی کرابوون، گەیشتنە مەبەستی خۆیان
ئیدی سەرنجی هەمووانی ڕاکێشا، وەك چۆن بینیمان
زۆریانی خستە سەرلێشوانەوە، بەلاَم ئەوکەسەی کە ئەوەی بە ڕاست
وەرگرت
لە تەوقی سەرییەوە دەرکی پێکرد تا بنی پێی
بەلاَم ئەوەی تێینەگەیشت- ئەومیان( ئەوەشیان سیفەتێکی ترە)

بۆ بەدیار خستین، کە کەی دوژمنەکانمان بە وەرگەڕاوی دەڕۆن
ئابەمجۆرە وەستان و خۆشحاڵ بووبوون
تەماحگیر ببوون، هیچ گومانیان نەبوو لە سەرکەوتنی خۆیان
وایانزانی پیلەکردن لە گەڵ جەبەرووتی ئەزەلیدا
بە داهێنانەکانیانەوە، کارێکی زۆر ئاسانە

## 61

نەك هەر ئەمە بەلکو تیزیان بە هەورەتریشقەکەیە کرد
بە سەربازەکانی پێدەکەنین، کە بۆ ساتێ بە شڵەژوی وەستا بوون
بەلاّم ئەوەندە زۆر نەوەستان، دواجار تووڕەیی هانیدان وئەو چەکەیان دۆزییەوە
کە توانای ئەوەی هەبوو، ڕووبەڕووی ئەو بەلاّیە دۆزەخییە ببنەوە
یەکسەر ( سەیرکە ئاسمان چ وزویەکی بۆ فریشتە بەهێزەکان نارد )
چەکەکانی خۆیان فڕیداو چوونە سەر گردەکانەوە
( ئیدی زەوی ئەو هەمەڕەنگییەی لە ئاسمانەوە وەرگرت —
هەموو مایەی شادییەکانی خۆی، ناردە ناو گردۆلکەو دۆڵەکان)
بە خێرایی بروسك تاویان دا، هەڵفڕین و لە بنەڕەتەوە هەژاندیان
تەواوی گردۆلکە ڕەگاژۆکانییان، بە هەموو ئاوو دارستانەوە دەرکێشا

## 62

دەستیان بە سەر لوتکە تۆزاوییەکاندا گرت
بەرزیان کردەوە هاوێشتیانە سەر دەستیانەوە
دڵنیابە ترس و سەرسامی بەسەر ئەو ئاپۆرە هەڵگەڕاوەدا زاڵبوو
کە بینیان ئەو دیمەنە ترسناکە لێیان نزیك دەبێتەوە
دیمەنی  هەناوی چیاکان، کە سەرەوژێر ببونەوە
بە هەرسێ چینەوە هاوێشترایە سەر ئامێرەکانیانەوە

بنیان ڕایماڵین و هەموویانی حەشاردا، هەروەها متمانەی
گەورەی ئەوانیان بینی، کە چۆن لەگەڵ ئەو ئامێرانەوە
لەژێرگرانایی چیاکاندا، لە قووڵاییدا دەفن کران

## 63

پاشان کە خۆیان بینی کەوا، هێرش دەکرێتە سەریان
چیای پتەویان بەسەردا دەبارێ، چیا سێبەری بەسەردا هەڵخستن و
ئەو چیایانە بەهەموو گرانییەکی خۆیانەوەوە
کەوتە سەر دەستەیەکی چەکدارو هەر هەمووی داپۆشین
ئامێرەکانی خۆیان، ئازارێکی زۆری پێ گەیاندن
بەسەرخۆیاندا وردوخاش بوون

## 64

هەموویان لە نێو ئەو ئامێرانەدا بەند بوو بوون و ئازارێکی زۆریان چەشت
قورسایی ئەو ئامێرانە بەسەریانەوە سووك نەدەبوو
ناڵەو هاواری ئازاریان زۆر بوو
زۆر هەوڵیاندا خۆیان لەژێر ئەو گرانایيە ڕزگار بکەن
تا توانیان ڕزگاریان بێت
هەرچەندە ئەوانە فریشتە بوون، لە نووری پاك- سەرەتا پاك بوون —
بەڵام گوناە کیانی ئەوانی پیس و شێلووکردبوو

## 65

لەشکری ئەهریمەن ڕایانکردو دەستیان دایە هەمان چەکی ئەوانەوە و
گردۆلکەکانیان لە خاك دەرکێشا، ئیدی لە هەوادا
گرد بە گرد دەکەوت، بۆ پێشەوەو پاشەوە، بەهێزێکی تۆقێنەر
ڕادەوەشێنران

لەژێر زەویدا بە تاریكی تۆقێنەر دەجەنگان
هەراوزەناكە دۆزەخی بوو، ئەگەر جەنگەكە بەراورد بكرێ بەو
توندوتیژییەوە
وەك گەمەیەكی شارستانی وابوو
تێكەڵبوونە ترسناكەكە ، كەڵەكەی سەر تێكەڵبوون دەبوو و
سەرهەڵدەگەڕا
هەر ئەوەتا ئاسمان شەقی نەدەبرد، وێرانیی هەموو شتێكی دادەپۆشت
ئەگەر باوكە گەورە نەبووایە، كەبەسەر عەرشی ئاسمانەوە بوو
پێشتر دەیزانی ئەو زەنایە دەقەومێ، لەسەروبەندی ئەو كارەی كۆڵییەوە
ئەو هەرخۆی بوو، دوای تەگنیر مۆڵەتی ئەوەیدا كە ڕووبدات
تا ئامانجی مەزنی خۆی بەدی بهێنێ

## 66

ئەویش بۆ ئەوە بوو تا تاقانەكەی، شانازی ئەوەی پێ ببڕێ
كە تۆڵە لە دوژمنەكانی بكاتەوە، پاشان تەواوی دەسەڵاتەكانی بداتێ
ئینجا قسەی لەگەڵ تاقانەو شەریكی عەرشی خۆی كردو گووتی:
ئەی درەوشانەوەی گەورەیی من، ئەی تاقانەی خۆشەویستم
ئەی ئەو كەسەی كە لە ڕوخساری نادیاریدا، پایەی خوداوەندێتی من دەبینرێت
ئەی ئەوكەسەی، كە هەر بڕیارێ من دەیدەم، ئەو جێبەجێی دەكات
ئەی دووهەمین توانامەندی هەمەكی، ئەوە دوو ڕۆژ تێپەڕی
دوو ڕۆژ بە حسێبی ئاسمان ، هەر لەوكاتەوەی
كە هێزی میخائیل چووە بۆ دەستەمۆكردنی ئەو هەڵگەڕاوانە
كوشت و كوشتارەكە ئازاربەخشە، ئازاربەخشیش دەبێت

## 67

کاتێ ئەو دوو غەنیمە بەیەك گەیشتن، من وازم لێهێنان تا بجەنگن
وەك خۆت دەزانی، من یەکسانم کردوون لە ئەفراندن
تەنها ئەوانە نەبێت، کە گوناه ئەوانی لەوتاندووە
هەرچەندە هەست بە پیسبوونی خۆیان ناکەن، چارەنووسیانم دواخستووە
بەردەوام دەبن لە کوشتارو کۆتایی نایەت و چارەسەرێ نادۆزنەوە
جەنگ هێزی ئەوانی لاواز کردووە، ڕێیان بۆ فەوزا بەرهەڵاکردووە
هەردوولا چەکی چیاکانیان دەست داوەتێ و شڵەژانیان لە ئاسمان وروژاندووە
هەڕەشەی مەترسی لە کەون دەکەن، دوو ڕۆژ تێپەڕیوە سێهەمییان بۆ تۆیە
بۆتۆم بڕیار لێداوەو مۆڵەتم داوە، تا ئەو شانازییە بۆ تۆ بێت

## 68

ئەو شەڕە گەورەیە بەتۆ نەبێت، بەکەس نابڕێتەوە
شانازی هەموو چاکەکانم هەڵپڕژاندۆتە ناخی تۆوە
بۆ ئەوەی هەموو خەڵك لە ئاسمان و لە دۆزەخ ئەوە بزانن
کە هێزی تۆ نموونەی نییە
کاتێ بەسەر ئەو هەراوزەنایە لەفتیوە زاڵ دەبیت
ئەوسا بەدیار دەکەوێ، تۆی شایستەترین میراتگری هەموو شتێك
شایستەترە بۆ تۆ کە ئەو میراتگرو پاشایە بیت، کە من پیرۆزم کردووە
ئەوەیان مافی ڕەوای تۆیە

## 69

کەواتە بڕۆ تاو بدە، ئەی بەهێزترینی بەهێزەکان – بەوهێزە ئاسمانیەی لە تۆدایە -
سەرپەیتوونەکەم کەوەو بەخێرایی لێخووڕە، ئەو پەیتوونەی بناغەی ئاسمان

دەلەرزێنێ
هەموو تفاقەکانم بهێنە، هەموو کەوان و هەورتریشقەکانم، چەکە گەورەکانم بکە بە زنار
شمشێرەکەم لە کەمەری بەهێزت ببەستەو ڕاوی کوڕانی تاریکی بنێ و هەموویان لە تخووبی ئاسماندا دەربەڕێنە و وایان لێبکە بزانن
وەستانەوە بە ڕووی ئاسمان و ئەو مەسیحەی ئاسمان پیرۆزی کردووە چییە؟
ئەوەی گووت و ڕاستەوخۆ تیشکەکانی خۆی بۆتاقانەی خۆی نارد

## 70

هەموو درەوشانەوەیەکی بەسەردا درەوشاندەوە، تا هەموو ڕووناهی ئاسمانی وەرگرت
ڕوخساری بە نوورێکی وەها گەش ڕووناك کردەوە کە وەسف ناکرێت
ئینجا تاقانەی وەلامی دایەوە گووتی: ئەی باوکە، ئەی بەرزترین عەرشی ئاسمان
تۆ یەکەم بەرزترین و پیرۆزترین وەمەزنترینی، هەمیشە تاقانەی خۆت گەورە دەکەیت
منیش هەمیشە گەورەیی تۆم دەوێت، ئەوەیان تەواوی دادپەروەرییە
بەلام من شانازی و بەختەوەری خۆم، لەوەدا دەبینم کە تۆ لە من رازی بیت
ئەوا ویستی تۆ هاتە دی و بەدیهێنانیشی پیرۆزی منە

## 71

من هەموو ئەو شتانەی کە لە سۆڵجان هێزدا بەمنت بەخشیوە هەڵدەگرم
بە بەختەوەرییەکی گەورەتر دەیانگەڕێنمەوە
لە دیماهیدا هیچ شتێ نامینێتەوە ، ڕوخساری تۆ نەبێت، تاهەتایە لە تۆدا دەژیم
هەموو ئەوانەی خۆشت دەوێن لە مندا دەژین

بەڵام ئەوانەی تۆ ڕقت لێیانە[1]، منیش ڕقم لێیانە
دەتوانم بەرگەی هەموو ترس و نەرم و نیانی تۆ بگرم
من لە هەموو شتێکا وێنەی تۆم، ئەوەندە نابات
کە بە گەورەیی تۆوە تەیار دەبم و
ئاسمان ڕزگار دەکەم لەو هەڵگەڕاوانەو هەموویان تووڕهەڵدەدەمە
ناوگۆڕی خراپەو خراپەکاری، بۆ ناو کۆت و زنجیری تاریکی
لەگەڵ ئەو مارەی کە قەت نامرێ ، ئەو شوێنەی کە بۆیان ئامادەکراوە

## 72

خۆ ئەگەر گوێڕایەڵی تۆبان و تۆیان پەرستایە، ئەوە بەختەوەر دەبوون
ئەو کاتە هەموو قەدیسەکانت لەو چەپەڵانە جیادەبوونەوە
بەسەر چیا پیرۆزەکەتەوە دەسووڕانەوەو درووديان بۆ دەناردی، ڕاستترین درووود
منیش لە سەرووی هەمووانەوە، ئەمەی گووت و بەسەر سۆلجانەکەیا لار بۆوە
ئینجا لە لای چەپی شکۆدارییەوە، کە لێی دانیشتبوو، هەڵسایەوە
سێهەم سپێدەی پیرۆز، دەستی بە دروشانەوە کرد
ڕووناکی سپێدە لە ئاسماندا گزنگی دا، بە دەنگی ڕەشەبایەکی
گێژنئامێزەوە
بە پەیتوونی ئاسمانەوە تاویدا

## 73

زمانەی ئاگرێکی بەگووڕ تیشکی دەدایەوە
ئەو پەیتوونە، چەند پێچکەیێکی یەك لەناویەکی هەبوو
هیچکەسێ  لێی نەدەخوڕی، هەرخۆی لە خۆیدا، دڵی لێیدەدا

1- بەڵام ئەوانەی تۆ رقت لێیانە، لە زەبووردا هاتووە، خوایە ئەوانە دەبوغزێنم کە تۆ دەبوغزێنن، رقم لەوانەیە، کە بەربەرەکانێت دەکەن.

چوار کەس لە وێنەی شارۆفیم خاوەنداریێتیان دەکرد
هەریەك لەوانە، چوار ڕوخساری سەیری هەبوو
جەستەو باڵەکانیشان چاویان هەبوو، دەتگووت ئەستێرەن
بەڵام پێچکەکان، چاویان لە بەردی زەبەرجەد بوو
لە نێوانیانا ئاگرێکی خێرا هەڵدەڕژاو گومەزێکی ئاسمانی بەللوریان بەسەرەوە بوو
کورسییەك لە یاقووتی شینی ڕازاوە
بە عەنبەری پالاوتەو ڕەنگەکانی پەلکە زێڕینەی تیا بوو

## 74

بەڵام تاقانە، زرێیەکی ئاسمانی، تەیار بە بەردی درەوشاوەی ئوریم[1]، پۆشی بوو
زرێپۆشێ کە ئاسمان بۆی داڕشتبوو، کە سواری پەیتوونەکە بوو
لەلای چەپییەوە - فیکتۆریا [2]- بەخۆو بە باڵی بازینییەوە دانیشتبوو
کەوان و خورجینی تیرەکانیشی لە تەنیشتییەوە بوو
سێ تیری گەواڵە هاوێژی[3] تیا بوو
بەچواردەوریشیا ئاگرێکی هەڵچوو و ڕقێکی تۆخ و

---

1- بەردی درەوشاوەی ئۆریم، بەردێکی بەنرخەو دەگمەنە و بریقەدارخۆرەتاوییە، لە سیفری دەرچوون باسکراوە، -28 30

2- فیکتۆریا ، خوای سەرکەوتن بوو لە لای رۆمانییەکان، هەمیشە بەوێنەی باڵی باز دەبیندرێت، باز مەلی جوبیتێر بوو، پاشان بووە رەمزی گەورەیی پاشایەتی، ملتۆن لێرەدا باڵی هەلۆی بەخشیوە بە باز. ئوریم بەردێکی خۆرەتاوییە.

3- لە کتێبی پیرۆزدا واتە ئینجیل هاتووە ، کە یەهووە تیری هەورەتریشقەی هەبووە، بەلام میلتون لێرەدا هێما بۆ جوبیتێر دەکا، لە شەڕەکانی دژی فەلامەرزەکان.

چرە دوكەڵێك هەڵدەقولا، هەڵقوولانێكی وەحشییانە
دەهەزار فریشتەی لەگەڵدابوو، لە دوورەوە بە درەوشاوەیی، ڕێیان گرتبووە بەر
هەروەها بیست هەزار عەرەبانە[1] دەبینرا – ئەو ژمارەیەم بەخۆم گوێم لێبووە
-
عەرەبانەی ئاسمان، نیوەی لە لای چەپ بوو، نیوەكەی تریش، لای ڕاست
پاشان چووە سەربالّی شیرۆبیم و بەرزی ئاسمانی كریستالّی بووەوە
بەسەر كورسی یاقووتی شینەوە دانیشت، هەرچەند بۆ نزیك و دوور دیار بوو
بەڵام كە لایەنگرانی، كە ئەوان یەكەمین كەس بوون بینیان
تووشی شادییەك هاتن قەت بیریان لێنەدەكردەوە

## 75

بەیداخی مەزنی مەسیح درەوشایەوە، فریشتەكان ئەو بەیداخەیان
بەرزیان ڕاگرتبووو كە نیشانەی تاقانەی ئاسمان بوون
پاشان میخائیل خۆی و لەشكرەكەی گەڕانەوە لای ئەو، مەسیح تا
ڕابەرایەتییان بكات
سەربازەكانی خۆی دابەشكردە سەر دوو باڵ
لە ژێر سایەی ڕابەرەكەیاندا، هەر هەموویان لە یەك كەسدا بەرجەستە بوون
هێزی ئاسمانی ڕێگەی پێشەوەی بۆ تەخت كردن
هەر بە فەرمانی ئاسمانیش، هەموو گردو بانە دەركێشراوەكان
گەڕانەوە شوێنی خۆیان، دەنگەكەیان بیست و گوێڕایەڵییان كرد
ئیدی ئاسمان، ڕوخساری سروشتی خۆی وەرگرتەوە
گردو دۆڵەكانیش، بە گوڵی ناسك و تەڕ كەوتنە بزەوە

1- وشەی عەرەبانە لە دەقەكانی عەرەبیدا زۆر بەكارهاتووە، منیش لە جیاتی ئەم وشەیە یا ئەوەتا داشقەم بەكار هێناوە یا پەیتوون و هەندێجاریش عەرەبانە.

## 76

که دوژمنه بێزارو خەمبارەکان، ئەومیان بینی، دڵیان پڕ قین بوو
هێزەکانیان بۆ شەڕێکی دژوار و گەلۆرانە کۆکردەوە
نائومێدی ئومێدی بۆ دروست کردن
چۆن دەبێ ئەو ڕۆحە[1] ئاسمانیانە وا سەرکێش بن
ئایا نیشانەکان، ئەو خۆبەزڵزانانە دەهێننەوە سەرهۆش؟
یا ئایا پەرجۆکانی دڵی ئەو دژوارمەندانە[2] نەرم دەکات؟
دڵڕەقی ئەهریمەن زێتر بوو، پێی باشترنەبوو، خۆی چاك بکەنەوە
بۆیە بۆ گەورەیی و شانازمەندی خۆی، خەم و خەفەت دایگرت
دیمەنەکە حەسودی ئەوی وروژاند و تەماحی ئەوەی بوو لەو بەرزتر ببێتەوە

## 77

دیسانەوە بە دژوارییەوە دەستی داوە چەکەکانی جەنگییەوە
وای خەیاڵ کرد کە بە فێڵ و هێز، دەتوانێ سەرکەوتن
بەسەر ئاسمان و مەسیحدا، وەدەست بێنێ
یا ئەوەتا دەکەوێتە ناو خەرمندی هیلاك بوونی تەواوەوە
ئابەمجۆرە خۆی بۆ جەنگی کۆتایی ئامادەکردوشەرمی بەوەبوو ڕابکات
یاخود وەك ترسنۆکەکان ڕابکات
ئەلێرەوە تاقانەی ئاسمان، بەرەو لای هەموو سەربازەکانی چوو، لە هەردوو لاوە
و قسەی بۆ کردن و گووتی:

---

1- رۆحی سەرکێش، هێمایە بۆ ئەنیادەی فیرجیل، کە سەرسام دەبێت بە جونۆی شاژنی ئاسمان و دەڵێ چۆن ئەو رۆحە ئاسمانییانە بەو هەموو دڵرقیەوە بن وا پیلەبەندی بکەن.

2- دژوارمەند، هێمایە بۆ ئەوەی کە موسا نەیتوانی، فیرعەونییەکان ئیقناع بکات، بەڵکو دڵیان رەقتر بوو.

له شوێنی خۆتان بەبێ جووڵە، لە ڕیزە پڕشنگدارەکانی خۆتان بوەستن
ئەی پاقژەکان، لێرە بوەستن، ئەی فریشتە چەکدارەکان، ئەمڕۆکە
بحەسێنەوە
لەو جەنگەتاندا نیەتی ئێوە ڕاست بوو، ئاسمان قبووڵی نییەتی ئێوەی کرد

## 78

ئازایەتیتان لە پێناوی هەقدا نواند، ئەوەندەی کە پێتان کەوت
ئەوەندەشتان لەواندا، ئێوە هەر نەبەزین، بەڵام سزای ئەو
کۆمەڵە نەفرەت لێکراوە، دراوەتە دەستێکی دیکەوە، تۆڵە بەدەست ئەوە
یاخود بەدەستی ئەو کەسە دەبێت، کە ئەو داوای لێدەکات
وای بڕیارە کە ئەو کۆمەڵەیە، بەشی نەبێت لە کاری ئەمڕۆکەدا
بۆخۆتان بوەستن و ببینن[1]، کە چۆن تووڕەیی خوا
بەسەرئەو هەڵگەڕاوانەدا هەڵدەڕێژم

## 79

ئەوانە ڕقیان لە ئێوە نابێتەوە ، بەڵکو ڕقیان لە من دەبێتەوە
سەبارەت بە حەسوودی ئەوانەوە، بە من و لە سۆنگەی تووڕەییان، هەر لەبەر
ئەوەی
باوك لە ئاسمانە بەرزەکانەوە، کە خاوەنی موڵك و هێزو گەورەیی و
شانازمەندییە
خواستی ئەوە بوو، داوا لە من بکات لە ناویان بەرم
هەروەها ئارەزووی ئەوانەیش بهێنمە دی، کە دەیانەویست
ڕووبەڕووبووی من ببنەوە، لە مەیدانی شەڕدا

1- بوەستن و ببینن، هێمایە بۆسیفری دەرچوون-14 4 کە مووساداوای لە بنی سەراییل کرد، کە بە بێ جووڵە بوەستن، تا شکستی دوژمنەکانیان ببینن.

هەروەها ئەوە بە چاوی خۆیان بەدیکەن، کێ لە ئێمە بەهێزترە
یا من بە تەنها، یا ئەوان هەموویان و ئاپۆڕەکەیان؟
هێزلای ئەوانە تاکە پێوانەی هەموو شتێکە، جگە لەمە
هیچ ئارەزووێکی تریان نییە، بایەخیش بەوە نادەن
ئەگەریەکێك، لە شتێکی تر لەوان باشتر بێت
ئەوە منیش جگە لەم ڕووبەڕووبوونەوەیە، شتێکی دیکە قەبووڵ ناکەم

## 80

تاقانە لە قسەکانی خۆی بۆوە
بە ئازارەوە ترس کەوتە سەر ڕوخسارییەوە تێبینی نەدەکرا
پاشان بە تووڕەبوونێکی زۆر توندەوە، هێرشی کردە سەر دوژمنەکانییەوە
یەکسەرهەر چوار باڵی ڕازاوە بە ئەستێرەی کردەوە
نووسانە یەك و سێبەری خۆیان هەڵخست
پێچکەی پەیتوونە دژوارەکەی، کەوتە گەڕ
لافاوی ئاپۆڕەیەکی تەواو و تاودانێکی بە تاو
ڕەش وەك شەو، کرایە سەردوژمنی خراپەکار، لە ژێر تایە ئاگراوییەکانیدا
هەموو لایەکی ئاسمانی ئەمبریوم[1]، بە تەواوی کەوتە لەرزینەوە
جگە لە عەرشی خودا
دەهەزار ڕمی تریشقە هاوێژی، بە دەستی ڕاستییەوە بوو
هەموویانی بۆ ناردن و تاعونی هاوێشتە ناو گیانیانەوە

---

1- ئەمبریوم ناوی ئاسمانی هەرەبەرزە، بەپێی چین چین و بەش بەشی ئاسمانەکان.، ملتون لێرەدا هەوڵ دەدا کە دۆخێکی کەونی، بۆ مەسیح وەسف بکات، کە لە کتێبی پیرۆزو پێشینەکان هێمای بۆ نەکراوە.

## 81

سەرسام بوون و بڕستی داکۆکی کردنیان لە دەست داو ئازایەتییان نەما
چەکە لە کارکەوتووەکانی خۆیان دانا، تەواوی زریّ و خوودەوخودە
لەسەرەکان
هەروەها خاوەنی عەرش و گەورەکانی سارۆفیمی لە سەرچاو کەوتوو
کەوتنە ژێر تایەی پەیتوونی مەسیحەوەو تارومار بوون
دەیانویست چیایان بکەویّتە سەر، تا لە تووڕەیی مەسیحدا بیانپاریّزیّ
هەروەها تیرەکان لە چواردەستەوە، وەك ڕەشەبا
لە هەردوولاوە بەسەریاندا باری
هەریەکەشیان چوار ڕوخساری چاوداریان هەبوو
هەروەها داشقە زیندووەکانیش، چاویان هەبوو
هەمووشیان گیانیّ حوکمی دەکردن
چاوەکان گەشانەوەو بە برووسك ڕووناك بوونەوە
گەرمایی ئاگری لەناوبەریان، بۆ ناو ئەو نەفرەت لێکراوانەدا ڕەوانە کرد

## 82

تەواوی هێزەکانیان لە بێن چوون و لە هێزی خۆیانیان بە تاڵ کردنەوە
ماندوو بوون و ڕووخان و دۆڕان، تووشی نەکبەتی بووبوون
تاقانە هێشتا نیوەی هێزەکەی خۆی، نەناردبووە سەریانەوە
هەر ئەوەش نا بەڵکو تیرە گەواڵە هاوێژەکانیشی ڕاگرتبوو
چونکە نەیدەویست لەناویان ببات، بەڵکو هەموویان لە ئاسمان دەربکات
پاشان هەموو ئەوهەڵگەڕاوانەی هەڵساندنەوەو وەك مێگەلە بزنیّ
یا وەك مەڕومالاّتێکی وشتکراو، گشتیانی ڕادایە پێش خۆی
سەرسام و وردوخاش بووبوون، بە تۆقاندنەوە بەرەو تخووبی ئاسمان و
دیوارە بەللورییەکەی، ڕەدووی نابوون

## 83

شەقارێ لە دیواری ئاسمان بۆوە، تەنیشتەکانی بۆ ناوەوە سووڕانەوە
دەریچەیەکی فراوان بەدیار کەوت، دەیڕوانییە خەرەندێکی قووڵەوە
ئەو دیمەنە تۆقێنەرە بە ترسناکی خۆیە، هەموویانی پاشەکشە پێکرد
بەڵام ئەوەی زۆر تاڵتر بوو ، فەرمانێ لە دواوەڕا ڕایدەدان
هەموویان لە تخووبی ئاسمانەوەڕا، خۆیان هاوێشتە ناو تووڕەیی ئەبەدی
کەوتنە ناو خەرەندە ئاگرێکەوە، کە بنی نەبوو
دۆزەخ ئاسمانێکی بینی لە ئاسمان بەردەبێتەوە
لە ترسان ئەوەندەی نەمابوو ڕابکات
بەڵام قەدەر بناغەی پتەوی دۆزەخی لە تاریکی داڕشتبوو، هەرگیز نەدەجوولا
نۆ ڕۆژان بەردەوام ئەوانە، دەکەوتنە ناو ئەو دۆزەخەوە
لە کاتێکا لوورەی ئەو ئاگرە وەها شپرزەو شڵەژابوو
هەراوزەناکەی دەئەوەندەی لێهاتبوو
ئەوانیش بە ناو ئەو گەڕەلاوژە ترسناکەوە ڕەت دەبوون

**84**

ئەو ئاپۆرە یەکجار زۆرە لە بەزیوەکان، دۆزەخیان هیلاك كردبوو
بەڵام دواجار دۆزەخ هەموویانی بێزواندو دەرگەی لەسەر داخستن
ئەو دۆزەخەی کەبەهەق پەنای ئەوان بوو، هەرگیز ئاوری ناکوژێتەوە
ماڵی ئێش و ئازارو عەزاب بوو
ئاسمان بەوە دڵخۆش بوو کە تۆزێ باری بەوە سووك بوو
هەرزوو ئەو شەقارە چاکرایەوە کە لە دیواری ئاسمان بووبۆوە
تەنیشتەکانیشی چوونەوە شوێنی خۆی
دوای ئەوەی خۆی بەتەنها سەرکەوت و دوژمنەکانی بێزواند
مەسیح پەیتوونی خۆی وەرسووڕاندەوەو گەڕایەوە
تا بگاتەوە هەموو لای ئەوقەددیسانەی، کە بێدەنگ وەستابوون
بە چاوی خۆیان، کاری گەورەی ئەویان بینی بوو

## 85

بەرەو پیلی چوون و  و لە خۆشیاندا، هاواریان دەکرد،
لە کاتی ڕۆشتنیاندا دارخورما سێبەری بۆ دەکردن
هەرچینێك بۆخۆی، بەستەی سەرکەوتنی خۆی دەچڕی
بەسەر پاشای سەرکەوتن و تاقانە و میراتگری ئاسمانیاندا، هەڵدەگووت
ئەوەی کە لەلایەن ئاسمانەوە، دەسەڵاتی پێدرابوو
هەروەها کە شایەستەترینی حاکمانە
ئەوەیش کە ئاهەنگیان بۆ دەگێڕاو سەرکەوتنی بەدەست هێنابوو
چووە ناو بارەگای و پەرستگای ئاسمانەو، بەشانازییەوە لە تەك خۆی داینیشاند
ئێستاکەش لای ڕاستەی شکۆدارییەوە، لە ناوخۆشستان دادەنیشتووە

## 86

ئابەمجۆرە لەسەرداوای تۆ، ئەوەی لە ئاسماندابوو، بەوەی سەر زەویم چواندو پێوانە کرد
تا خۆپارێزی بکەیت  و هۆشت بێ، سەبارەت بەوەی کە لە ڕابردوودا چی ڕوویداوە؟
ئەوەم بۆ ئاشکرا کردی، کە بۆمرۆڤ، شاراوەیە:
سەبارەت بەو قلیشانەوەیەی کە لە ئاسمان ڕوویدا، لە میانی فریشتەکان و کارکارەی دۆزەخ، ئەو کەسانەی کەوتنە ناوییە
ئەوانەی لە گەڵ ئەهریمەندا  زێدەڕۆییان کردو هەڵگەڕانەوە
ئەوەی کە ئێستا حەسوودی بە خۆشییەکانی تۆ دەبات، هەوڵ دەدات
فریوت بدات، تا لە دروودی خوادا هەڵگەڕێیتەوە، تا تۆش لەو خۆشییەدا
بێبەش بکرێیت وەك چۆن ئەو بێبەشکرا، سزاو کلۆڵیشی ئەبەدییە

## 87

ئەوميە هەموو تۆڵەسەندنەوەو دڵدانەوەی ئەو
لەبەر رەخنەو سەرزنشت و ڕق و قینی خۆی لە ئاسمان
دەیەوێت تۆش هاوڕێی بیت لەو بەڵایە
بەڵام گوێ لە فریودانەکانی نەگریت، خۆپاریزی بکە
لەوەی کە لە تۆ بێهێز ترە، سوود لەوانە وەربگرە
کەوا سەرپێچی ئاسمان دەکەن
بزانە چییان بەسەرهات و سزای هەڵگەڕانەوە چییە؟
ئەوانە هەر بەجێگیری دەمێننەوە، بەڵام دەڕووخێن
ئەومت لە بیر بێت و لە گوناه بترسیٚ[(١)]

---

١- بەشێوەیەکی گشتی ملتون ئەو فریشتانەی بە کائیناتی سەرووی سروشت، نەناساندووە، بەڵکو وایان پێناسە دەکات کە بەشێکی دانەبڕاون لە سروشت، هەرچەند ئەو باس لە سروشتی ئاسمانی دەکات، هەروەها ملتون دەڵێت فریشتەکان هیچ ئەندامێکیان نییە، شیلگیرو ناپێکهاتەن، دەڵێت لە جەوهەری پاڵاوتەی خۆیاندا سادەن، بەڵام ملتون پێی وایە کە ئەهریمەنلەبەر برین ئاوار دەکێشێ، بەتایبەتی برینی شمشێر، بەڵام زوو سارێژ دەبێت، هەرچەندە شەیتان زرێی لە بەردی ئەڵماس بووە. سەبارەت بەو چەکەی کە شەیتان لە دژی فریشتەکان دایهێنا، لێرەدا ملتۆن سوودی لە سبنسەر وەرگرتووە لە کتێبی شاژنی جنۆکەکان کە دەڵێت:

- ئایا ئەو ئامێرە هەرماسییەت بینیوە، کە لە ئاسن دروست دەکرێت.

لە قووڵی قووڵاییەکانی دۆزەخ، کە تەڕدەستی خواکانی تۆڵە شەقڵی پێداون . پاشان بە نیترونی ڕەشەبادار و کبریتی زیندوو باری کرد..... هتد

-- ئاهەنگ گێڕان لە کاتی سەرکەوتنەکاندا: سرووتێکی رۆمانی کۆنە، لەم بەشەدا باس لە دەنگێک دەکرێت، کە بە دەنگی مەزن ناودەبرێت، لە ئاسمانەوە گۆرانی بۆ سەرکەوتن بە سەر دەنگی مار دەچڕێ، لە سەرەتای بەشی یەکەم باسکراوە، دەنگی مار مەبەستی ئەهریمەنە، کە لە ئاسمان دەرکرا، لە خەونی یۆحناوەرگیراوە١٠-١٢

- - سەبارەت بە شەقبوونی ئاسمان و کەوتنە خوارەوەی لەشکری هەرماس، هەموو ڕووداوی گێڕانەوەکانی ئەم شەڕەو شەقبوونی ئاسمان لە ئەشعیا وەرگیراوە ٥-١٤ کەدەڵێ: ئینجا خەرەندەکە خۆی فراوان کرد و بێسنوور دەمی بەش کردەوە، ئیدی هەموو شەوق و جەماوەرو هەراوزەن و خۆشییەکانی بەربوونەوە ناوییەوە.

## 1

ئۆرانیۆ(١)، لە ئاسمان وەرە خوارەوە، ئەگەر ئەوە ناوی تۆ بێت
من بە دوای دەنگی پیرۆزی تۆ کەوتووم
چوومەتە سەر بانەکانی ئۆلیمپ
بەرزتر لەوەی کەباڵی بیکاسۆسی(٢) بگاتێ
من بانگی ماناکان دەکەم، نەك ناوو ناتۆرە
چونکە تۆ لە نۆ خواکان نیت و
لەسەر ترۆپکی ئۆلیمپی دێرینیش ناژیت
بەر لەوەی بانەکان بەدیاربکەون و کانیاوەکان بتەقنەوە
لە ئاسمان لە دایك بوویت، لەگەڵ حیکمەتی ئەبەدیدا ژیاوی
حیکمەت خوشکی تۆیەو
لەبەردەم باوکی هێزوەندا یاری لە گەڵ دەکەیت
بە گۆرانییە ئاسمانییەکانت دڵخۆشی دەکەیت

## 2

وەرە وەك میوانێکی زەوینی رابەرایەتیم بکە بۆ بەرزایی
بۆ ئاسمانی ئاسمانەکان کەوا من ئەندێشەی دەکەم

---

1- ئۆرانیۆ خواوەندی هونەرە لای گریک، خواوەندی فەلەک و ئەستێرەناسی، دایکی لیۆنیس و ئەبۆلۆیە، بەوشێوەیە وێنا دەکرێ کە دونیا وەک تۆپێکی شووشەیی لەناو دەستی چەپیایە و سینگێکیش لە ناو دەستی راستیایە، ئۆرانیۆ کەوایەکی رازاوە بە ئەستێرەی لەبەرایەو سەیری ئاسمان دەکات، ناوەکەی بە مانای شای جوانان دێت، ملتون بۆیە هەڵیبژاردووە چونکە لە هەموو خواکاندا بەرزترە، و ئیلهامی شیعری پێ دەبەخشێت.

2- بیکاسۆس ئەسپێکی باڵدارە لە میدۆزاوە زاوە، لە بۆسیدن بە سمکوتینییەوە، کانیی پیرۆزی تەقاندۆتەوە، بۆ خوای هونەر، ناوی کانییەکە هیبۆ کرینییە واتە تەوێڵی ئەسپ کە بیلروفون تووشی غرور هات، سواری پشتی ئەو ئەسپە بوو، تا بیباتە سەر ئۆلیمپ، بەڵام زەیوس مێشی ناردە سەر ئەسپەکەو هاری کردو هەڵیدایە خوارەوە.

بمبه بۆ ئاسمانی ئیمبریالی(١)، که شوێنی کارامەیەیی تۆیه
به هەموو ڕێپیشاندانێکی تەواوەوه
بمگەڕێنەوه بۆ ڕەگەزی ئەسڵی خۆم(٢)
ئەگەر نا بەسەر ئەو ئەسپه باڵداره بێ لغاوەدا
خۆم هەڵدەدێرم و دەکەومه ناو کێڵگەی ئیلییەوه(٣)
وەك چۆن بیگاسۆس بیلرفۆنی هەڵدایه خوارەوه
لەوێدا سەرگەردان دەبم وەك نائومێدێکی کڵۆڵ دێم و دەچم
هێشتا نیوه گۆرانییەکم ماوەو نەمچڕیوه
که له نێو مەداری بینراوی ڕۆژانەدا سنوورەکەی تەنگتره

## 3

بەسەرزەوییەوه دەوەستم، هێشتاکه
بەرزی سەرجەمسەر نەبوومەتەوه
به دڵخۆشی و دڵنیاییەوه
به دەنگێکی بەشەری گۆرانی دەچڕم، که نەگۆڕاوەو زبرو کپ نەبووتەوه
هەرچەنده له ڕۆژەڕەشەکاندا[٤] ڕوویداوه
لەو ڕۆژەدا لەگەڵ نێڵەی ئاگردا ، له تاریکی و ئەو مەترسییەی دەوری داوم
له ناو وەحشەتدا دەژیم، لەگەڵ ئەوشدا تەنها نیم مادەم تۆ هەی

1- ئیمبریالی واته ئاسمانی، بەرزتره له هەموو ئاسمانەکان.

2- رەگەزی ئەسلی واته زەوی.

3- ئیلی کێڵگەیەکه له لیسیا،تورکیای ئێستا، که بیلرۆفۆن کەوته ناوییەوه دوای ئەوەی ئەسپەکه هەڵیدا.

4- ڕۆژڕەشەکان که لەدوای گەڕانەوەی مەلەکیەت له 1649 هاتن که رۆژانێکی پڕ مەترسی بوون بۆ کۆمارییەکان، که ملتۆن خۆشی کۆماری بوو.

زیارەتی درووەکاری شەوانەم دەکەیت، یاخود لەو کاتەی سپێدە
رۆژهەڵات بەڕەنگی ئەرخەوانی ڕەنگ دەکات
سێبەرم بە گۆرانیەکەمەوە مەحکەمە، ئەی ئۆرانیۆ
گوێگرەکان ئامادە بکە، هەرچەندە ژمارەیان کەمە[1]

## 4

دوور کەوە، لە لێکترازانی بەربەری، باخۆس وعەربەدەکارەکانی(٢)
ئەوانە دەمارێکن لە هەرچی و پەرچییە وەحشییەکان
کە شاعیرە تراکیەکەیان لە چیای رودوبیدا(٣)، هەنجن هەنجن کرد
کە دارستان و تاوێرەبەردو گوێچکەکان و هەموویان لە خۆشیدابوون
هەتا ئەوکاتەی وەحشییە توندوتیژەکان، زاڵ بوون بەسەر سێتارو
دەنگەکەی
خوای هونەر(٤) نەیتوانی داکۆکی لە ڕۆڵەی خۆی بکات
تۆش نەکەی ژێرکەویت، ئەی ئەو کەسەی لێت دەپاڕێمەوە
چونکە تۆ ئاسمانیت، ئەویش خەونێکی زڕاو

1- هەرچەندە ژمارەیان کەمە، واتەملتون وایدەبینی کە خوینەرەکانی کەم دەبنەوە. چونکە خەڵک پێی وابوو وەختی کوشتنی مەلیک نەهاتووە.

2 باخوس عەربەدەکاران، کە هاودەمەکانی هەمووی ژن بوون و ئورفیوس سیتاری بۆ لێدەدان سیتاری سیحری کە خوداوەندی دونیای خوارەوەی خستە ئەفسوونەوە و رێی پێدا ژنەکەی بهێنێتەوە، خەریک بوو دەگەڕایەوە، ئەگەر بۆ دوا ئاوڕی نەدابایەوە، لە ژێر درەختێکا سیتاری دەژەنی کە لایەنگرانی عەربەدەکاری باخۆس هێرشیان کردە سەری و بەردبارانیان کرد، بەڵام هیچ یەک لەبەردەکان پێی نەکەوت، چونکە بەردەکان کەوتنە ژێر کاریگەرێتی ژەنینی ئەوەوە، بۆیە بەدەست هێرشیان کردەسەرییەوە، لێرەدا ملتون ئەوکارە مەحکوم دەکات،.

3- رودوبی چیایەکە لە تراکیا کە هەرێمی قەزوینی ئێستایە.

4- خوای هونەر نەیتوانی.... مەبەستی کلیۆبییە، کە باوکی ئورفیوسە لە ئەپۆلۆ، خوداوەندی شیعری داستانییە و سەرۆکی هەموو خواکانی هونەرە.

## 5

پێم بڵێ خواکەی من چی ڕوویدا؟
کە رافائیلی فریشتەی هاودەم
بە هێنانەوەی مەسەلەی ترسناک
هوشداری دا بە ئادەم، کە هەڵنەگەڕێتەوە
بەوەی کە لە ئاسماندا بەسەر هەڵگەڕاوەکاندا ڕوویدا
تا ئادەم و هاودەمارەکانی
وەکو ئەوانیان بەسەر نێت لە فیردەوسدا
ڕایسپاردن کە لە درەختی حەرامکراودا وەنزیك نەکەونەوە
تخووبی ئەو تاکە فەرمانە نەبەزێنن
بۆ رازی کردنی حەزەکانی خۆیان
ئەگینا ئەوانیش پشتگوێ دەخرێن
گوێڕایەڵی کردنی ئەو فەرمانە، زۆر زۆر سادەیە
لەناو هەموو بژاردەی درەختەکانی ترەوە

## 6

ئادەم و حەوا گوێیان لە هەموو لایەکی
ئەو چیرۆکی خۆشە بوو و سەرسام بوون
دڵخۆش بوون بەوەی کە گوێبیستی شتی بەرزو غەریب دەبن
ئەو شتانەی سەبارەت بە بیرۆکەی ئەوان نەدەهاتنە خەیاڵ
شتی وەك تۆپی ئاسمان و ئەو جەنگەی
کە لە نزیك خواو بەرەکەتی ئەودا ڕوویدا
شڵەژانی هێنا کایەوە، بەڵام خراپە هەر زوو
دابەزی و وەك تۆفان باریە سەر ئەوانە
کە لەواندا سەریهەڵداو مەحاڵە تێکەڵی بەرەکەت بن

## 7

هەر زوو ئادەم ئەو گومانەی شکاند، کە کەوتبووە بەر دڵییەوە
ئێستێش بە ئارەزووی ئەوەوە تاویدا
تا نزیکترین ئەو شتانەی بۆ ئەو گرنگن بزانێ
یاخود ئەوە بزانێ ئەو دونیایە چۆن لە ئاسمان و زەویدا
بۆ یەکەمین جارئاوا گەشاوە جیلوەی داوە؟
کەی و لە پێناوی چی و بە چ هۆیەکەوە بوو
یاخود چی ڕوویدا لە ناو عەدندا؟ یا لە دەرەوەیدا
بەر لەوەی یادەوەری ئەو هۆشن بێت، وەك کەسێکی تێنوو
کە هێشتا بە ئاستەم چاوی تێر بووبێ
لە سەیری ڕووبارێکی هەڵڕژاودا
کە بە گوێی ئاوەکەوە دەچرپێنێ و تێنوێتی ئەو زیاتر دەکات
ئا بەمجۆرە دەستی پێکردو پرسیاری لە مێوانە ئاسمانییەکەی کرد

## 8

شتی گەورە گەورە، گوێچکەی پڕ لە سەرسامی دەکردین
زۆر جیاوازە لەو دونیایە
تۆ لێکدانەوەی پیرۆزت ئاشکراکرد
کە عینایەتی خوداوەندی
بە سۆزی خۆی لە ئاسماندا ناردوویەتی
تا هەمیشە ئاگادارمان کاتەوە لەو شتانەی
لەوانەیە ببنە هۆی گومڕابوونمان
سەبارەت بەو نادیارییەی کە زانستی مرۆیی
ناتوانێ پەی پێ ببات:
ئێمە قەرزاری چاکەی ڕەهاین
سپاسی خوا دەکەین و ئامۆژگاری ئەومان بە ویقارەوە وەرگرت
لە پێناوی پارێزگاری کردنی

ویستی چەسپاوو فەرمانڕەوایەتی ئەو
ئەوەش ئەو غایەتەیە کەوا ئێمەی تیاین

## 9

بەڵام مادامەکێ بەلوتفەوە وادەت داوە فێرمان بکەیت
کە بچینە سەرباسی ئەو شتانەی
کە لە سەرەوەی بیرکردنەوەی زەوینییە
هێشتا لە زانین و زانستی ئێمەدا ون و نادیارە
وەك چۆن لەحیکمەتی سەرەوەدا دیارو ئاشکرایە
لوتف بکەو دابەزە خوارەوەو ئەوە شتانەمان بۆ بگێڕەوە
کە زانینی ئێمە دەتوانێ وەریگرێت
پێمان بڵێ ئەو ئاسمانەی کە ئێمە، وا دەبینین دوورە بەرەو سەرەوە
لەگەڵ ئەو ئەستێرانەی دەجولێن و دەیرازێننەوە چۆن دەستی پێکردووە؟
هەروەها ئەوەش کە دەبێتە هۆی ئەوەی، هەموو بۆ شاییەکان پڕ بکاتەوە
دەربارەی هەوای بەربلاوی دەوروبەر
کە ئەو زەوییە جوانەی لە باوەش گرتووە
هۆی چییە کە ئەفرێنەر جووڵەی کردە نێو ئەبەدییەت
لە نێو دڵی تاریکیدا کاری بونیاتنانی دواخست و چۆن دەستی بە کار کرد؟
چۆن کۆتایی هات؟ ئەگەر بۆ تۆ حەرام نەبێ
ئەو شتانەمان بۆ ئاشکرا بکەی، کە ئێمە لەبارەیەوە پرسیار دەکەین

## 10

ئەوەشیان نەك بۆ ئەوەی، نهێنی ئیمپراتورییەتی ئەبەدی ئاشکرا بکەین
بەڵکو ئێمە دەمانەوێ هەرچەند زیاتر بزانین

ئەوەندە شانازی بدەین بە کارەکانی ئەو، ئەو نووره مەزنەی رۆژێ
کە دەیەوێ زوو ڕەت بێت، لە راکردنی بە ناو ئاسمانی فراواندا
ئەویش هەر لە ئاسماندا دەوەستێ
تاگوێی لە دەنگی بەهێزو شەلاڵی تۆ بێت
بەشەوقەوە خۆی دوا دەخات تا گوێبیستی
هەواڵی چیرۆکی پەیدابوون و چۆنیەتی لەدایك بوونی
سروشتی بدەیتێ، لە نێو هەوای نەبینراودا
یاخود کە ئەستێرەو مانگ هەڵدێن، خێرایانە بۆ گوێ ڕاگرتن لە تۆ
شەویش بێدەنگی لەگەڵ خۆی دەهێنێ
خەویش بە هەموو بایەخیەوە، دەوەستێ و گوێ رادەدێرێ
یاخود دەتوانین فەرمانی پێ بکەین کەئاوا بێت
جێمان بهێڵێ بەرلەوەی خۆر هەڵێت
تا ئەو کاتەی کە تۆ لە گۆرانیەکەت دەبیتەوە
ئابەمجۆره ئادەم لە مێوانە درەوشاوەکەیا پاڕایەوە
هەربەمجۆرەش ئەو فریشتەی کە لە خوداوەند دەچوو
بە لوتفەوە وەڵامی دایەوە:

## 11

دیسان بە ئاگا لەخۆبوونەوە وەڵامی پرسیارەکەت دەدەمەوە:
پرسیم ئەگەر کاری هێزوەند بگێڕمەوە
ئاخۆ چ وشەگەلێك یا کام زمان بەشی ئەوە دەکات؟
یاخود ئایا دڵی مرۆڤ بەشی ئەوە دەکات تا وەریگرێت؟
ئەوەی دەتوانی وەریگریت و ئەوەی بە کەڵکی تۆ دێت
بۆشانازی بەخشین بە خوا، شادییەکانی تۆ زۆرتر دەکات
بۆیە لە بیستنی تۆی ناشارمەوە ئەوەیان
ناردنگەلێکە لەسەرەوەڕا وەرمەگرتووە

تا وەڵامی داواکانی تۆ لەمەڕ زانین بدەمەوە
ئەومیشیان تا سنوورێکە، پاشان لێناگەڕێم پرسیار بکەیت
یا ڕامانەکانت ڕامانی ئەو شتانە بکات، کە ئاشکرا نەبووینە
چونکە پاشای نەبینراو، ئەو خۆی بە تەنها خاوەنی تەواوی توانایە
لەشەودا سەرکوتی دەکات و کەس ناتوانێ، بیگوازێتەوە لە زەوی و ئاسماندا

## 12

ئەو خۆی زۆر شتی جێهێشتووە، تا بەدوایدا بگەڕێی و بزانیت
پاشان مەعریفە وەکو خۆراك وایە
تەنها پێویستی بەوە هەیە کە بە سەبر بیت، لە تاسووق و حەزو ئارەزوو
واتە دەبێ پێوەری ئەو ئەقڵە بناسی کە وەریدەگرێت
ئەگینا تووشی مڕبوون دێت و هەرزوو حیکمەت دەبێتە گەمژەلی
وەك چۆن خۆراك دەبێتە با

## 13

پاشان بزانە دوای ئەوەی کە لۆسیفەرو لەشکرەکەی کەوتنە ناو خەرەندەوە ( لەبەر ئەوە وای پێدەگوترا چونکە درەوشاوە بوو ، لە ناو ئاپۆرەی فریشتان لەبەر ئەوەی، ئەو ئەستێرەیەك بوو(١) لە ناو ئەستێران )
ئیدی کوڕە مەزنەکە لەگەڵ قەددیسەکانیدا ، بەسەرکەوتوویی گەڕانەوە
خاوەن تەواوی هێزبوو، باوکی ئەبەدی بەسەر عەرشەوە
ئاپۆڕەی ئەوانی بینی و قسەی لەگەڵ تاقانەی کرد و گوتی :
دواجار دوژمنمان بەزی، وای خەیاڵ دەکرد ، کە هەمووان وەك ئەو

---

1- ئەو ئەستێرەیەبوو..... مەبەستی فینۆسە، کە رەمزی خۆشەویستییە.

وەرگەڕاون
بەیارمەتی ئەو هێزەڕامالْکارە، دەتوانێ عەرشی پیرۆزی بالاّ
ئەو عەرشەی هەمووومان ڕێکدەخات، ڕامالێ، بەفێڵ و تەڵەکە بیسەنێت
خەڵکانێکی زۆری ڕاکێشا، کە بە شوێنی خۆیان نەدەزانی
لەگەڵ ئەوەشدا زۆربەیان شوێنی خۆیان پاراست، وەك چۆن بینم

## 14

ئێستاکەش ئاسمان بە فراوانی خۆیەوە
بە خەڵکانێکی زۆرەوە مەملەکەتی خۆی دەپارێزێ
لەو پەرستگا بەرزەی کە لەوێیە، سرووتە هێمنەکانی خۆی پێشکەش دەکات
بەلاّم تا دڵی تووشی ئەو زیانە نەبێت، کە ڕوویدا
وا خەیاڵ دەکات ئاسمان چۆل بووە لە دانیشتوانی
گەمژەلّیەکەی زێدەڕۆیی لە زیانەکە دەکات
ئەو زیانە پڕدەکەمەوە، ئەگەر بە زیان حسێب بێت
خەسارەتی نەفس بۆ نەفس
لە ساتێکدا جیهانێکی تر خەڵق دەکەم
لەیەك پیاودا ڕەگەزێك لە مرۆڤ خەڵق دەکەم، لەژمار نەیەت
ئالەوێدا دادەنیشن نەك لێرە، تا ئەو کاتەی بە سیفاتەکانیان بەرز دەبنەوە
ئیدی لە ژێر ئەزمورونی گوێڕایەڵی درێژخایەندا
ڕێگەی خۆیان بۆ بالاّ شەق دەکەن و
زەوی دیبێتە ئاسمان و ئاسمان دەبێ بە زەوی
یەك مەملەکەت، مەملەکەتی شادی و یەکگرتن تا کۆتایی
بە وشەی - ئەی ڕۆڵەی لەدایك بووم(١)، بە تۆوەیە ئەوکارە جێبەجێی دەکەم
تۆ قسە بکەو ئیدی دەبێت

1- ئەی ڕۆڵەی لە دایک بووم... لێرەدا ملتون بە پێچەوانەی کتێبی پیرۆز کار دەکات و وایدادەنێ کە خەڵق بوون کاری تاقانەکەی ئاسمانە.

## 15

من گیانی خۆم، كه چەتری هەموو شتێكەو
تەواوی جەبەرووتی خۆم، له گەڵتا دەنێرم
بكەومڕێ و بچۆ بەلای خەرمەندەوە ، كه سنووری دیاریكراوی خۆی هەیە
له میانی ئاسمان و زەویدا، خەرمەندەكه بێسنووره
چونكه ئەوە منم كه ڕەها پڕ دەكەمەوە، هیچ بۆشاییەك له شوێندا نییە
هەرچەند من بێسنوورم و خۆم حەشارداوە، چاكەشم سنووری نییە
ئەو ئازادە بیبەخشێ یا نەیبەخشێتەوە
زەرورەت و سوتفە نزیكی من ناكەونەوە، ئەوەی كه دەمەوێ قەدەرە
ئیدی هێزومەند بەمجۆرە دوا
هەرچییەكیشی گوت، ئەوە ڕۆڵەی ئاسمان جێبەجێی دەكات
كارەكانی ئاسمان فەوریەو له زەمەن و بزاوت خێراترە
بەڵام گوێچكەی مرۆڤ دەركی پێناكات، كه بەبێ قسه هەواڵی پێ بدات
ئابەمجۆرە ئەقڵی بەشەرییە، دەرك بە هەواڵ دەكات

## 16

كاتێ كه ڕاگەیاندنی ویستی هێزومەندیان بیست
شادی و سەركەوتنێكی گەورە له ئاسماندا بەرپابوو
درودیان نارد بۆ باڵا و خێریشیان بۆ ئەو مرۆڤانە خواست كەوا له ڕێگەن
هەروەها ئاشتیشیان بۆ دانیشتوان(١)، ئارەزوو كرد
درووود بۆ ئەو كه له تووڕەیی و تۆڵەسەندنەوەدا، دادوەرانەیە

1- دەستەواژەی ئاشتی بۆ دانیشتوان، له لۆقا 2:14 وەرگیراوە- شانازی بۆ خوا له ئاسمان و ئاشتی بۆ زەوی بەختەوەری بۆخەڵك –

شەرخوازانی ومەرناو مەسکەنی ڕاستگۆکانیشی(١) پیرۆز کرد
درووود بۆ ئەو کە هەر حیکمەتی ئەو بوو
وای خواست چاکە لە خراپە خەڵق بکات ولە جیاتی رۆحە شەڕانگێزەکان
ڕەگەزێکی باشتر، شوێنیان پڕ دەکاتەوە
خێرو چاکەی ئەویش، بۆ تەواوی جیهان و چاخەکان بێسنووورە
ئا بەمجۆرە فریشتەکان کەوتنە چڕینەوە

## 17

لەو کاتەی کە تاقانەی ئاسمان بە هێرشی مەزنی خۆی بەدیارکەوت
کە بە قودرەتی گشتییەوە دەورەدرابوو و بە نووری جیلوەی
پیرۆز و حیکمەت و خۆشەویستی تاجبەند کرابوو
باوکیش بە تەواوی لەودا دەدرەوشایەوە
بەدەوری پەیتوونە کەشیا ژمارەیەکی بێکۆتا
لە شیرۆبیم و سیرافیم هەڵڕژابوون
هەروەها خاوەن دەسەڵات و خاوەن عەرش فەزیلە و
رۆحی باڵدارو عەرەبانەی باڵدار، لەو چەکانەی خودا
دەیان هەزارلە دێرینەکان لە میانی دوو چیای مسیندا وەستا بوون
لە پێشوازی ئەو ڕۆژە بە هەیبەتەدا
رێشمەو تفاقی ئاسمانییان بە دەستەوە بوو
هەڵڕژان و لە ناخیاندا رۆحێکی زیندوو هەبوو
چوونە ڕیزی گەورەی خۆیانەوە، بە جولاندنی رێسمەو جومگەی زێڕین
ئاسمان دەرگای توندو تۆڵ و فراوانی خۆی بە دەنگێکی ئاهەنگئامێز
کردەوە

---

1- مەسکەنی راستگۆکان، لە ئەمثالی 3:33 دا هاتووە - نەفرەتی خوا لە ماڵی شەڕانگێزان و پیرۆزیش بۆ ماڵی راستگۆکان

تا رێگە بۆ پاشای شانازی والآ بکات و ئەویش بە وشەی بەهێزو رۆحی خۆیەوە، دونیا تازەکە بەسەر زەوی و ئاسمانیدا بئافرێنێ

## 18

وەستان، لە کەناریشەوە، خەرەندێکی قووڵی بێ سنووریان[1] بینی
وەك دەریا تێکدەچڕژا، تاریك کاول و وشك و برینگ بوو
لە ژێرەوەشیا بایەکی بەهێز دەیوروژاند، شەپۆلی تێکچڕژاو وەکو چیا
هێرشیان بۆ لوتکەی ئاسمان دەبرد ، چەق تێکەڵی جەمسەر دەبوو
- بێدەنگ بن ئەی شەپۆلە هاروهاجەکان، بێدەنگ بەوە ئەی خەرەند
ئیدی خۆبەزلزانینتان کۆتایی هات، ئابەمجۆرە تاقانە قسەی خالقی[2] کرد
ئەمەی گوت و سەرکەوتە سەر باڵی شیرۆبیم
بە شانازییەکی ئەبەدی بۆ دوور دوور سەرهەڵگەڕا

## 19

لە تاریکیدا دا، کە هێشتا جیهان خەڵق نەبووبوو
کاوس گوێی لە دەنگی بوو، هەموو لایەنگرانیشی لەگەڵ بوو
لە کۆڕەوێکی درەوشاوەدا بەدوای کەوتبوون
تا ئەفراندن و سەیرو سەمەرەی جەبەرووتی ئەو ببینن
ئینجا بە سەر عەرەبانەی گڕگرتوودا وەستا
چەند پڕگالێکی زێڕینی بەدەستەوە بوو
کە لە کۆگای ئەبەدی خوادا ئامادەکرابوو
تا دەستنیشانی چێوەی ئەم کەونە بکات

---

1- خەرەندێکی قووڵی بێ سنوور، ئەم دەستە واژەیە قسەی ئەهریمەنمان بەبیر دێنێتەوە لە وەسفی کاوس دا.

2- قسەی خالیق مەبەستی خەڵقی هەمەکی تەواوە.

## 20

قاچێکی خۆی لە چەق دانا و قاچەکەی تریشی بە شێوەیەکی بازنەیی
بە نێوقووڵاییەکی نادیارو گەورەدا هەڵسووڕاند
ئینجا گوتی سنوورت تا ئێرە درێژ دەبێتەوەو تا ئێرەیە
دەبا ئەوە چێوەی وردی تۆ بێت ئەی جیهان
ئابەمجۆرە خوا ئاسمان و زەوی لە مژادێکی بێ شێوەو بۆشایی ئەفراند
کە تاریکایی تەواوی خەرەندی داپۆشی بوو
رۆحی خوداش هەردوو باڵەکانی خۆی بەسەر ڕووبەری کپدا کێشا
ئینجا هێزی ژیان و فێنکی ژیان کەوتە کوڵینەوە
بەڕێگەی قەبارەیەکی شلەوە، بەڵام قووڵایی لە تەرتارۆسی دۆزەخی کوێردا
پاك کردەوەو دوژمنایەتی دەرکێشا
پاشان شێوەی گرت و خراوخڕ هەڵگەڕا

## 21

لێکچووی لە گەڵ لیکچوودا کۆکردەوە
ئەوەی ماوەش بەسەر چەند شوێنێکی دابەش کرد
لە نێوانیشیاندا هەوای چنیەوە، زەوی کێش کردو بە سەر چەقەوەی
هەڵواسی
ئینجا خوا گوتی، با نوور لێرە هەبێ
نووری هەوایی یەکەمی شتەکانی، ساف گەوهەر بوو
کە لەهەوادا هەڵڕژاو ئینجا لە رۆژهەڵاتی ئەسڵیدا
بەناو تاریکی هەوادا، سەفەر دەستی پێ کرد
سووڕگەیەکی لە هەوری تیشکیندا ئەفراند
چونکە هێشتا خۆر خەڵق نەبووبوو، هەر لەناو خێمەی هەور دەژیا
خوا نووری بە جوانی بینی ، نوور و تاریکی لە یەك کردەوە و

نووری ناو نا رۆژ و تاریکیش شەو
ئابەمجۆرە رۆژی یەکەم ئێوارەو بەیانی بوو

## 22

ئەو رۆژە بە بێ ئاهەنگ گێران و سروود تێنەپەڕی
کە تیپەکانی ئاسمان بەرپایان کرد
لەو کاتەی کە بۆ یەکەمجار بوو
نووری خۆرهەڵاتیان لە ناو تاریکیدا بینی
رۆژی لەدایکبوونی ئاسمان و زەوی بوو
بە شادییەکی زۆرەوە سوورگەی کەونیان تێر کرد
سێتاری زێڕینی خۆیان ژەنی و درووودیان بۆ خوا نارد
سروودیان بۆ ئەفرێنەر چڕی
لەو کاتەی کە یەکەم ئێوارەو یەکەم بەیان بوو
ئینجا خوا فەرمووی دەبا گومەزێ هەبێ لە نێوان ئاوەکان
تا ئاو لە ئاو بکاتەوە
خوا گومەزی لە شلەیەکی پاك و هەوای بنەڕەتی خەڵق کرد
کە لە بازنەیەکەوە تێکەڵ بە یەك دەبن
تا ترۆپکی ئەو جیهانە گەورەیە
بە دابەشبوونێکی چەسپاو و ڕاست
ئەو ئاوەی لە ژێرەوە بوو، لەگەڵ ئەوەی سەرەوە جیابۆوە
وەك چۆن زەوی ئەفراند
دونیاشی بەسەر چەند بازنەیەکی کپ
لە چێوەیەکی کریستاڵی فراواندا ئەفراند

## 23

پاشان کاوسی ئاژاوەگێڕو توندوتیژی بۆ دوور دوور گواستەوە
دمنا دامەنە وەحشییەکەی، دەگەیشە دونیاو سیستەمی چوارچێوەکەی
تێکدمدا ، ناوی لە گومەزەکە نا ئاسمان
بەشەو و بە رۆژ تیپەکەی ئاسمان گۆرانیان دەچڕی
زەوی پێکهات، بەڵام لەناو رەحمی ئاودا بوو
کۆرپەڵەیەك هەبوو تەواو نەبووبوو

## 24

ئاوی زەوی بێ بڕانەوە هەڵدەرژاو وەستانی بۆ نەبوو
فێنکی پیتاندنی لە ناخی خۆیا هەڵگرتبوو
تەواوی ڕووپەڕی زەوی نەرم و نیان کرد
کاتێ کە ترشا وای لە دایکی گەورە کرد ئاوس بێت
دوای ئەوەی بە تۆوی زاووزێ، ئاوی داو تێری کرد
پاشان خوا فەرمووی ئەی ئاوەکان لە شوێنێکدا کۆ ببنەوە
تا وشکایی بەدیار کەوێت، پاشان چیای بەرز بەرز بەدیار کەوتن
کە سەریان لە هەوردەدا ، لووتکەکانیان تا تۆقەڵەی ئاسمان ڕۆیی

## 25

وەك چۆن بانەکان قیت بوونەوە ئاواش زەوی، لە هەندێ شوێن داتەپی
فراوان و قووڵ، وەك شوێنێکی پان پۆڕ بۆ ئاوەکان
بە گوڕو تاو وەك شادی هەڵڕژانە ناوییەوە
وەك دڵۆپێکی بازنەیی بەسەر وشکاییەوە
هەندێکیان وەك دیوارێکی بەللوری بەردی گەورە گەورە
بەسەر پشتی رووبارەکاندا بەرز بوونەوە

ئەو هەموو تاودانەش بۆ فەرمانی هێزوەندی مەزن بوو
وەك تاودانی لەشکر وابوو، کاتێ بانگێشت دەکرێ و
هەر تیمێك دەچێتە ژێر بەیداخی خۆیەوە
ئاپۆرەی ئاویش ئاوابوو

## 26

شەپۆل لە دوای شەپۆل هەڵدەمرژاو رێگەیان دەدۆزییەوە
جا ئەگەر شوێنەکە تەلان بوایە توونـد هەڵدەڕژان و
ئەگەر دەشتاییش با، ئەوە بە نەرمی هەڵدەڕژان
هیچ بەردوبانێك نەیدەوەستاندن، بەڵکو دەچوونە ژێرزەوی
یا بەناو بازنەیەکی پان و پۆر وەك مار
لوولیان دەخوارد و رێگەی خۆیان دەدۆزییەوە
ئیدی زەوی نەرم بوو بەر لەوەی خوا
فەرمان بە زەوی بکات وشك هەڵگەڕێ
بەڵام لەناو ئەو کەنارانەدا ڕووبار هەبوو هەڵدەڕژا
کلکی شێدارو تەڕی خۆی بەدوای خۆیدا ڕادەکێشا
ناوی لە وشکایی نا زەوی
بەڵام ناوی لە گۆمی گەورە گەورەی پڕ ئاو نا دەریا

## 27

خوا ئەوەیانی بە چاك بینی و فەرمووی
با زەوی گیا بدات و گیاو گوڵ تۆبدا
درەختە بەردارەکانیش بەری وەك خۆیان بەرهەم بێنن
تۆوەکەی لە خودی خۆیدایە لەسەر زەویدا
هەر ئەوەی فەرموو، ئیدی زەوی چەقێن تا ئەو کاتە
کە بیابانێکی ڕووت و ناشیرین و بێ جوانی بوو

گیای تەڕو ناسکی لێ شین بوو
کە ڕوخساری کەونی زەوی
بە سەوزاتییەکی جوان داپۆشی
درەختی بە گەڵای جۆراوجۆر لێ شین بوو و یەکسەر گوڵیاندا
ڕەنگی جۆراوجۆریان گرتە خۆ و شادییان
بە ناو سینەی بۆندارو شیرینی زەویدا بڵاو کردەوە
هەرکە گوڵیان گرت مێوەکان پڕ بوون لە وشی ترێی چڕ

**28**

ئیدی کودی گەورەی شەمام خزی و گوڵەگەنمەکان
خۆیان و دڕووی خۆیان لە کێڵگەکانیان قیت بۆونەوەو
درەختیلەکان خۆیان و پرچی بۆریان تێکگیردەبوون
دواجار قیت بوونەوە وەك ئەوەی، سەما لە گەڵ درەختە زلەکان بکەن
درەختەکان چڵەپۆپەی خۆیان هەلاوێشت
بەروبوومێکی زۆریان پێوە دەلەرییەوە ، یاخود چرۆیان دەردەکردو
درەختی دارستانەکان گردۆلکەو بانەکانیان
بەسەر کەناری دوورودرێژی رووبارەکانەوە، بەگەڵاو گوڵی خۆیان تاجبەند کرد

**29**

زەوی ئێستاکە وەکو ئاسمان دیارە، شوێنێکە خوداوەندەکانی تیا دادەنیشێ
یاخود بەشادییەوە پیاسەی تیا دەکەن و
حەزدەکەن لەسێبەری پیرۆزی بسوورێنەوە
لەگەڵ ئەوەی کە خودا هێشتا بارانی بەسەر زەویدا نەباراندووە
هێشتا مرۆڤ زەوی نەکێڵاوە، هەتا ئێستاکەش نا
بەڵام پڕووشەی خوناوێکی تەڕین، تەواوی خۆڵ و شەتڵەکانی ئاودەدا

کە خودا بەرلەوەی لە زەویدا هەبێ، ئەفراندبووی
هەروەها بەر لەوەی گیاش، بەسەر قەدی سەوزییەوە شین ببێ

## 30

ئەوە ئێوارەو سپێدەی ڕۆژی سێهەم بوو
هێزوەند دووبارە کەوتە قسەکردنەوە و فەرمووی با چرا هەبێ
بەرزو بڵند بێ، تا شەوو ڕۆژ لێکبکاتەوە و
هێمای وەرزو ساڵە یەك لە دوای یەکەکان و ڕۆژەکان بێت
دەبا چراکان ڕووناك بن وەك چۆن فەرمانم داوە
با بارەگای ئەو چرایانە گومەزی ئاسمان بێت
تا ڕووناکایی ببەخشێ بە زەوی، هەرواش بوو
خوا دوو چرای گەورەی دورست کرد، گەورە لەبەر سوودیان بۆ مرۆڤ
چرای گەورە حوکمی ڕۆژێی دەکرد و بچکۆلە تریشی حوکمی شەوێی دەکرد
هەریەکەوبە نۆبەتی خۆیەوە، ئەستێرەی لە گومەزی ئاسمان ئەفراند
تا بە نۆبەی خۆی زەوی ڕووناك کاتەوەوحوکمی ڕۆژێ بکات
ڕووناکی لە تاریکی ترازاند، خوا هەمووکارە مەزنەکانی خۆی بینی
هەر هەمووی چاك و بێ خەوش بوون

## 31

سوڕگەیەکی گەورەی بۆ گەورەترین ئەستێرەی ئاسمانی داهێنا
کە خۆر یەکەمیانە، سەرەتا ڕووناك نەبوو
هەرچەندە لە مژادێکی هەوایی[1] بوو، هەرواش شێوەی مانگ خڕە

1- مژادی هەوایی یا مژادی ئەثیری، ملتون لێرە پەیڕەوی مەزهەبی یەکتایی دەکات کە هەموو شتێ لە مژادی ئەسشیری شێوە دەگرێ و هیچ شتێکی تر لە دەرەوەی ئەوەدا نییە.

هەر ئەستێرمیەکیش لە قەبارمیەکدایە، پەرش و بڵاوی ئەستێرە لە ئاسمانێ
وەکو تۆوی ناو کێڵگە وایە، هەموو وزمیەکی ڕووناکی خۆیانی
لە کونجی تەماویدا گواستەوە، پەرستگایەکی وەك خێمەی سێبەرینی[1]
لێ چاندو دانیایە ناو مەداری خۆرو هەندێ بۆشایی دروست کرد
تا ڕووناهی پیایا شلەی لێ وەرگرێ
بە تیشکی کەڵەکە بوو رەق هەڵدەگەڕێ
تەلارێکی مەزنی نووری لێ پەیدا بوو

## 32

پاشان دەبێتە ئەو بونیاتە گەورمیەی تیشك و
ئەستێرەکانی تردێنە ناو ئەو بونیاتەوە ، وەك ئەوەی کانی بێت
تیشکی ناو قاپە زێڕینەکانی لێوەردەگرن
ئەستێرەی سپێدانیش، ئەو تیشکە لە خۆر وەردەگرێ
تا شاخەکانی خۆی پێ بڕازێنێتەوە
ئابەمجۆرە وەرگرتنی تیشك و پێچەوانە بوونەوەی
نووری ئەستێرەی ئەسڵ زیاد دەکات
بەڵام دوورن زۆر دوور، لە چاوی مرۆڤەکاندا
ئەو دوورییە وامان لێدەکات، کە زۆر بە کزی ئەو ئەستێرانە بەدی بکەین
یەکەمجار ئەو چرایە گەشە، لە دەرکەوتەی رۆژهەڵاتەوە بینرا
وەك شای رۆژێ، ئاسۆش بە تیشکی گەش داپۆشراوە
بە شادییەوە لە رێگای سەرەوەی ئاسماندا
بە ناو فەلەکی وێناکراوی خۆیەوە دەسووڕێتەوە

## 33

1- خێمەی سێبەرین، ئەوە لای یەهوودییەکانەوە باوە کە لە بیابانی سینادا بەدیار کەوت.

سپێدەی سپی مەیلەو ڕەش و ئەستێرەی چڵچرا
پێش ئەوە دەستیان بە سەما کردبوو
موژدەی خۆشیان دەنارد و بریقەی مانگ کەمتر بوو
لە ئاسۆی رۆژئاواوە، لەلایەکەی تر ئاوا دەبوو
هەلاّتنی بەدر ڕووناکی لە ئاوێنەی چرای گەشەدارەوە وەردەگرت
بێئەوەی پێویستی بە تیشکێکی تر بێت، تا ئەو کاتەی شەو دادەهات
ئیدی دەوری ئەویش دەهات، تا لە خۆرهەلاّتی زەوی بگەشێتەوە
دوای ئەوەی کە بە دەوری ئاسمانی مەزن دا دەسووڕایەوە
ئەو کاتە سەردەمی مولکی ئەو دەستی پێدەکرد
ئەو تیشکە بریقەدارە کە ئاوادەبوو و پاشان هەڵدەهاتەوە
نیوەی تۆپی زەوی دەڕازاندەوە، کە بۆیەکەمین جار ڕازایەوە
شادی ئێوارەو شادی سپێدە، بوون بە تاجی سەری رۆژی چوارەم

## 34

ئینجا خوا فەرمووی: دەبا لە ئاوەکاندا خشۆکەکان بە بۆنێکی زیندوو
لە دایك بن و هێلکەی زۆر دانێنەوە
هەروەها باڵدارەکان بە باڵی کراوەوە، لە گومەزی ئاسمانی کراوەدا
بەسەر زەوییەوە هەڵبفڕن
خوا مارەکانی لە گەڵ هەموو ڕۆحە زیندووەکاندا ئەفراند
هەروەها ئەوانەشی ئەفراند، کە بەسەر سگیانەوە دەخشین
کە ئاوەکان ئەوانەیان زۆر بە وەلەد هێنا، لە هەموو ڕەگەزێکدا
ئەو باڵندانەش کە هەڵدەفرین هەریەکەو بەرەگەزی خۆیەوە
خوا ئەمەشی پیرۆزکرد و بە پوختە بینیانی

## 35

ئینجا فەرمووی: زاووزێ بکەن و زۆربن و دەبا دەریاو دەریاچەکان پڕ ببن
دەبا مەل لەسەرزەویدا زۆر بێت
یەکسەر قووڵایی دەریا و کەنداو و کەنارەکان
پڕ بوون لە ماسی بچووك بچووك
کە لە ژمار نەدەهاتن، تێکرا لە مەلە دابوون
رەوەی ماسیان خۆیان و باڵ و پولەکەی بریقەداریان
لە ژێر ئاوی سەوزدا، کۆمەڵ کۆمەڵ زاووزێیان دەکرد
دەتگووت شۆستەن لە ناوەندی دەریادا
جا تەنها بان یا لەگەڵ نێرەکانیان بوان
گیایان لە لەوەرگاکانی دەریادا دەخوارد
یا بەناو چینینی دەریاییدا، دەگەڕان و تیایا وندەبوون
یاخود ڕایاندەبواردو لار دەبوونەوە
کەوای بەزێر نەخشێنراویان بۆ خۆرەتاو دەکردەوە
یا لە چاوەڕوانی خۆراکی تەڕی ئاودا
لەسەرخۆ سەیری سەدەفە لوئلوء دارەکانیان دەکرد
یا خود خۆیان و زرێی بەریان، لە ژێرتاوێرەبەردەکاندا لە سایەدی دابوون

## 36

لەناو ئاوەکانەوە نەهەنگ و دۆلفینە هێڵدارەکان
لەکاتی یاریدا تەمبەڵ وەدیار دەکەوتن، بەڵام کە دەکەوتنە تاودان
ئەو کاتە زەبەلاحییان بەدیار دەکەوت
واگەورە بوون، ئاوی دەریایان شێلو دەکرد
هەروەها دێوی دەریا کە لە ژێر ئاودا
گەورەترین زیندەوەرە، بەناو دەریادا ڕادەکشا

وەك بەرزەك بە نووستوویی یا بەمەلەوانی هەڵدەكشا
وەك ئەوەی زەوییەك بێت و بجووڵێتەوە
ئاوی لە كونەلووتی فرێدەداو دەریای شەق دەكرد
بەناو قەدی خۆیەوە ئاوی دەریای ڕادەدا

## 37

ئیدی لەو كاتەدا ئەشكەوتی فێنك و كەنارو زۆنگاوەكان دەبینرا
هێلكەی مەلانی تیا دەترووكا، بەقەد ماسییەكان زۆر بوون
هێلكەكان بە خێرایی دەشكان و پارچە پارچە دەبوون
بێچووەكان بە ڕووتی دەهاتنە دەرەوە
هەرزوو تووكیان لێدەهات و هەراش دەبوون و پێدەگەیشتن
ئیدی بەرز بەرز لە ئاسماندا دەفڕین
هاواری كێزەوەنكردنی زەویان سەردەدات
كە ئێستا لە ژێر هەورەكانی ئاسماندا هێمای بۆ دەكەن
هەروەها هەلۆو لەكلەك هەن كە لانەی خۆیان
لە بەرزایی تاوێرەبەردەكان و لوتكەی درەختی ئیرزەوە چێ دەكەن

## 38

هێندێكیان بە ناو هەرێمدا دەفڕن، هەندێكیشیان زۆر بە حیكمەت ترن
بەشێوەی سەهم خۆیان ڕێكدەخەن و ڕێگەی خۆیان شەق دەكەن
بە وەرزەكانەوە دەژەنن، كاروانە هەواییەكانیان
بەرز بەرز بەسەر دەریاو دەشتاییەكانەوە
بە ماندووبوونێكی هاوبەشەوە دەكەونە ڕێ
ئەم هاوبەشییە ڕێی ئاسمانیان بۆ ئاسان دەكات
وەك چۆن كەراكیە حەكیمەكانو لە گەشتی ساڵانەیاندا وادەكەن

بایەکانیش پاڵپشتیان دەکردن ولە کاتی تێپەڕیندا
لە گەڵ بادا بە پەڕوپۆو ڕیشەوە، کە لە ژمارە نەدەهاتن شەپۆلیان دەدایەوە

## 39

باڵندە بچووکەکان بە گۆرانی دارستانەوە، لە چڵێ بۆ چڵێ خۆیان دەخافڵاند
باڵی ڕەنگینی خۆیان تاك دەکرد، تا کاتی شەو
هەتا ئەو کاتە بولبلێکی بە هەیبەت نەبوو لە چڕین بکەوێ
هەمیشە بە درێژایی شەو، ئاوازی بۆ گۆرانییە نەرمەکانی خۆی دادەنا
هەندێ مەلی ترلە دەریاچە زیوینەکان و ڕووبارەکاندا
سینەی کەفاویان دەشووشتەوە و قازیش ملی کەوانەیی خۆی
سەری لە بن باڵی سپی خۆی دەناو بەسەرسامییەوە سەرگەردان بووبوو
بە هەموو جیلوەو هەیبەتێکەوە، بە پێیەکانییەوە سەولی لێدەدا
زۆرجاران کە لە ئاو دەهاتە دەرەوە بە دووباڵی بە هێزییەوە
بەرەو ناوەندی ئاسمان هەڵدەفڕێ
هێندێ مەلی تر بە چەسپاوی، بەسەر زەویدا دەڕۆیشتن
وەك کەڵەشێری پۆپیتەدارو کە لە کاتە کپەکاندا
کەڕەنای خۆی دەژەنێ، تاوس کە بەکڵکییەوە
بەرەنگی پەلکەزێڕینە خۆی دەڕازێنێتەوە
چاوەکانی ئەستێرەیی ڕەنگاو ڕەنگ هەڵدەگەڕا
ئاوەکانیش بە هۆی ماسییەکانەوە ، چڕ دەبوون هەواش پڕ لە باڵندە دەبوو
ئەوکاتەش ئێوارەو بەیانی رۆژی پێنجەمی ئەفراندنی بەهەیبەت بوو

## 40

ڕۆژی شەشەم کە دوا ڕۆژی ئەفراندنە
بە موزیکی ئێوارانی سێتارو دروودی بەیانییانەوە هەلات
خوا فەرمووی: دەبا زەوی ڕۆحێکی زیندوو لە ڕەگەزی خۆی بزایەنێ
مێگەل و خشۆکەکان و کێوییەکانی سەرزەوی
هەموویان لە جنسی خۆیانن ئیدی زەوی گوێڕایەڵی کرد و
یەکسەر ڕەحمی بە پیتی خۆی کردەوە
کۆمەڵە ئەفرێنراوێکی زیندووی بە تەواوی شێوەیانەوە
هێنایە زایین، کە لە ژمارە نەدەهاتن
بەتەواوی دەست و پێیانەوە، لەزەویدا هەڵدەسانەوە
وەك چۆن کێوییەکان لە نێو دارستانی دەشتایی و دەغڵ
یا لەبن گەلاوگوڵ یا لە ناو لانەکان، لە لانەی خۆیان هەڵدەسانەوە
ئیدی هەر ژن و مێرد بوو، بەیەکەوە لە ژێر درەختەکانەوە بوون

## 41

مەڕوماڵات، مێگەل مێگەل چوونە لەوەڕی لەوەڕگا سەوزەکان
ئاژەڵە کێوییەکانیش گۆشەگیرو تاك تاك بەیەکەوە دەلەوەڕان
ئەو قەبارە قووڕینانەی کە سەر بە قۆپەنە گیابوون شەقیان برد
پاشان نیوەی پێشەوەی شێرێکی لێبەدیار کەوت
چڕنووکی لە زەوی دەخشاند تا پێیەکانی
لە قووڕدا رزگاریان بێت ، پاشان دەتگووت دیلە
لە کۆت و پێوەند رزگاری بووە، ئاوا تاوی دەدا
دەهات و دەچوو و دەیمڕاندو بژی پشتی ملی ڕادەتەکاند
دوای ئەویش پڵنگ و قرتێنەرەکان لە زەویدا قیت بوونەوە
کە خۆیان لە خۆڵی زەوی ڕادەتەکاند، گەردەلوولیان دروست دەکرد
دوایی ئاسکی تیژغار، لە ژێر زەویدا هاتە دەرەوە

بەشاخەکانی خۆی زەوی هەڵدەڕنی و دەهاتە دەرەوە
هیچ شتێ وەکو هەیکەلی فیل نەبوو لە زەبەلاحیدا
کە لەزەویدا لە دایك دەبوو، شانە گەورەکانی بەرز دەکردەوە
دواییش ئەوانە هاتنە دەرەوە، کە فەرومیان هەبوو و دەیانباعاند
وەك چۆن ڕووەکەکان، پاشان ئەوانەی لە ئاوو و وشکاییدا دەژین
وەك ماینی دەریایی و تیمساحی پێست ڕەق
هەموو ئەوانەیش لە کرم و مەگەزو هەموو ئەوانەی
وەك پانکە دەجوڵێن، لە جیاتی باڵ
کە بە سەر زەویدا دەخشین، بەیەکەوە هاتنە دەرەوە

## 42

وردترین ئەندامیان لەگەڵ بچووکترینییان ڕێك و گونجاو بوو
کەوای بەریان بە پەڵەی هاوینی جوان رازابۆوە
بە ڕەنگی زێڕو ئەرخەوانی ئاوڕێژ کرابوو
ئەوانی تریش لە یەك ڕێزەی درێژدا خۆیان ڕێکخستبوو
بەسەرزەویدا دەڕۆیشتن و جێ پێی ڕوون و قووڵی خۆیان بەجێدەهێشت
هەموویان زیندەوەری بچووك نەبوون لە سروشت دا
وردەکانیان جۆری سەیر سەیریان هەبوو لە درێژیاندا
وەك کەپکەی مار[1] لوولیان دەخوارد و باڵیشیان زیادی دەکرد
پاشان مێروولەی ڕژد و ئامادە، دەخشی و زەخیرەی بۆ ئایندە پاشەکەوت دەکرد
لە ناو قەبارەی بچووکی خۆیدا، دڵێکی گەورەی هەڵگرتبوو
ڕەنگە ببێتە نموونەی یەکسانییەکی بە ویژدان
پاشان چوونە ناو قەوم و قیلەی خۆیانەوە

1- وەک گۆپکەی مار ... رافایل باسی جۆرە مارێ دەکات، باڵی هەیە.

دواییش  ئاپۆڕمیێ لە مێینەی هەنگ هاتن
کە نێرەی خۆیان لە لای دواوە، بە خۆشترین شت تێر دەکرد
ئەو شانە هەنگوینانەیان بونیات دەنا، کە پڕبوو لە شەهدی هەنگوین
زیندەوەرەکانی تر کە لە ژمارە نایەن
تۆش شارەزای سروشتی ئەوانی، دەزانی و ناوی خۆیانم داونەتێ
مار زیرەکترین وەحشی ناو کێڵگەیە
هەندێجار قەبارەی گەورەیە و دوو چاوی برۆنزی هەیە، بژێکی زۆری
تووکنی هەیە، ئازاری بۆ تۆ نییە، بەڵکو ئەوەی دەڵێی جێبەجێی دەکات

## 43

ئێستا ئاسمان بە هەموو گەورەیی خۆی
جیلوەی داوەو دەستی بە جوولە کردووە
هەروەها دەستی یەکەمی بزوێنەری مەزن، ڕێڕەوەکەی دەستیشان کردووە
زەوی بە جلی دەوڵەمەندی خۆیەوە، بۆ تەواوبوونی جوانی خۆی پێدەکەنێ
لە ناو هەواو خاکدا مەلەکان، بە کۆمەڵی گەورە گەورەوە هەڵدەفڕن
لە ئاوەکانیشدا ماسی مەلە دەکەن
ئاژەڵەکانیش بە ژمارەیەکی زۆرەوە بەڕێوەن
کەچی هێشتا ڕۆژی شەشەم هەر ماوەو کارە مەزنەکە ئەنجام نەدراوە
کە هەموو کارەکانی تر بۆ غایەتی ئەو کارە مەزنە ئەنجامدراوە
ئەویش ئەفراندنی ئەوانەیە،  کە لار نابنەوە
وەك ئەفرێنراوەکانی دیکە کێوی نین، ئەقڵێکی پیرۆزیان پێ بەخشراوە
دەتوانی شان و باڵای خۆیان قیت بکانەوەو بەسەر پێکانیان بوەستن
ڕوخساری جوان و ڕازاوەیەو فەرمانڕەوای هەمووانە
خۆیان دەناسن و دڵێکی مەزنیان هەیە
دەتوانن قسە لە گەڵ ئاسمان بکەن
خاوەنی فەزلن دان بەو خێرو چاکەیە دەنێن، کە بۆیان هاتۆتە خوارەوە

بەدڵ و دەنگ و چاوەکانیان خوا دەپەرستن و سوژدە دەبەن
درووود بۆ خوا دەنێرن
کە ئەوانیان کردۆتە سەرۆکی هەموو کارەکانی خۆیان
بۆیە خاوەن توانای هەمەکین و – کە لە هەموو شوێنێ ئامادەن -
بە ڕوونی قسە لەگەڵ تاقانەی خۆی دەکات

## 44

با ئێستاکە ئینسان لە شێوەی وێنەی خۆمان بئافرێنین
ئەو ئینسانەی بە ئێمە دەچێ و وای لێبکەین
کە لە دەریاو لە هەواد، حوکمی ماسی و باڵندە بکات ا
هەروەها حوکمی هەموو ئەوانەی بەسەر زەویدا دەخشێن
کە خودا ئەوەی فەرموو، ئەوە تۆی
لە خۆڵی زەوی ئەفراند ئەی ئادەم، ئەی پیاو
هەناسەی خستە ناو لووتت کە هەناسەی ژیانە
تۆی لە وێنەی ئەو ئەفراند، لە وێنەی خودا جیلوەدات
تۆ بوویتە نەفسێکی زیندوو، تۆی بە نێر ئەفراند
بە لام ژنەکەتی بە مێ ئەفراند ، تا ڕێ و ڕەچەلەکتان نەبڕێتەوە
مرۆڤایەتی پیرۆزکردو گووتی:
بەرهەم بێنن و زۆر بن و زەوی پڕکەنەوە
بیخەنە ژێردەستی خۆتان و دەستی بەسەردا بگرن
دەست بەسەر ماسی دەریاو باڵندەی ئاسمان و هەموو
ئەو شتانەی کە لەسەر زەوی دەجووڵێنەوە بگرن
لە هەرشوێنێ کە تۆی خەڵق کرد
هیچ شوینێ نییە ناوێکی هەبێ و پێی بناسرێ
بۆیە وەك دەزانین تۆی هێنایە ناو ئەو دارودرەخت و گەڵاو گوڵەو
ئەو بەهەشتەی درەختی خوای تیادا چاندراوە
کە زەوق و نیگا شاد دەکات

## 45

تۆش ئازادی چ بەرهەمەمێکیان دەخۆیت، پێشکەشتی دەکەم
هەموو شتێ کە زەوی بەرهەمی دەهێنێ
کە جۆراوجۆرن و کۆتایی نایەت، تەنها بەری ئەو درەختە نەبێت
کە تامەکەی دەبێتە هۆی پەی بردن بە خێرو شەڕ
ئەوە لەو درەختە وەنزیك نەکەونەوە
لەو ڕۆژەی کە بەری ئەو درەختە بخۆی، ئەوە دەمریت
مەرگ سزای خواردنی بەری ئەو دارەیە، ئاگاداربە
باش نەوسی خۆت بگرە
ئەگینا ئەو گوناهە لە ناکاو تووشت دەبێ، لەناکاویش دەمریت
لێرەوە کاری خۆی تەواو کرد و هەمووی ئەوانەی بینی کە ئەفراندبووی
بینی کە ئەوە بە تەواوی کاری پەختەوباشن
ئیدی بەم ئێوارە و سپێدەوە رۆژی شەشەم تەواو بوو

## 46

ئەو کاتەی ئەفرێنەر لە کاری خۆی بۆوە وەستا
بێ ماندوو بوون وەستاو سەرکەوت
گەڕایەوە بۆ ئاسمانی ئاسمانان، شوێنە بەرزەکەی(١)
پاشان سەیری ئەو جیهانە تازە ئەفرێنراوەی کرد
کە کەوتە سەر ئیمبراتۆریەتی ئەوەوە
چۆن لە عەرشی ئەوەوە بەدیار دەکەوێ
چەند باش بوو، چەند جوان بوو
کە بیرۆکەی مەزنی خۆی بەدیهێنا، بۆ سەرەوەی لێخوڕی
بە نێو هوتاف و دەنگی سەمفۆنی هەزاران سێتارەوە

1- شوێنە بەرزەکە مەبەستی ئەمپریۆم ە واتە ئاسمانی هەرە بەرز.

کە لە زەوی و ئاسماندا، ئاوازی فریشتەیان دەژەنی
دەنگی دەدایەوە - ئەوەت لەبیر بێت گوێبیستی بوو -
هەموو ئاسمان و ئەستێرەکان دەیانچڕی
ئەستێرەکان هەموویان وەستان و لە شوێنی خۆیان گوێیان قولاغ کردبوو
لە کاتێکدا سروود و دروود بە شانازییەوە بەرز دەبوونەوە سروود بچڕن
ئەی دەرگا سەرمەدییەکان، ئێوەش ئەی ئاسمانەکان
دەرگا زیندووەکانتان بکەنەوە، تا ئەفرێنەری مەزن بێتە ژوورەوە
ئەو لە کاری مەزنی خۆی گەڕاوەتەوە
بە شەش ڕۆژ کار، جیهانێکی تازەی ئەفراند

## 47

ئەی ئاسمان با دەرگات کراوە بێت
چونکە خوا زیارەتی مرۆڤە ڕاستەکان دەکات
دڵخۆشەو هەمیشە لە گەڵیانە
پەیامبەرە باڵدارەکانی خۆی بۆ لایان دەنێرێت
تا کارەکانی خۆیان بە نیعمەتێکی تەواوەوە ئەنجام بدەن
بەمجۆرە ئەو کۆمەڵە باشە، بۆ ناو ئاسمان سەردەکەوتن و سروودیان دەچڕی
ئاسمانی کلپەدار دەرگای پان و پۆڕی خۆی کردەوە
هەموویان چوونە ناو ماڵی ئەبەدی خودا و ڕێگەی خۆیان دەبڕی
ئیدی بە ڕێگەی پان و پۆڕی کاکێشاندا ڕەت بوون
ئەو ڕێگایەی کە شەوانە لەئاسماندا دەیبینی
هەرێمێکی بازنەییەو ئەستێرەی لێ هەڵدەڕژێ

## 48

ئێستاکە شەوی حەوتەمی زەوی، لە عەدن دا بە دیار دەکەوێ
چونکە خۆر ئاوا بووەو ڕۆژ لە شەفەقدا بەدیار دەکەوێ

پێش شەو دەکەوێ، لەوکاتەی لەسەر چیای پیرۆزدا
بەسەر ترۆپکی بەرزی ئاسمانەوە
کە عەرشی بەرزی خودایە
چەسپاوو ئاسایشمەندە تا ئەبەد
ئەوسا گەیشتە دەسەڵاتی بونیاتتان
بەشێوەیەکی نادیار لەگەڵ باوکی مەزنیدا دانیشت
لەگەڵ ئەوش لەوێدا مایەوە
ئەوشیان نایابە و فەرمانی بە کارکردن دا

## 49

هەموو شتێکی ئەفراندی و هەموو شتێکی کۆتایی پێهێنا
رۆژی حەوتەمی پیرۆز و موبارەك کرد و ئێستا دەحەسێتەوە
بەڵام ئەو پیرۆزمەندە بێدەنگ نەبوو، سێتارو سێتاری بەهەیبەت و
هەموو ئەرغۆنە خاوەن ریتمە شیرینەکان و
هەموو دەنگەکانی سێتاری بەسەر ژێی نەرم و رێکی ژەنی و نەحەسایەوە
تێکەڵ بە دەنگی کۆرالی گونجاودا دەبوو
هەوری بخوردیش، لە هەڵمێنەری زێڕین هەڵدەستا و چیای دەشاردەوە
بۆ ئەفراندن و کارەکانی رۆژی شەشەم گۆرانیان دەچڕی

## 50

وای خودایە کارەکانی تۆ چەند مەزنن، هێزی تۆ رەهایە
چ بیرۆکەیێ دەتوانێ وەسفت بکاو چ زمانێ دەتوانێ باست بکات
گەڕانەوەی تۆ ئێستاکە مەزنترە، لە گەڕانەوەت لە لای فریشتە فەلامەرزەکان
لەو ڕۆژەدایە هەورەتریشقەکانت، گەورەیی و مەزنی تۆن

بەڵام خەڵق بکەی مەزنترە لەوەی، ئەوەی خەڵقت کردووە وێران بکەی
کێ دەتوانێ تۆ بێهێز بکات، یا ئیمبراتۆرییەتی تۆ دەست نیشان بکات
بە ئاسانی هەوڵە پڕ شانازییەکانت بەسەر ئەنجەمەنەکان و
رۆحە هەڵگەڕاوەکاندا زاڵ بوو، تێکتشکاندن
لە کاتێکا وابیر دەکەنەوە کە تۆ کۆتاییت هاتووە
هەندێ لە پەرستکارانی تۆیان بۆ لای خۆیان ڕاکێشا
ئەوەی هەوڵ بدات تۆ ڤێزومن بکات، مەبەستەکەی نایەتە دی
هێزی تۆ زیاتر بەدیار دەکەوێ و لە خراپە چاکە دروست دەکات

## 51

ئەو جیهانە تازەیە بەدی دەکەین
کە ئاسمانێکی ترە لە دەرگای ئاسمانێکی زۆر دوورنا
لە دیمەنی بەللورێکی ساف قیت کراوەتەوە
بەسەر دەریایەکی بەلووری فراوان و گەورەو پڕ ئەستێرە
فراوانە و لەوانەیە هەر ئەستێرەیەکی جیهانێ بێت
وا تەقدیر کراوە کە ئاوەدان بێت، شوێنی مرۆڤی تیایە
کە لەسەر زەوییە، لە گەڵ چێوەی خوارەوە کە دەورەیان دەدا
شوێنی دانیشتنیان جوانە، ئەو مرۆڤانە لە سێ لاوە بەختەوەرن
هەروەها منداڵەکانیان کە خوا لە شێوەی خۆی ئەفراندوونی
ئابەمجۆرە جێگیر بوون و خودایان پەرست
خوا پاداشتی ئەوەی داونەتێ کە دەسەڵاتیان
بە سەر کاری خۆیانەوە هەبێت
لە زەوی و لە ئاسمان و لە دەریا
لە گەڵ زۆرانێکی تر کە بە قەداسەو دادەوە دەیپەرستن

ئەوانە لە سێ لاوە بەختەوەرن[1]، ئەگەر بە بەختەوەری خۆیان بزانن
یا پارێزگاری لە ڕاستەڕێی خۆیان بکەن

## 52

ئابەمجۆرە کەوتنە گۆرانی چڕینەوە
هەرواش بوو سروودی ئیمبریۆمی هالیلۆیا ڕۆژی شەممە
وام باوەڕە کە ئێستا ئەوەم وەڵام دایتەوە
کە پرسیارت لە بارەیەوە کرد، کە دونیا چۆن خەڵق بووە
لە سەرەتاوە، سەرەتای هەموو شتێ
ئەوەی کە ڕوویدا بەر لەوەی لە سەرەتادا زەینت کار بکات
بەو جۆرەی کە خەبەری نەوەکانی داهاتوو دەدەی
ئەگەر تەمای شتێکی ترت هەیە، سنووری پێوانەی مرۆڤ ڕەت بکات بێژە

1- لە سێ لاوە بەختەوەرن – هەق و چاکەو جوانی – یاخود باوەڕو خۆشەویستی و هیوا
یا دایک و کوڕو ڕۆحی قودس، لێرەدا دیار نییە کام لەو سێیەی مەبەستە.

# 1

فریشتەکە کۆتایی بە قسەکانی خۆی هێنا
سیحری دەنگی خۆی، لە گوێچەکانی ئادەمدا بەجێهێشت
ئادەم هەتا ماوەیەکیش وایدەزانی هەروا ئەو قسە دەکات
بە هەست خوستەوە گوێی ڕادێرا بوو
ئینجا وەك ئەوەی بەئاگا هاتبێتەوە
بە سپاسەوە وەڵامی دایەوەو گوتی:
بەتەنها سپاس بەس نییەو هیچ شتێ ئەوە پڕناکاتەوە
ئەی مێژووناسی پیرۆز، ئەی ئەو کەسەی
کە تێنوێتی منی شکاند بۆ زانست و زانیاری
تۆ زۆر بە خۆشەویستییەوە بۆ من دابەزیت
تا هەندێ شتی ترم بۆ بگێڕیتەوە، کە من بەدویدا نەدەگەڕام
ئێستاکە بە سەرسامییەوە بەڵام بە دڵخۆشییەوە، بیستم
ئەرکی سەر شانمە درووود بۆ ئەفرێنەری باڵا بنێرم
لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ شت ماوە جێی گومان بێت
کەس ناتوانێ شیکاری بکات، تۆ نەبیت
کە سەیری ئەو کەونە جوانە دەکەم، لە زەوی و ئاسمان پێکهاتووە
حسێب بۆ ئەو گەورییە دەکەم
وای دەبینم ئەم زەوییە، پارچە دەنکێکی بچووکە
بە بەراورد لە گەڵ گومەزی ئاسمان و ئەستێرە زۆرەکانی
کە وابەدیار دەکەوێ لەو بۆشاییانەدا دەخولێنەوە
هەرگیز ناتوانرێ دەرکی پێبکرێت
هەر ئەوەشە کە مەودای دوورو گەڕانەوەی خێرایان دەوروژێنێ
تەنها بۆ ئەوەی شەوو ڕۆژ ڕووناکی خۆیان
بۆ دەوروبەری ئەو زەوییە خۆشەو بۆ ئەو پارچە بچووکە بنێرن
لە هەموو پانتایێکی گەورەیدا، شتێکی تر نییە جگە لەوە

ئەوش وای لێکردووم سەرسام بم
کە ئاخۆ چۆن حیکمەتی سروشت و تەگبیری سروشت
ئەو جیاوازییە دروست دەکات و بە دەستێکی کەرەمەوە
ئەو هەموو ئەستێرە مەزنانەو ئەو هەموو گۆڕانکارییە
بۆ ئەوە بەکاردەهێنێ و دەئافرێنێ
لەبەر ئەوەیە بەدیار دەکەوێ و رۆژ لە دوای رۆژ
ئەو سووڕانەوەیە بەردەوامە و فەرزی سەر سووڕگەکانی دەکات
کەچی زەوی بۆخۆی دانیشتووە
ئەوە بۆ ئەو باشترە، کە چوارچێوەیەکی وا بچووکی هەیە
ئەوی لەو باشترە خزمەتی ئەو دەکات، بێ جووڵە دەگاتە مەبەستی خۆی
وەك ئەوەی باجی خۆی وەردەگرێ، لەو سەفەرەی
کە خێرایی رۆحییەکەی و فێنکی ڕووناکییەکەی سنووریان بۆ نییە
ئەوشیان خێراییەکی ئاوایە، کە هیچ ژمارەیێ ناتوانێ وەسفی بکات

## 2

باوە گەورەمان ئاوا قسەی کرد، لە ڕوخساریا وا بەدیار دەکەوت
کە دەچێتە ناو بابەتگەلێکی بەڕاستی و نادیارەوە
لەوکاتەی حەوا لە تەکیەوە دانیشتبوو، هەستی بەوە کرد
تاك و تەنها بە تەنهاییەکی پڕ لە جیلوەو بە گران و سەگینییەوە
هەتا ئەوەیش کە ئەوی دەبینی، تەمەنای دەکرد دانیشێ
پاشان هەڵسایەوەو چووە ناو میوەو گوڵەکانەوە
بەناویانا دەسووڕایە، کە چرۆیان کردبوو وگوڵیان دابوو
دوای بایەخ پێدانییەوە، هەموویان لەبەریا هەڵسانەوە
هەموویان کەوتنە ژێر کاریگەری لوتفی جوانی ئەوەوە
ئیدی بە دڵخۆشی کەوتنە خەوەوە، لەگەڵ ئەوش بەجێی نەهێشتن
هەرچەند ئەو قسانە دڵخۆشی نەدەکرد

گوێکانی نەیدەتوانی بگاتە ئەو ئاستە بەرزەی ئەو قسانەوە
دڵی ئەویان خۆش دەکرد، ئەگەر ئادەم بیگێڕابایەوە، ئەو تاکە گوێگر بوو
ئەوەی بەباش دەزانی کە گێڕەوەندە بەر لە فریشتە
مێردی ئەو با، پرسیارەکەی خۆی بۆ پاشان هەڵگرت
ئەو دەیزانی کە ئادەم ئەو قسە جوانانە تێکەڵ بە یەکدەکات
چونکە ئەو گەورەترین کێشی خۆی، بە دەسبازی ژن و مێرایەتی ڕایی دەکات
بەتەنها بە قسە سەرسام نەبوو

## 3

ئێستا لە کوێ ئەوجۆرە ژن و مێردە بدۆزینەوە
کە ئاوا  بە خۆشەویستی و ڕێزگرتنی یەکترییەوە، پەیوەستن بە یەك؟
وەك فریشتە کەوتە ڕۆیشتنەوە، بێ ئەوەی دەست و پێوەندی هەبێت
وەك ئەوەی شاژنی کۆڕەوێکی جوان و دڵڕفێن بێ
دەوروبەریشی هەموو تیروەشێن بوو
وای لە چاو دەکرد، کە هەمیشە حەزیان لە بینینی بێت
ئەو کاتە رۆفایل ڕووبەڕووی گومانەکانی ئادەم بۆوەو گووتی:
لۆمەت ناکەم بۆ ئەو پرسیارەو ئەو بە دوا داگەڕانەت
چونکە ئاسمان کتێبی خوایە لەناو دەستی تۆ دانراوە
هەموو کارە سەرسام ئامێزەکانی دەخوێنیتەوە
فێری وەرز و سەعاتەکان و رۆژو مانگەکان یا ساڵەکان دەبیت
تا بزانی ئاخۆ ئاسمان دەجووڵێ یا زەوی؟

## 4

گرنگ نیە ئەگەر بەڕاستی بیرت کردبێتەوە
چونکە ئەندازیاری گەورە، خەڵکەکانی تر و فریشتەکانی بە
حیکمەتەوە لەبەر چاوان پەنهان کردووەو نهێنییەکانی ئاشکرا نەکردوون
تا تەنها ئەوانەی لەسەریانەوەن ئاگاداریان بن و سەرسامیش بن
یاخود ئەگەر هەوڵیان دا تەخمین بکەن و بزانن
ئەوە دەبینن کە تەونی ئاسمانی، بۆ ئەوە جێهێشتووە
تا ببێتە جێگەی جیاوازبوونیان
لەوانەیە بۆ ئەوەبێ، تا بەزمی بیروڕایان بوروژێنێ
کاتێ کە ڕووبەڕووی چۆنیەتی ئاسمان دەبنەوە و
حسێبی ئەستێرەکان دەکەن، کە چۆن چۆنی
ئەو چوارچێوە مەزن و گەورەیە بەرزەفت دەکەن
یا چۆن دروستی دەکەن و دەیڕمێنن ؟
ئەو شتانە دادەهێنن بۆ ڕاست کردنەوەی دیاردەکان

## 5

یاخود چۆن بە چەند بازنەیەکی خڕ یا ناخڕ ، دەوری سووڕگەکان دەدەن
بازنە بێ یاخود نیو بازنە، یا سووڕگە لە سووڕگەدا
من هەر ئەوەم هەڵێنا، لە چۆنیەتی لێکدانەوەکانی تۆ
دەبێ ڕابەرایەتی نەوەکانت بکەی و وای دانێی
کە قەبارەی تیشکدەر و گەورە، خزمەتی شتێ ناکەن، کەمتر تیشکدەر بێت
هەروەها ئاسمانیش ناسووڕێتەوە، لە کاتێکا زەوی لە شوێنی خۆی چەسپیوە
ئەوەیان تەنها ئەو چاکەی بەردەکەوێ
یەکەمجار بیر بکەرەوە، گەورەیی و هەڵاتنی ئەستێرە ناچێتە ناو ئیمتیازەوە

زەوی هەرچەند بچووکە، بەبەراورد لە گەڵ ئاسمان، نادرەوشێتەوە
بەشێکی گەورە لە ڕۆژ دەگرێتە خۆ، کە بۆ ئەبەد دەگەشێتەوە
کارە زاتیەکانی کاریگەر نین بەسەرییەوە
هەروەها زەوی ئەو ئەسێرە ڕووناك کەرەوە نیە
خزمەتی خۆی پێشکەشی تۆ دەکات
ئەی ئەو کەسەی کە نیشتەجێی زەویت

## 6

سەبارەت بەبازنەی ئاسمانی پان و پۆرەوە
با قسە بۆ مەزنی ئەفرێنەری بالا بکەین، کە بە بۆشاییی ئەفراندوویەتی
هێڵەکەشی دوورودرێژ دەبێتەوە، هەتا مرۆڤ بزانێ
کە ئەوە شوێنی تایبەتی ئەو نییە
ئەو دامەزراوە گەورەترە لەوەی، کە بە تەنها ئەو پڕی بکاتەوە
ئەو لە شوێنێکی بچووك دادەنیشێ
ئەوەی دەمینێتەوە، گرنگی خۆی هەیە،تەنها خوا دەیزانێ چییە
بەڵام سەختە حسێب بۆخێرایی ئەو ئەفلاکانە بکەیت
دەبێ بیگەڕێنیتەوە بو قودرەتی خوا
کە قودرەتی بەسەر هەموو شتێکەوە هەیە
کە توانیویەتی ئەو خێراییە ببەخشێتە ئەو مژادە، وەك بڵێی خێرایی ڕۆحییە
ڕەنگە وا خەیاڵ بکەیت کە من خێرام و لەسەرخۆ نیم
ئاوا لە سپێدەوە بەردەوامیم بە سەفەرەکەم داوە بە ناو ئاسماندا
کە عەرشی خوایە و بەر لە نیوەڕۆ گەیشتوومەتە عەدن
کە مەودایەکەوبە ژمارەی ئەو ئەستێرانەی کە دەیزانین، سنووربەند
ناکرێن

## 7

بەمەوە بزاوتی ڕێپێدراوی ناو ئاسمان دەسەلمێنم
تا ئەو هەڵەیەی تۆ بە دیار بخەم
کە وای لێکردی، بکەویە ناو گومانەوە، بەڵام ناتوانم دڵنیا بم
هەرچەندە وا بۆ تۆ بە دیار دەکەوێو ئەی ئەوکەسەی نیشتەجێی زەویت
خوا نهێنی خۆی لە دەرك پێکردنی مرۆڤ شاردۆتەوە
ئاسمانی دوور لە زەوی بونیات ناوە
بەو چەشنەی ئەگەر چاوی زەمینی شتێ ببینێ
ئەوە هەڵە دەکات، لە هەڵسەنگاندنی شتە زۆر بەرزەکاندا
هیچ سوودێکی دەست ناکەوێ
ئەی چی دەڵێی ئەگەر خۆر چەقی جیهان بێت
ئەستێرەکانیش بە هێزی ڕاکێشانی خۆرو
ڕاکێشانی تایبەتی خۆیانەوە، بە چەند دەورمیەکی جیا جیا
سەما بە دەوری ئەوەوە بکەن؟

## 8

سووڕانەوەکان هەندێجار بەرزن و هەندێجاریش نەوی
هەندێجار پێشدەکەوێ و هەندێجاریش پاشدەکەوێ
یاخود لەشوێنی خۆیدا چەسپیوە
وەك چۆن لە شەش ئەستێرەکانی تردا دەبینرێ
ئەدی حەوتەم ئەستێرە چی، کە زەوییە، هەرچەند بێجووڵە بە دیار دەکەوێ
بەڵام بێئەوەی هەست پێبکەی دەجووڵێ؟
سێ جووڵەی جیاواز دەجووڵێ
ئەگینا دەبێ بیبەیتەوە سەر چەند سووڕگەیەك
کە بەپێچەوانەی یەکتر دەسووڕێنەوە

لەگەڵ چەند لەڕێ لادانێکی لار
یاخود خۆرمتاو لە کاری خۆی وەلا دەنرێت
هەروەها لەو خێرایییەی کە شەوو رۆژ فەرزی دەکەن
کە هەموو ئەستێرەکان بە تیشکی خۆی دادەپۆشێ
ئەوە پێچکەی رۆژێیە، بەبێ ئەوەی پێویستی بە باوەڕی تۆ بێت
ئەگەر زەوی چالاك بێت لە خۆیدا
ئەوە رۆژ بۆلای خۆی دەهێنێ، بە ئاقاری خۆرهەلاتدا
بە بەشە پێچەوانەکەشی شەو دەهێنێ
بەشەکەی تریشی، بە تیشکەکانی بەڕووناکی دەمینێتەوە
ئەی ئەگەر ئەو تیشکەی، کە لە ڕێگەی فەزای ڕووندا
مانگ بۆ ناو زەویی دەنێرێ، ئەوە وەك ئەستێرە رۆژێ، ڕووناك دەکاتەوە ؟
وەك چۆن ئەستێرە شەو ڕووناك دەکاتەوە

## 9

ئەو زەوییە،شتێکی جیاوازە، ئەگەر زەوی هەبێت
هەروەها کێڵگەو ئەو بستە زەویانەی
کە وەك هەور دەیانبینی، هەوریش باران دادەکاو
بارانیش بەرهەم لە زەوی نەرمدا بەرهەم دێنێ
هەندێ ئەو بەرهەمانە دەخۆن، ئەگەر لەوێ دابەشکرێ
هەندێ خۆری تر لەوانەیە مانگیان بە دوا دا بێت
دەیانبینین، تیشکی نێرو تیشکی مێ دەنێرێ
ئەوەش دوو ڕەگەزی زیندوون، جیهان زیندوو دەکەنەوە
کە لە هەموو سوڕگەکان خەزن کراوە
لەوانەیە لەگەڵ هەندێ لە زیندووەکاندا بێت
سەبارەت بەو فەزایە گەورەیە لە سروشتدا
کە موڵکی هیچ زیندووێك نییە، بۆتە بیابان و جێهێڵراوە

تەنها دەدرەوشێتەوە، هەر ئەوەتا لە هەموو سوورِگەکان
بەکورتەیێ لە تیشك بەشداری دەکات، دوور دوور بۆ خوارەوەی دەبات
بۆ ئەستێرەی نیشتەجێ بوو، کەتیشکی بۆ دەگەرِێنێتەوە
ئەویش کراوەیە بۆ گفتوگۆ

## 10

بەلاّم ئەگەر ئەو شتانە وابێت، یانەبن
ئەگەر خۆر زاڵە بەسەر ئاسمانەوەو بەسەر زەوی دا هەڵبێت
یاخود زەوی بەسەر خۆرەوە هەڵبێت
ئەگەر خۆر لەخۆرهەلاّتەوە دەست پێبکات و سەرکەوێت
یاخود زەوی لە خۆراوا، رێگەی کپی خۆی
بە هەنگاوی بێگرفت دەست پێ بکاو
بەسەر سوورِگەی نەرمی خۆیەوە
چاوێنی لەگەڵ خەو بکات، لە کاتێکا راست برِوات
کپی هەوای نەرم بۆ تۆ بهێنێ؟
ئەوە تۆ بیری خۆت بە کێشەی پۆخڵەوە خەریك مەکە
بۆ خوای جێهێڵە لە سەرەوە، لێی بترسێ و خزمەتی بکە
بەلاّم ئەفرێنراوەکانی تر، زۆر پێی شاد دەبن
لە هەر کوێ بن، لێگەرِێ با چی دەکەن بیکەن
شاد بە بەوەی، کە فیردەوس و حەوای جوانی داوە بە تۆ
ئاسمان زۆر بەرزە بەسەر تۆوە
بۆ ئەوەی بزانی کە چی لەوێ روودەدات، حەکیم و خاکەرابە
تەنها بیر لەوە بکەوە، کە بۆ بوونی تۆ چی گرینگە
خەون بە جیهانی ترەوە مەبینە
هەروها خەون بەو ئەفرێنراوانەی، کە لەوێ دەژین مەبینە

کە چۆنن و زروفیان چۆنەو پلەیان چەندە؟
زەوی زۆری هەیە بۆ تۆ ئاشکرا بووە
نەك هەر لەسەر زەوی بەڵکو لە ئاسمانی باڵاشەوە

## 11

ئادەم کە ئەو گومانانەی لا ڕەوییەوە وەڵامی دایەوە:
وای ئەی فریشتەی ئاسمانی ساف، تۆ چەند تێرت کردم
ئەی فریشتەی لەسەرخۆ، منت رزگار کرد لە ئاڵۆزییەکان
فێرت کردم بە شێوەیەکی سادەتر بژیم، نەك بەبیرۆکەی سەرسامکار،
کە شیرینی ژیان ناخۆش دەکات
کە خوا فەرمایشتی بە ئێمە کردووە، دوورکەوینەوە
لە هەموو شتێکی نێگەرانسازو خۆمان وەڕەس نەکەین
هەروەها خۆمان خەریك نەکەین، بە بیرۆکەی پووچ و سەرگەردان
بەڵکو بەوەی کە شایەنی بیرۆکەو خەیاڵن و بێ تەگەرە
بێن و بچن، سنوورێك بۆ هاتووچۆیان نییە
تا ئەو کاتەی دەرك بە مەترسی دەکەین
یا بە ئەزموون فێری دەبین، کە وای دەبینێ، کە دەبێ
سەبارەت بەو شتانەی لە ئێمەوە دوورن، ئەوەندە نەزانین
کە نادیارو شاراوەن، بەڵکو دەربارەی ئەو شتانە بزانین
کە لەبەر چاومانن و لە ژیانی ڕۆژانەدا هەن
ئەوە یەکەم حیکمەتە، بەڵام ئەوەی لەسەر ئەو حیکمەتەیەوەیە
هەڵم و بۆشاییەو یاخود خەریکبوونێکی گەلۆرانەیە
ئەو شتە دادەپۆشێ کە بایەخێکی گرنگتری هەیە
شتێ کە پەیوەست بە ئێمە نییەو ئامادەییمان بۆ نییە

## 12

کەواتە با لەو چینە بەرزە دابەزین بۆ چینێکی کەمتربەرز
باس لە سوودی ئەوشتانە بکەین کە لەبەر دەستماندایە
لەوانەیە هێمایێ بۆ شتێ دەرکەوتبێ، کە کاتی پرسیار لێکردنی نەهاتبێ
ئارامی لەسەر بگرە وەك چۆن لەگەڵ مندا ڕاهاتی
گوێم لێت بوو، کە ئەوی بینیت دەیگێڕییەوە
بەر لە وشیاری یادەوەریم، ئێستا بڵێ با بیبستم
ئێستا چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە ڕەنگە نەتبیستبێ
رۆژیش هێشتا ئاوا نەبووە، بریا ئاوابا، بزانە چەند بە کارامەیی
ئەوەی داهێناوە کە خۆشیت پێ دەبەخشێ
بانگت دەکات، گوێ لەوە بگریت کە دەیگێڕمەوە
لێبوردە بە ئەگەر ئەوەت نەدۆزییەوە

## 13

لەوەی کە من دەیگێڕمەوە:
ئەو ماوەیەی کە لەگەڵ تۆدا دانیشتووم ، وا هەستم کردوە کە لە ئاسمانم
قسەکانت لە گوێمدا شیرینن، ڕووتاب بۆ برسی و تینوو شیرینە
هەڵبەت دوای ماندوو بوون کاتی خواردنی بە تامە، تێر دەبن و مڕدەبن
هەرچەندە خواردن بە تامە، بەڵام وشەکانی نیعمەتی پیرۆز
دەخورێتەوە بێ ئەوەی لە شیرینییان تێر بیت
لەسەر ئەوە رافاییل بە خاکەڕاییەکی ئاسمانی وەڵامی دایەوە
لێوەکانت بێ جوانی نین، ئەی گەورەی خەڵکی، زمانت ڕوون و ڕەوانە
چونکە خوا لە دەرەوەو ناوەوە، گەلێ بەهرەی بەسەرتا باراندووە
تۆ وێنەی جوانی ئەوی، قسەو بێدەنگیت، لوتف و نیعمەتە
دەوری تۆیان داوە، لە هەموو وشەو بزاوتێکەوە هەن

ئێمە لە ئاسماندا تەنها بیر لەوە دەکەینەوە
کە تۆ خزمەتکارێکی دۆستی،بە دڵخۆشییەوە لەگەڵ مرۆڤەکاندا
لەرێگەی خودادا لە هەوڵ و تەقەلای

## 14

دەبینین خوا تۆی بە یەکسانی لە گەڵ ئێمەدا، پاداشت کردووە
خۆشەویستی خۆی داوە بە مرۆڤ
با بەردەوام بین لە قسە، من ئەو ڕۆژە ئامادە نەبووم
بە سەفەرێکی غەریب و ئاڵۆزەوە، پەیوەست بووم
دوور دوور چووبووم، بۆ لای دەرگاکانی دۆزەخ
چەند چوارینەیەکی جەنگیم  دروست کرد
وەك چۆن ئەو فەرمانی پێ کردبووین
تا بزانین ئاخۆ کەسێ سیخوڕێ یا دژمنێێکی نەناردۆتە ئەو ناوە؟
لەوکاتەی کە خوا خەریکی کاری خۆی بوو، نەوەکا شێتانە زاتی ئەوە بکا
ئەو خەڵقە وێران بکات و تێکی هەرشێلێ
ئەوش مانای ئەوە نییە کە کەس ناتوانێ هەوڵ بدات
بێ مادۆنی ئەوەوە، بەڵام ئەو بەپێی فەرمانە بەرزەکانی خۆی
لە پێناوی پاراستنی دەولەتی خۆیەوە، وەك حاکمی باڵا، ئێمە ڕەوان دەکات
ئێمەش مەشق لەسەر گوێڕایەڵی فەوری دەکەین
هەرزوو دەرگا پڕ ترسەکانمان دۆزییەوە
بینیمان داخراوە و لەمپەرەکان بە هێز بوون
بەڵام بەرلەوەی  نزیك بینەوە، لەوەی بچینە ناویانەوە
بۆماوەیەکی زۆر ، گوێمان لە هەراو زەنایێ بوو
پاشان دەنگی سەماو گۆرانی و هەرا و زەنا
هەروەها گریانی توون و تووڕەیی و ڕاماڵئامێزمان بیست

دڵخۆش بووین بەوەی بەر لە ئێوارەی شەممە، گەڕاینەوە کەناری ڕووناکی
ئابەمجۆرە لە کاری خۆمان بووینەوە
بەڵام کە ئێستا گوێم دایە گێڕانەوەکانی تۆ، شاد بووم بە قسەکانت
لانی کەم بە شادییەکانی تۆوە، بە قسەکانی من
ئا بەمجۆرە ئەو هێزەی کە بە خوا دەچێ قسەی کرد
باوە گەورە وەڵامی دایەوە و داوای کرد، ئەوە بگێڕێتەوە
کە ژیانی مرۆڤایەتی چۆن دەستی پێکردووە؟
زۆر سەختە، کێ دەزانی سەرەتای خۆی چۆن بووە؟

## 15

هێشتا حەزم لەوەیە کە درێژە بە قسەکانم بدەم
تا بەردەوام بم، وەك یەکێ لەخەوێکی قووڵدا هەڵسابێتەوە
خۆم بەسەر گیایەکی گوڵینی نەرمەوە بینی، ڕاکشاوم
تۆزێ ئارەقەم کردبوو، هەرزوو خۆر وشکی کردەوە
وەك ئەوەی بەسەر شێدارییەکی بۆگەنەوە(١) دەژیت
چاوە سەرسامەکانی خۆم ڕوەو ئاسمان هەڵبڕی
بۆ ماوەیەك چاوم بڕییە ئاسمانی پان و بەرینەوە
تا ئەو کاتەی بە بزاوتێکی غەریزی خێرا هەڵسامەوەو بازمدا
پاشان هەستامەوەو بەسەر پێیەکانمەوە قیت وەستام
دۆڵ و بان و دارستانی سێبەرین و دەشتایی گەشاوەم بینی
هەروەها ئاوم بینی لە جۆگەلە چرپەدارەکانەوە هەڵدەڕژا
مەخلووقاتم بینی دەژیان و دەڕۆیشتن و لە جووڵە دابوون
هەموو شتێ پێدەکەنی، دڵم بە بۆن و بەرامەو شادی کرایەوە

١- وەک ئەوەی بەسەر شێدارییەکی بۆگەنەوە... ئەوە مەزهەبی ملتونە لە وەرچەرخانی شتەکان لە وێنەیەکەوە بۆ وێنەیێ

بەردەوام بووم لە سەیر کردنی خۆم، هەمووﻻیەکم پشکنی
هەندێ جار دەڕۆیشتم و هەندێجاریش
بەجومگەییێکی لەبارەوە ڕامدەکرد
هێزێکی زیندوو و چالاك ڕابەرایەتی دەکردم

## 16

بەڵام من کێم و لە کوێ هاتووم و بۆ هاتم؟
نازانم هەوڵم دا قسە بکەم و یەکسەر قسەم کرد
زمان گوێڕایەڵم بوو و ئامادەبووم، ناو لە هەرشتێ بنێم کە دەیبینم
گوتم تۆ خۆری، ڕووناکیت زۆر جوانە
تۆ زەوی ڕووناکی تازەو دڵخۆشکەر وەردەگری
تۆ گردوڵکەو دۆڵ و ڕووبارو دارستان و دەشتەکانی
ئێوەش ئەی ئەفرێنراوە زیندوو و جوولەدارە جوانەکان پێم بڵێن
بۆم بگێڕنەوە، گەر بینیوتانە کە چۆن هاتم و
ئەوە چۆن لێرە پەیدابووم، من نا بەڵکو ئەفرێنەری مەزن
پێم بڵێن چۆن بناسم و چۆن بیپەرستم
لەو بووم و بەو جۆرە دەجووڵێم و دەژیم
هەستم کرد کە من دڵخۆشترم لەوەی دەیزانم
ماوەیەك ڕابردو سەرگەردان بووم و نەمزانی لە کوێم؟
هەروەها نازانم یەکەم جار، کەی هەوام هەڵمژی و
ئەو ڕووناکیە خۆشەم بینی و کەس وەڵامی نەدامەوە؟
بەسەر کەنارێکی تژی گوڵ و سێبەرین بە ڕامانەوە دانیشتم
لەوێ خەوێکی نەرم دایگرتم و بە پاڵپەستۆیەکی نەرم
هەستی خەواڵوومی ڕفاند و بێزار نەبووم
لەگەڵ ئەوەش بیرم کردەوە کە بۆ باری پێشووم
دەگەڕێمەوەو هیچ هەستێکم نەماوە

کە خەونێك نیشتە سەرم و یەکسەر هەڵوشایەوە
لەناخمەوە تارماییەکەی بە نەرمی کەوتە جووڵەوە
خەیاڵدانی جووڵاندمو تا باوەڕ بە بوونم بکەم بزانم زیندووم

## 17

بیرمە یەکێك یە شێوەیەکی موقەدەسئامێزەوە هاتە لام
نشنگەکەت تۆی دەوێ ئەی ئادەم، هەڵسەوە ئەی یەکەم پیاو
ئەوەی لەگەڵ خەڵکدا ناژمێردرێ، ئەوە دەبێتە یەکەم باوك
تۆ من بانگ بکە تا ڕێشاندەرت بم، ئەوە منیش هاتم
بەرەو بەهەشتی بەرەکەت، کە بۆ تۆ ئامادەکراوە
ئەوەی گوت و بەدەستی خۆی قیتی کردمەوە
بەسەر کێڵگەو ئاو و هەوادا بەنەرمی خلیسکام، بێ هەنگاو
دواجار منی بەرزکردەوە بۆ سەر چیایەکی دارستانچڕ
کە ترۆپکی ئەو چیایە دەشتایی بوو
بریتی بوو لە بازنەیەکی فراوان و داخراو، لەگەڵ جوانترین درەختی چاندراو
وێڕای ئەو ڕاڕەو کەپرانەی کە بینیم، بەڕادەیەك بوون
کە ئەوەی پێشترلەسەر زەویم بینی بوون
هیچ جوانییەکان نەما، هەر هەموو درەختەکان پڕ بوون لە جوانترین میوە
کەچاویان فریودەداو حەزو تاسووقێکی لەناکاویان لە مندا دەورووژاند
تا هانم بدەن بۆ خواردن، هەموو شتێ لەبەرچاوم دیاربوو
وەك ئەوەی کە خەونەکە هەر مابێت
ئەلێرەوە پیاسەی من دەستی پێکرد، ئەگەر ڕێشاندەرم لەوێ نەبا
کە لە نێو درەختەکاندا وەك پیرۆزمەندێك بەدیار کەوت

## 18

گرژیمەوە بەڵام بە ترسەوە، لەبەر پێی ئەودا سەرم دانەواند و ڕاکشام
بەنەرمییەوە فەرمووی هەڵسەوە، ئەوەی بەدواییا دەگەڕێی
ئەفرێنەری هەموو ئەو شتانەیە کە بەسەر سەرتەوەیە
یا لە ژێرتەوە یا لە دەورووبەرتەوە دەیبینی
ئەو فیردەوسەم داوە بەتۆ، بیکێڵە و بیپارێزە
وامداناوە هی تۆبێ و لە بەرووبوومەکانی بخۆی
هەر درەختێکی کە لە بەهەشت شین ببێ
تۆ بە ئازادی و بەدڵێکی پڕ لەشادی دەیخۆیت، لێرە لە مردن مەترسە
بەڵام ئەو درەختەی کە زانستی چاکە و خراپە بەرهەمدێنێ
بەرزم کردۆتەوە تا وادەی گوێڕایەڵی و باوەڕم پێبدەیت
ئەوە قەمچی بەهەشتە لە نزیك درەختی ژیانەوەیە
وەبیر خۆت بهێنەوە کە ئاگادارم کردییەوە
نەکەی تامی بکەی، خۆت لە ئەنجامە تاڵەکەی بەدوور بخەوە
ئەوە بزانەکە تۆ لەو ڕۆژەی کە لەم درەختە دەخۆی
تاکە ڕاسپاردەی من دەبەزێنیت و دەمریت
ئیدی هەر لەوێ ڕۆژێوە تۆ نەماوی، ئەو بەختەوەرییەت دەڕوا
دەردەکرێیتە جیهانی ئازارو خەمگینییەوە.

## 19

زۆر بە ڕاشکاوییەوە قسەی لەبارەی ئەو توووند قەدەغەیە کرد
کە ئیستاش سەداکەی لەگوێما دەنگ دەداتەوە
هەرچەند هەڵبژاردەی منیش هەر ئەوە بوو، کە کاری وانەکەم
پاشان بە خێرایی گەڕایەوە سیمای جارانی
هەمان قسەکەی خۆی تازە کردەوەو گوتی

نەك هەر ئەو قەڵەمڕەوە جوانە بەڵكو هەموو زەویت دەدەمێ
وەك گەورەكان بۆ تۆو بۆ ڕێ و ڕچەڵەكت، كە ببنە خاوەنی
هەروەها هەموو ئەو شتانەی لەسەریا دەژین یا لە دەریا یاخود لە حەوا هەروەها
كێوی و ماسی و باڵدارەكان
وەك بەڵگەیەكیش لە منەوە، هەموو باڵدارو كێوییەكان
بانگ دەكەم و ئامادەی ئێرەیان دەكەم
تا هەریەكەو ناوی خۆی لە تۆ وەرگرێ
هەروەها لایەنگیریی خۆیان بە تەواوی بۆ تۆ بە دەربخەون
بە تەواوی بكەونە بەردەستی ئێوەوە
واتێدەگەم هەمان شتیش بەسەر ماسیەكانی ناو دەریاكان پیادە ببێت
بەڵام ئەوان بانگ ناكەم
چونكە ئەوان ناتوانن سروشتیان بگۆڕن و هەوای دەرەوە هەڵمژن
ئابەمجۆرە قسەی كرد و هەموو كێوی باڵندەكان
جووت جووت هاتن و نزیك بوونەوە، خشۆكەكان بە مەراییەوە
خۆیان نەوی دەكرد، هەموو باڵندەكان
خۆیان دادەنواندو باڵیان شۆردەكردەوە، كە ڕەت دەبوون ناوم لێدەنان
بەو مەعریفەیەی خوا بەمنی بەخشی بوو
لەسروشتیان دەگەیشتم و لەناكاو وەرمدەگرت
بەڵام لە هەموویان ئەوەم نەبینی
بیرم لێدەكردەوە، كە دەبێ ئەوە هەبێ
بەرەو دیدگای ئاسمانی چووم و زاتم دایە بەرخۆم و گوتم
ئەی بە چ ناوێ بانگت بكەم؟چونكە تۆ لەسەرووی هەمووانی
لەسەرووی هەموو مرۆڤایەتی، لە هەموو مرۆڤەكان بەرزتری
تۆ لە هێزوبڕستی من بەدەری كە ناوت بنێم
چۆن دەتوانم بتپەرستم؟ ئەی ئەفرێنەری ئەم گەردوونە
ئەو هەمووچاكەیەت بەخشیوە بە مرۆڤ
بە دەستە سەخیەكانتەوە ئەو هەمووەت پێداون

## 20

بەلام كەس لەگەڵ خۆم نابینم، بەشداریم بكات لەو تەنهاییە
هیچ بەختەوەرییەك نییە، كێ لە تەنهاییدا دڵخۆش دەبێ؟
هەرچەندە پڕ لە چێژمەنیش بێت، چ قەناعەتێ دەدۆزێتەوە؟
ئابەمجورە زاتم كردو دیدگام گەشایەوە
ئەویش بە بزەیەكی درەوشاوەتر وەلامی دایەوە:
ئەوە پێی دەڵێی تەنیایی؟
ئەی زەوی بە هەموو ئەفرێنراوە زیندووەكانی
ئەی هەوای پڕو ئەو هەموو شتانەی، بە فرمانی تۆوە دێن دەچن
لەبەردەمی تۆ یاری دەكەن، ئایا بەزمانیان و شێوەیان نازانی؟
ئەوانیش دەزانن و ئەقڵیان هەیە كە گەمەیان پێ ناكرێ
دەتوانی لە گەڵیانا بكەویە خۆشییەوە
حوكمی خۆت فەرز كە، مەملەكەتی تۆ گەورەیە
ئابەمجۆرەگەورەی گەون قسەی كرد
فەرماندەرانە وەدیار كەوت و لێی پاڕامەوە
تا رێگەم پێ بدات قسە بكەم

## 21

بە هەموو ژێردەستەیی خاكەڕاییمەوە قسەم كرد:
لێمەگەڕێ وشەكانم تووڕەت بكات ئەی ئەفرێنەری من
ئەی هێزی ئاسمانی، هاندەرم بە كە من قسە دەكەم
ئەی تۆ منت نەكردۆتە باتی خۆت؟
هەموو ئەوانەت بە كەمتر لە من داناوە
ئایا پێكەوە بوونێك هەیە، بە بێ یەكسانی، مایەی رازیبوون بێ؟
ئەوە چ گونجان و چ خۆشییەكە؟

چۆن لەگەڵ یەك تێكەڵ دەبین و دەگەینە یەك
ئەگەر پایەكان جیاواز بن؟
دەبێ یەكسانییەك هەبێ لە دان و ستاندا
بەڵام ئەگەر هەردوو لا وەك یەك نەبوون
یەكیان وەك ژێیەكی توندكراو بێت و ئەویتر شل و خاو
ئەوە مەحاڵە لەگەڵ یەك بگونجێن
هەرزوو وەڕەس دەبن و تووشی خەمباری دەبن
من باس لە بەزمیی دەكەم و داوای دەكەم
ئەومیە كە بە دوایدا دەگەڕێم، ئەوە بۆنەیەكە
بۆ بەشداری كردن لە هەموو خۆشییەكی ئاوەزی
چونكە ئاژەڵ ناتوانێ ببێتە هاوسەری مرۆڤ
دڵی بەوە خۆش دەبێ كە لە خۆی بێت، شێر لە گەڵ مێیەی خۆی
تۆ وات لێكردوون جووت جووت لەگەڵ یەك بن
هیچ بەیەك گەیشتنێك و هاودەمییەك نییە
لە میانی باڵدارو كێوی، یاخود لە میانی ماسی و پەلەوەر
مەیموون نابێتە هاودەمی مانگا
لە هەمووی سەختتریش، هاودەمی نێوان مرۆڤ و كێوییەكان
ئەومیان هەر مەحاڵە

## 22

هێزومەند بەبێ ئەوەی وەڕس ببێت وەڵامی دایەوە:
ئەی ئادەم، جوان و زیرەكانەیە ئەو بەختەوەرییەی
كە تۆ بۆ خۆتی داوا دەكەی، لە هەڵبژاردنی هاودەمی خۆت
بەڵام لەگەڵ ئەوەش كە لەناو خۆشیدای
بەڵام خۆشی ناچێژی، چییە تۆ تەنهای ؟

ئەی بەچیم خەیاڵ لێدەکەیەوە، کە ئەوە حاڵی منیشە
ئایا بۆ تۆ وابەدیار دەکەوێ، کە من تەواو بەختەومرم؟یا نا
من لە ئەزەلەوە تەنهام و کەس ناناسم وەڵامم بداتەوەو
بە من بچێ، یا یەکسانی من بێ، ئەی من لە گەڵ کێ قسە بکەم؟
تەنها لەگەڵ ئەو ئەفرێنراوانەی کە ئەفراندوومن
خۆ ئەوانیش بەو پلەبەندییانەی کە سنووریان نییە، پایەیان لە من کەمترە
زیاتر لەو ئەفرێنراوانەی تر کە پایەیان لە تۆ کەمترە
وەستام و بە خاکەڕییەوە وەڵامم دایەوە:
بۆ گەیشتن بە ترۆپکی کارسەرمەدییەکانی تۆ و قووڵاییەکانی
هەموو بیرۆکەیەکی مرۆڤ کورتی دێنێ

## 23

ئەی گەورەی گەردوون:
تۆ لە زاتی خۆتا کامڵیت و هیچ کەم وکوڕییەکتت نییە
بەڵام مرۆڤ نا، بە ئاوارتەی پلەکەی
هەر ئەوەشە هۆی ئەوەی، کە ئارەزوویەتی
یەکێ هەبێ قسەی لەگەڵدا بکات، وەك خۆی بێت
بۆ دڵخۆشکردنی و تەواوکردنی کەم و کوڕییەکانی
تۆ پێویستیت بە نانەوەی وەچە نییە
چونکە تۆ ئەزەلیی و ئەبەدیی و ناکۆتای
ژمارەکان لە تۆدا ڕەهان و تۆ یەکی و نابیت بە دوو
بەڵام مرۆڤ پشت بە ژمارە دەبەستێ
تا کەمووکورییەکانی بۆ دەرخەن، ئەگەر تەنها بێ
وای لێدەکات هی وەك خۆی لێ بکەوێتەوە
وێنەی ئەو زۆر دەبێت، چونکە تەنهایی ئەو، کەمووکوڕییە
ئەو داوای خۆشەویستیی و هاودەمیی دەکات

خۆشەویستییەك گران و سەنگین و پڕ متمانە بێت
بەڵام تۆ لە دەستداگرتنت بەسەر تەنهایی خۆت
وا بە چاکدەزانی کە کەس هاودەمت نەبێت، جگە لە زاتی خۆت
هەوڵی هاودەمی و تێکەڵاوی نادەیت و بەوە زۆر دڵخۆشی
دەتوانی هەر ئەفرێنراوێکی ئەفراندبێتت
بۆ هەر پلەیەك، خۆت گەرەکت بێت، بەرزی بکەیتەوە
هەر پلەیەك لە پلەکانی بەرزی
ئیدی ئەفرێنراو بەبەردەوامی لە گەڵتا دەبێت بە یەك
بەڵام من بە بەردەوامبوون و قسەکردن
ناتوانم دەواری سەر چوارپێ ڕاست کەمەوە
بۆ ئاستی مرۆڤی سەر دوو پێ
هەروەها هیچ سەرچاوەیەکی خۆشی تیا نادۆزمەوە

## 24

ئابەمجۆرە کۆتاییم بە قسە جەسوورەکانی خۆم هێنا
سوودم لەو ئازادییە وەرگرت، کە خوا مۆڵەتی پێدام
قبووڵی ئەوم بەدەست هێنا
کە بەم وەڵامەی دەنگی خودایی وەڵامی دامەوە:
ئەی ئادەم ئەو تاقی کردنەوەیەی تۆ دڵخۆشی کردم
وام بۆ بەدیار کەوت، کە زانینی تۆ تەنها لە جۆرەها ئاژەڵ نییە
کە ناوهێنانیانت ڕاست دەهێنا، بەڵکو زاتی خۆشتی دەگرتەوە
دوای ئەوەی بە گوزارشتێکی جوان
گوزارشتت لە رۆحی ئازادی ناوەوەی خۆت کرد
ئەمە وێنەی منە، کە ئەم وێنەیەم، بە ئاژەڵانم نەداوە
ئەمەش هۆیەکی بە جێیە، کە وای لە تۆ کردووە
بە ئازادی خۆتەوە، خۆت لەوان بەدوور بگری

تاوەکو ئێستاش دەبێتە هۆی بەدوورکەوتنەوەت
من بەر لەوەی کە قسە بکەیت، ئەوەم دەزانی
کە باش نییە بۆ پیاو، تەنها بێت
مەبەستیشم نەبووە ئەو ئەفرێنراوانەی، کە دەیانبینی
بکەی بە هاوەڵی خۆت، ئەو تەمایەم نەبووە
بەڵکو بۆ ئەزموونکردنی تۆم هێناوەتەوە
بۆ ئەوەی هێزی تۆ بەدیکەم و بزانم
تۆ چۆن حوکم بەسەر ئەوانە دەکەی، کە بۆ تۆ دەگونجێن
بەڵام ئەوەی کە ئێستا بۆتی دەهێنم ڕازیت دەکات
دڵنیابە لەمەدا، وەکو خۆتە و یاوەری گونجاوی زاتی تۆیە
هەروەها هەمان ئەو ئارەزووەیە
کە تاسووقی دڵت، بەتەواوی دەستنیشانی کردووە

## 25

لە قسەکانی خۆی بۆوە، ئیدی گوێم لە دەنگی ئەو نەما
کیانی زەمینی من کەوتە ژێر کیانی ئاسمانی ئەوەوە
دوای ئەوەی کە بۆ ماوەیەکی درێژ بوو، ئازاری دەکێشا
تا بەرەو لووتکەی ئەو وشە ئاسمانییە بڵندانە، بەرزبێتەوە
وەکو ئەوەی کەئازاری هەموو ئەو شتانە بچێژێ
کە تێپەڕی هەستەکان دەکەن
من حەپەسا بووم و هێزم زەوت کرابوو
بەدارڕماوی کەوتم و هاواری چارەسەریم بوو لەخەو
ئەو خەوەی کە لە هەمان ساتدا داپۆشی بووم
سروشت بانگی ئەو خەوەی کردبوو تا یاریم بکات
چاوم داخست و چاوی داخستم، بەڵام پەنجەرەی وەهم دانەخرا
وەهمەکە تیشکی ناوەوە بوو، بە ڕووناکی ئەو تیشکەوە

وامزانی دەبینم، وەك ئەوەی لەخۆبچم، لەخۆچوونێكی بەلەزەت
هەرچەندە من خەوتبووم و ڕاكشابووم
بەڵام وام زەن كرد كە ئەو شەبەنگە دەبینم
كە بە گەشی و مەزنییەوە دەدرەوشایەوە

## 26

من لە بێداریدا، لە میانی دەستەكانیدا وەستابووم
ئەویش لاربووبۆوە بەسەر جەستەما
لای چەپی شەق كردم و تەڵێكی فێنك بە رۆحی ژیانی
لە ناو دڵمدا دەرهێنا، كە خوێنی ژیانی تیا هەڵدەڕژا و
لەخورپەدابوو، برینەكە فراوان بوو
بەڵام لە هیكەوە پڕبوو لە گۆشت و سارێژ بوو
ئەو تەڵەی گرتە دەست و شێوەی پێ بەخشی
لەناو دەستە دێرێژكارەكەیدا مەخلوقێ شێوەی گرت و گەشەی كرد
لە پیاو دەچوو و بەڵام لە ڕەگەزێكی تر بوو، زۆر جوان و شۆخ بوو
تا ئەو رادەیەی، هەرچی جوان بوو لە گەردووندا
لەچاو ئەوا هیچ نەبوو، یا كەمتر بوو
هەموو جوانییەكانی پێش خۆی، لە روخساری خۆیا
تواندەوەو لەخۆیدا كۆیكردنەوە
هەر لەو ساتەوە خۆشی و شیرینی هەڵڕژایە ناو دڵمەوە
خۆو شی شیرینییەك، كە هەرگیز پێشتر هەستم پێی نەكردبوو
رۆحی خۆشەویستی و شادی و ئەڤین و دڵخۆشی چاندە
ناو هەموو شتەكانی سیماو هەناسەیا، ونبوو منی سەرسام كرد و ڕابووم
تا بیدۆزمەوە یا تا ئەبەد بۆ لەدەستدانی بگریم
ئیدی واز لە هەموو خۆشییەك جگە لەو بهێنم

## 27

ئیدی بێ هیوابووم، بەڵام ئەو لەبەردەمما بوو
دوور نەبوو، بەهەمان ئەو وێنەیەی، کە لە خەون دا بەدیار کەوت
بەهەموو ئەو شتانەی کە ئاسمان و زەوی دەتوانن بیخەنە سەر، ڕازابۆوە
تا وای لێبکەن کە زۆر زۆر جوان بێت
بەرەو ڕووم هات، خاڵقی ئاسمانیی ڕێشاندەری ئەو بوو
هەرچەند بە نهینی بوو، بەڵام بەدەنگی ئەو ڕێی دەکرد
نەشارەزا نەبوو لە قودسیەتی زەماوەندو ڕێنوێنی گرێبەستی مارەکردندا
لەهەر هەنگاوێکی هەڵیدەهێنا، لەش سووکی پێوەدیار بوو
ئاسمان لە ناو چاوی دابوو
هەروەها لە هەموو بزاوت و هێماو سەنگینی و خۆشەویستیدا
نەمتوانی گوزارشت لە فەیزی خۆشەویستی بکەم، گوتم:
بەڕاستی تۆڵەت بۆ کردمەوە، باشترین تۆڵە
قسەکەت ڕاست بوو، ئەی ئەفرێنەری خاوەن خێرو نیعمەت
ئەی بەخشندەی هەموو دیارییەك، کە جوانترینیان، ئەو دیارییە بوو
لە هەموو دیارییەکانت جوانتر، کە تایبەتت نەکردووە
ئێستاکە ئێسقانی ئێسقانم و گۆشتی گۆشتم دەبینم

## 28

دەروونم لارە لەبەر چاوم و ناوی ئەمە ژنە
لە پیاودا بەدیم هێناوە، بۆیە دەبێ واز لە دایك و باوك بهێنێ
خۆی بە مێردەکەیەوە بگرێ
پاشان ببن بە یەك جەستە و یەك دڵ و یەك ڕۆح
گوێت لێبوو کە ئەوە دەڵێم، لەگەڵ ئەومیش کە دیارییە
بەڵام بەرائەت و پاکیزەکی و ڕەوشت و هەموو ئەو چاکەو

ئەو شتانەی کە دەیزانیّ، سەبارەت بە گەورەیی پاکیزەکی
خۆیەوە، حەتمی ئەوە دەکات کە لە گەڵ ویستیا بئاخڤم
هەوڵ بۆ هەوڵەکانی بدەم، تا وەدەستی بهێنم
ڕێگایەکی ئاسان نییە، ڕێگرو شەرمنە
ئەوەش وایکردووە کە شەوقم بۆ ئەو زیاتر بێت
یا ئەگەر ئاخاوتنم جوانتر بکەم گوتم
ئەوە سروشتە وای لێکردووە، لە هەموو گوناهیّ پاك بێتەوە
هەست بەوە دەکات کە هەستی پێدەکەم
هەتا کاتیّ منی بینی، خۆی وەرسووڕاند و بەدوایا ڕۆیشتم
مانای ڕێزی زەماوەندی دەزانی، ڕەزایەتی خۆی بە گوێڕایەڵییەك نواند
کە جیلوەو جەلال دەیرازندەوە، پاڕانەوەو مەنتیقی منی قبووڵ کرد

## 29

ئینجا چووە ناو چیمەنی زەماوەندو سورفوڵیی شەرم بەرزی کردبۆوە
دەتگوت شەفەقی سپێدانە
هەموو ئاسمان و بورجەکانی خۆشبەختی لەو کاتەدا
تەواوی کاریگەریی خۆیان هەڵڕشت
هێمای مەمنوون بوونیان پێشکەش کرد
هەموو بانەکان و بایەخۆشەکان و باڵدارەکانیش بە شادییەوە
باڵەکانییان کردەوە، شنەی ساف خۆشیان چرپاندە گوێی دارستانەکان
بۆن و بەرامەی درەختی بۆندارییان پەرش کرد
هەتا بولبلی ئەوینچڕیی شەوانەش، ئاوازی زەماوەندی چڕی
ئەستێرەی سپێدەی هاندەدا کە پەلە بکات و
بەسەر ترۆپکی گردۆلکەکانەوە هەڵبێت، تا چرای زەماوەند داگیرسێنێ

## 30

ئابەمجۆرە لە ڕوونکردنەوەی حاڵی خۆم بوومەوە
لەچیرۆکی خۆمدا گەیشتمە لوتکەی خۆشییەکانی زەوی
کە ئێستێ خۆشی لێدەبینم و دەبێ دانی پیا بنێم
کە لە هەموو شتەکانی تریش، خۆشی ڕاستەقینە دەبینم
بەڵام سوودم لێ وەرگرتبێ یانا، شتێ لە مەسەلەی زەین ناگۆڕێ
ئەوەیان هیچ ئارەزوویەکی وروژێنەر ناوروژێنێ
مەبەستم ئەو لوتفانەیە کە هەستەکان دەرکی پێدەکەن
وەك تامکردن و بینین و بۆنکردنی گیاو تەڕەو گوڵەکان
وەك پیاسەو ئاوازی مەلەکان
بەڵام تووشی مەستییەك بوویمە زۆر جیاوازە
کە لەو مەستییەدا شارەزای هەستی ساوەدان بووم
ئەلێرەوە بوو بۆیەکەمین جارهەستم بە ئەڤینێکیی داگیرساو کرد و
هەڵچوونێکی دەروونی تووندو غەریب بوو
جا ئەگەر من لە هەموو خۆشییەکانی ترەوە
دانم بەخۆما گرتبێ و خۆم پێڕاگیرابێ، ئەوە لێرەدا لەبەردەم
سیحری نیگای مەزنی خۆشەویستیدا زۆر لاواز بووم
جا یا ئەوەتا سروشت لەناخمدا لاوازبوو بوو
لایەکی بێ داکۆکی  لە ناخما جێهێشتبوو
کە بێتوانا بوو لەبەرابەریا خۆی ڕاگرێ
یا ئەوەتا بەشێکی گەورەی لە مندا هەڵپاچی بوو
لەوانەیە بەشێکی تەواو گەورەش بووبێ
ئەنجامەکەی لانی کەم ئەوە بوو
کە جوانی لە ڕادەبەدەر زیاتری بۆ زیاد بکەم
لەڕوودا تووندوتۆڵ و تەواو ورد بوو و لە ناخەوەش کەمتر
من زۆر باش دەزانم کە غایەتی یەکەمی سروشت چییە

کە وای لێبکات لە پلەیەکدا بێت، کەلە ئەقڵ و هێزی ناوەوە بچووکتر بێت
هەروەها نایابی و بەرزەوە بوونی بەسەر هەموویانەوە
دیسان لە مەزهەرییەوە کەمتر لەوە دەچوو، کە ئێمە هەردووکما داماننابوو
هەروەها کەمتر گوزارشتی دەکرد لەو دەسەڵاتەی
کەبەسەر ئەفرێنراوەکانی ترا هەیبوو، ئەو دەسەڵاتەیی کە ئێمە پێماندابوو
بەڵام کاتێ من جوانی ئەو لەبەرچاوەمدا وەنزیك دەخەمەوە
لەو پەڕی کەماڵدایە، هەروەها زاتیشی تەواو تەواوە
هەوڵدەدەم بزانم ئاخۆ دەگاتە چی
لە هەموو ئەو شتانەی کە دەیەوێ ئەنجامی بدات و بیڵێت

## 31

وابەدیار دەکەوێ خاوەنی گەورەترین، بڕی حیکمەت و چاکەو
نهێنگیرییە، ئەو زۆرباشترەو هەموو زانینێکی بەرز لە
بەرامبەریا، دادەڕمێت، حیکمەت لە قسەکردن لە گەڵیا
گرێی دەبێتەوەو زەرد هەڵدەگەڕێ و وەك گەلۆر بەدیار دەکەوێ
سیفەتی ئەقڵ و دەسەڵات سێبەری بەسەرا دەکەن
وەك ئەوەی ئەوسیفەتە بە ئەنقەست لەویا ڕواوبێ، ئەو ڕەسەنە
وێنەکە ئەوکاتە تەواو دەبێت، کاتێ دەروونی کراوە و شەرەف بەیەك
دەگەن بارەگای خۆیان دادەمەزرێنن
جوانترین بونیات لەودا بونیات دەنێن
کەش و هەوایەکی ترسئامێز بەدەوریا دەخوڵقێنن
وەك ئەوەی فریشتەیەکی پاسەوانی تایبەت بێ بەو
فریشتەکە بە ڕووگرژییەوە وەڵامی دایەوە و گووتی:
سروشت بە هیچ شتێ تۆمەت بار مەکە، کاری خۆی جێبەجێ کردووە
تۆ هیچت لەسەر نییە جگە لەوەی بە کاری خۆت هەڵسیت

متمانەت بە حیکمەتی خوا لەدەست نەدەی
ئەگەر خۆت بەوەوە بگریت قەت جێتناهێڵێ
تۆ ئێستاکە زۆر پیویستیت بەو هەیە، لێیەوە نزیك بیت
شتی زیاد مەخەرە سەر شتەکان، کە نایابییان کەمترە لەوەی کە دەیبینی
وەك ئەوەی کە تۆ دەرکی پێدەکەیت، تۆ بەچی سەرسامیت
ئەوە چییە کە ئەو هەمووبۆن و بەرامەیەت پێ دەبەخشێ ؟

## 32

بێگومان لەڕووکاردا جوانە، تەواو شایانی قەدر و رێزو خۆشەویستیتە
نەك وات لێبکات بکەویتە ژێر دەستی
خۆت لە نێو ترازوو دانێ لە گەڵیانا، ئینجا سەیری هەردوولا بکە
مرۆڤ زۆر جاران سوودێکی زۆر دەبینێ، لە دەستنیشان کردنی خۆیەوە
بە پێی داد و هەق، بێ زێدەڕۆیی
هەرچەند زیرەکیت زیاتر بێت، لەو دەستنیشانکردن و زانینەدا
ئەوە بڕیاری ئەو زیاتر دەبێت، بەوەی کە تۆ سەرداری ئەوی
هەروەها ڕازێنەری ڕاستییەکانی بۆ ڕێبەری کردنی جوانییەکانی
کە ئەو جوانییە، بەهایەکی زۆری دروست کردووە تا شادیت زیاد بکات
هەروەها هەیبەتێکی زۆریشی دروست کردووە تا پابەندی شەرەف بێت
لە خۆشەویستی تۆدا بۆ ژنەکەت
کە دەزانێ کەی حیکمەتی تۆ تا بچووکترین پلە پاشەکشە دەکات
بەڵام ئەگەر ئەو هەستەی ساودان، کە مرۆڤ پشتی پێدەبەستێ
بۆ یەکسانی، لەبەرچاوتا واخۆی بنوێنێ کە چاوگەی لەزەتە
ئەوە بە سەر هەموو هەستەکان دەکەوێت، ئەوەت لەبیربێت
کە ئەو هەستە دراوەتە مانگاو هەموو ئاژەڵەکانیش
خوداوەند پاگاندەو ئاشکرای نەدەکرد لە میانیانا
ئەگەر لە درۆێنەی لەزەتەکانیاندا، شتێ هەبێ شایانی ئەوە بێت

ڕۆحی مرۆڤ بخاتە ژێر دەست، یا سۆز لە دەروونیا بورووژێنێ
هەرچەند ئەو شتانە ببینیت بەرزن، لەو کاتەی لە گەڵیا دەبیت
وەك زەریفی و سیمای مرۆیی و ئەقڵی
ئەو کاتە بۆت هەیە بەردەوام خۆشت بوێت

## 33

تۆ ئەوکاتە راستی، کە خۆشەویستی دەکەی، ئەوکاتەش هەڵەدەکەی
کە سۆزێکی سووتێنەر ڕاتدەدا، کەواتە ئەوە خۆشەویستی تیا نییە
خۆشەویستی بیروباوەڕەکان ڕاستە ڕێ دەکات و دڵ فراوان دەکات و
بارەگای خۆی لە ناو ئەقڵ دادەنێ
ئەومیان ڕاسترینی بڕیارەکانە، کە بیگەیتێ، ئەوە دەگەی
بەخۆشەویستی خودایی، نەك بکەوی و لەناو پەناگەی جەستەدا نوقم بیت
هەربۆیەشە ژنێکی بۆ لە میانی ئاژەڵانی جۆراوجۆر نەدۆزییەوە
ئادەم کە تۆزێ شەرم دایگرتبوو، وەڵامی دایەوەو گووتی:
نە ئەو سیمایەی کە بەو جوانییەوە کێشراوە، نەسیفەتێ
لە سیفەتەکانی زۆربوون، کە هەموو ئەفرێنراوەکان تیایا
بەشداری دەکەن ( هەرچەند بەرزترە لە بالینگانی ژن و
مێرایەتی، هەتا من بایەخێکی زۆری پێدەدەم، کە نازانم چییە)
نە ئەمەو نە ئەوە، لەزەتی ئەومم پێنادەن، بەرزتر بێت لە
لەزەتی ئەوەی کاتێ بە هەڵسوکەوتە جوانەکان و هەزاران
هەزار نیشانە لە نیشانەکانی مەندی ئەو دەکەم
کە بەردەوام لە گفت و لفت و هەڵسوکەوتەکانییەوە هەڵدەرژێن
هەموویان تێکەڵ بە خۆشەویستی و گوێڕایەڵی شیرینی ئەون
گوزارشت لە راستی یەکیەتی زەینی ئێمە دەکەن
هەروەها گوزارشت لە یەکرۆحی جەستەی ئێمە دەکەن
ئەومیان گونجانێکە لە گونجانی میانی ژن و مێر، کە شیرینترە

لە کاریگەریی ئەو ئاوازە گونجاوانەی، کە بەر گوێچکە دەکەون
بەڵام هەموو ئەو شتانە نامخەنە ژێر دەستییەوە
من ئەوەت بۆ ئاشکرا دەکەم، کە لەناخەوە هەستی پێدەکەم
ئەوەش مانای ئەوەنییە کە من دەشکێنێ
منێك کە هەستەکان بە شتگەلی جۆراوجۆر، ڕووبەڕووم دەبنەوە
بە وێنەو شێوەی جۆراوجۆر، بەڵام من لەزەت لە ئازادی وەردەگرم
بەوەی کە رازی بکەم کە من چیم لەو دەوێت
ئەوەیش بەدەست بهێنم کە ئەو رازی بکەم
کەواتە لە خۆشەویستیدا لۆمەم مەکە
چونکە خۆشەویستی، وەك دەڵێی بەرەو ئاسمانمان دەبات
هەر ئەو رێگەو ئەو ڕێشاندەرە، کەواتە سەبر لە داواکەم بگرە
ئەگەر داواکەم ڕاست بێت، ئایا خوشەویستی بە ڕۆحی
ئاسمان نازانێ، چۆن گوزارشت لە خۆشەویستی ئەو بکات
هەر بە چاوچاوانێ، یاخود لەو کاتەی کە دەیبێنێ، ئەو
رووناکییانەی لێیەوە هەڵدێن، تێکەڵ بە یەك دەبن
ئایا تەنها بە ساودانی خەیاڵ لێکراو دەبێ یا ساودانی بەراستی؟

## 34

فریشتەکە بە بزەیەکەوە وەها سەیری کرد، گەشایەوە
گەشانەوەیەکی ئاسمانی گوڵینی سوور سوور
کە ڕەنگی خۆشەویستی ڕاستەقینە بوو
وەڵامی دایەوەو گووتی: ئەوەندەت بەسە بزانی ئێمە دڵخۆشین
هیچ دڵخۆشییەك بە بێ خۆشەویستی نابێت
هەرچەند تۆ لەزەت وەك جەستە وەرگریت، سافی و پاکییە
چونکە تۆ پاك و پاڵاوتە ئەفرێنراوی
ئەوە ئێمەش تا ئەو پەڕی، ئەو لەزەتە وەردەگرین

بەبێ ئەوەی تووشی تەگەرەی جەستەیی ببین، لە ئەندام و
جومگەو پەلوپۆ، کە شیشەبەندی زیندانی مرویین
ئاسانترە لە هەوادا لەگەل هەوا، ئەگەر ڕۆحەکان دەست لەملانێ بن
هەموویان تێکەڵ بەیەك دەبن
پاکی لە گەڵ پاکی یەکدەگرن، لە ئارەزوودا
هیچ تەگەرەیەك لە ڕێی پەیوەندییەکاندا بوونی نیە
وەك چۆن جەستە تێکەڵ بە جەستە دەبێت
یاخود دەروون لەگەڵ دەروون
بەڵام ئێستاکە ناتوانی بمێنیتەوە، چونکە خۆرەتاو
بە پشت زەوی گیایین و دورگە سەوزەکانەوە لە خۆراوا ئاوادەبێت
ئەوەش هێمایە بۆ ئەوەی ئێرە جێبهێڵم

## 35

بەهێز بەو بەخۆشی ژیان بەرە سەر، بەڵام بەر لە هەموو
شتێ گوێڕایەڵی ئەو کەسە بە کە خۆشتدەوێ
فەرمانە مەزنەکانی بپارێزە، نەکەی سۆز دوورت هەڵدا
وا لە دادگاکەت مەکە شتێ ئەنجام بدات، کە ویستی ئازادی ئەویتر
رازی نەبێت، تۆ و هەموو ڕۆڵەکانت ئاگادار بن
کە خۆشی و مەینەتی لەدەستی تۆدایە
بێداربە، من دڵخۆشم بە بەردەوامی و مکوڕیت
هەروەها هەموو فریشتەکانیش، خۆڕاگر بە، یا بڕووخێ
تۆ ئازادی و بڕیار لە دەستی تۆدایە
کەمال لە ناخەوەیە، بەتەمای دەرەوە مەبە
هەڵگەڕێوە بەسەر هەموو فریوی تخووب بەزێن
ئەمەی گووت و هەڵسایەوە و ئادەمی پیرۆز کرد
کە بەدوای ئەودا کەوت، چونکە ئەوێی جێدەهێشت

بڕۆ ئەی میوانی ئاسمانی، ئەی پەیامهێنی هەوایی
چاکەی فەرمانڕەوا تۆی ناردووە، کە من دەیپەرستم
تۆ لەگەڵ مندا نەرم و نیان بووی و ئاسان خولْق بووی
ئیدی بۆ ئەبەد من بەو یادە جوانەوە ڕێزلێنراوم
تۆ بۆ مرۆڤایەتی چاکەو دۆستایەتی، دووبارە وەرەوە
ئابەمجۆرە لە یەك جیا بوونەوە
فریشتەکە لە ژێر سێبەرێکی چڕدا بەرەو ئاسمان
ئادەمیش بەرەو کەپرەکەی خۆی.

ئەو سەرچاوانەی بۆ وەرگێڕانی ئەم کتێبە

بەکارهاتوون و سوودیان لێوەرگیراوە

- الفردوس المفقود – ملحمه الشاعر الانكليزی – جون ملتون – وەرگێڕانی: د. محمد عانی .
- الفردوس المفقود – ملحمه الشاعر الانكليزی – جون ملتون – وەرگێڕانی: حنا عبود
- بهشت گمشده - جان ملتون – وەرگێڕانی شجاع الدين شفا.
- notlim nhoj -esidarap tsoL ئەم کتێبەی ملتون لە ساڵی ١٦٦٧ بڵاو کراوەتەوە، ملتون لە ساڵی ١٦٠٨ی لە دایك بووە و لە ساڵی ١٦٧٤ کۆچی دوایی کردووە.